(( زنجیرە ڕێنمایی یەكانی فیقهی ئیسلامی ))
( ٣ )

# ڕێنمایی یەكانی

# بەڕێكردنی مردوو



نوسینی
هەردی صابر

چاپی یەكەم
١٤٣٤ك - ٢٠١٣ز

(( زنجیرە ڕێنمایی یەکانی فیقهی ئیسلامی ))

( ٣ )

# ڕێنمایی یەکانی
# بەڕێکردنی مردوو

نووسینی

هەردی صابر

چاپی یەکەم    ١٤٣٤ ك - ٢٠١٣ ز

ناوی کتێب : ڕێنمایی یەکانی بەڕێکردنی مردوو

نووسینی : هەردی صابر

نۆبەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٣ ز

تایپ و دیزاین: نووسەر

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانە: چاپخانەی شارستان

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی (١٨٩٤) ی ساڵی (٢٠١٣) ی پێ دراوە

## بسم الله الرحمن الرحيم

### پێشەکی :-

**إن الحمد لله، نحمده و نستعينه و نستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهدى الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.**

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ (آل عمران : ١٠٢) ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِى تَسَاءَلُونَ بِهِۦ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ (النساء : ١) ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾
(الأحزاب : ٧٠ - ٧١)

**أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله ، وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها ، وكل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار .**

**لە پاش سوپاس و ستایشی فراوان و بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار و، پاشان ناردنی صەڵەوات و سەلام بۆ سەر گیانی پاکی (محمد المصطفی) (ﷺ) و ئال و بەیت و ، یارو یاوەران و شوێنکەوتوانی بە گشتی ، بە هۆی نەبوونی ئاوەها کتێبێك لە کتێبخانەکاندا ، هەڵسام بە نووسینی ئەم کتێبە ناوازە کە باس لە (بەڕێکردنی مردوو) دەکات ، کە بە شێوەیەکی زۆر ئاسان و ڕێك و پێك بابەتەکانی داڕێژراوە ، کە خوێنەری کورد زوبان بتوانێ سوودی لێ وەربگرێت .**

شایانی باسە بۆ هەموو باس و بابەتێك لە جێگەی خۆیدا بەلگەمان بۆ هێناوەتەوە ، ئیتر یا لە قورئانی پیرۆز دا ، یاخود لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) ، یاخود لەسەر ڕاوبۆچوونی هاوەڵان و زانایان (ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێ بێت).

هەروەها تەحقیق و تەخریجی سەرجەم فەرموودەکان کراوە و ، ئامـاژەش بە سەرچاوەکان کراوە بۆ زیاتر دڵنیابوونی خوێنەران .

شایانی باسە لە ڕووی (تەحقیقات) ە وە زۆر سوودم وەرگرتووە لە تەحقیقاتەکەی (أبو أسامة سليم بن عيد بن محمد الهلالي السلفي ) کە لەسەر (الأذكار) ی ئیمامی نەوەوی کردوویەتی بە ناوی (نيل الأوطار بتخريج أحاديث كتاب الأذكار وبيان صحيحه من ضعيفه) ، وە هەروەها سوودم وەرگرتووە لە کتێبە تەحقیق کراوەکانی (شيخ محمد ناصرالدين الألباني) (ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت) .

لە کۆتایی دا داوام وایە لە خوای پەروەردگار کەوا سەرکەوتووم بکات لەم کارەمدا ، بۆ ئەوەی تۆزقاڵێك منیش بەشداربم لە خزمەت کردنی ئایینەکەیدا ، وە بیکاتە مایەی سڕینەوەی گوناهەکانم و توێشووی ڕۆژی قیامەت .. آمین يا رب العالمين .

﴿ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ * وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ * وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

باوکی کەوسەر

هەردی صابر

( ١٤٣٤ ) ك - ( ٢٠١٣ ) ز

کوردستان - سلێمانی

# بەشی یەکەم
# سوننەت و ئادابەکانی کاتی نەخۆشی

## ١ ) ئەوەی لە نەخۆشیدا نەکرێ پاداشتی کاتی لەش ساغی بۆ هەیە

لە (ئەبوموسا)ی ئەشعەرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا مرض العبد ، أو سافر ، كتب له مثل ما كان يعمل مقيما صحيحا ))[1]

واتە: بەندە ئەگەر نەخۆش بوو یا چوو بۆ سەفەر ، خوای گەورە بە کەرەمی خۆی ئەو ئەجرو پاداشتەی بۆ دەنووسێ کە لەوەپێش لە حاڵەتی لەش ساخیدا بۆی دەنووسێ ، یا بە نیشتەجێی لە ماڵەوە بۆی دەنووسێ .

## ٢ ) فەزڵ و گەورەیی کاتی نەخۆشی

لە (ئوم عەلاء) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( عادني رسول الله (ﷺ) وأنا مريضة ، فقال: أبشري يا أم العلاء ، فإن مرض المسلم يذهب الله به خطاياه ، كما تذهب النار خبث الذهب والفضة ))[2]

---

[1] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجهاد والسير) ، بابی : (يكتب للمسافر مثل ما كان يعمل في الإقامة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩٥٠) و (٤٩٨٣)، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (أول مسند الكوفيين - حديث أبي موسى الأشعري) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٢٣٤).

[2] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (عيادة النساء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٩٢) ، هەروەها (عبد بن حميد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێرناونیشانی: (من حديث أم العلاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٦٨) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الكبير) دا ، بابی : (الياء - أم العلاء

واتــە : جارێکیــان نــەخۆش بــووم پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) هــات بــۆ ســەرلێدانم ، فەرمووی: ئەی ئـوم عـەلا ! مـژدەبێ لێت: کـە خـوای گـەورە بـە نەخۆشـی گونـاهی موسوڵمان پاك دەکاتەوە ، وەك چۆن زێڕو زیـو بـە ئـاگری کووره زاخـاو دەدرێـن و ژەنگ و چڵکیان پاك دەبێتەوە ئاوا !

## ٣ ) فەزڵی سەردانی کردنی نەخۆش

١- له (ثوبان) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبـەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من عاد مریضا، لم یزل في خرفة الجنة ، قیل: یـا رسـول الله (ﷺ) ! وما خرفة الجنة؟ قال: جناها ))[٢]

واتە: کاتـێ موسـوڵمان دەچـێ بـۆ هەواڵپرسـینی بـرای موسـوڵمانی نەخۆشـی، ئـەوە دەچێت بۆ ڕنینی میوەی بەهەشت هە تا دەگەڕێتەوە، وترا: ئـەی پێغەمبـەری خـوا مەبەست لەم ڕنینی میوەیە چی یە؟ فەرمووی: یانی بەری باخی بەهەشـت دەڕنـێ و - ئەم ئیشە باشەی دەبێ بە مایەی چوونە بەهەشتی -.

٢- لـە (عـەلی) کـوڕی (ئـەبو تاڵیـب) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنــەوە کـەوا فەرموویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفـەرموو: (( مـن أتـى أخـاه المسلم عائدا ، مشى في خرافة الجنـة حتـى يجلس ، فإذا جلس غمرتـه الرحمـة ، فإن كان

---

الأنصارية امرأة زيد بن ثابت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٢٤) ، هەروەها (ئەبی یـەعلا) لـە کتێبـی (معرفـة الصحابة) دا . بـابی : (العـين: أم العـلاء عمـة حـرام بـن حكـيم) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٧٣٥٣) ، هەروەها شێخ (ئـەلبانی) لـە (سـنن أبـی داود/ ج ٢، ص ١٨٤، ح ٣٠٩٢) ، و (صـحيح الجـامع الصغير/ ح ٧٨٥١)، و(سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ٢، ص ٣٣١، ح ٧١٤) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[٢] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (البر والصلة)، بابی: (فضل عيادة المريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٩٩)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في عيادة المريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٦٧) و (٩٦٨).

غدوة، صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يمسي ، وإن كان مساء ، صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يصبح ))[4]

واتە: هەركەسێ سەردانی برایەكی موسوڵمانی نەخۆشی بكات، وەك ئەوە وایە بە ناو باخ و باخاتێكی میوەی بەهەشتدا تێپەڕی بێ و هەنگاوی هەڵنابێ هەتا دادەنیشێ ، جا كاتێ دانیشت ڕەحمەت و بەزەیی خوایی دای دەپۆشێ و دای دەگرێتەوە ، جا ئەگەر سەردانەكەی سەرلەبەیانی بوو، ئەوە حەفتا (٧٠) هەزار مەلائیكە صلاّواتی لەسەر دەدەن و بۆی دەپاڕێنەوە هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە، وە ئەگەر سەردانەكەی سەرلەئێوارە بوو، ئەوە حەفتا (٧٠) هەزار مەلائیكە صلاّواتی لەسەر دەدەن و بۆی دەپاڕێنەوە هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە.

٣- لە (بەڕرائی) كوڕی (عازیب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( أمرنا النبي (ﷺ) بسبع ، ونهانا عن سبع: أمرنا بعيادة المريض، واتباع الجنازة ، وتشميت العاطس ، وإجابة الداعي ، ورد السلام ، ونصر المظلوم ، وإبرار المقسم. ونهانا عن سبع: عن خاتم الذهب ، أو قال: حلقة الذهب ، وعن لبس الحرير، والديباج ، والسندس ، والمياثر ))[5]

---

[4] صحيح - (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (في فضل العيادة على وضوء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٩٨) و (٣٠٩٩) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في ثواب من عاد مريضا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٤٢)، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح سنن ابن ماجه/ ج ١ - ص ٤٦٣ - ح ١٤٤٢) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٩٣٤) ، و (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ٣، ص ٣٥٣، ح ١٣٦٧) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[5] صحيح - (بوخاری) لە كتابی (الاستئذان)، بابی: (إفشاء السلام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٣٥)، هەروەها (موسليم) لە كتابی (اللباس والزينة)، بابی: (تحريم استعمال إناء الذهب والفضة على الرجال والنساء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٥٦)، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (اللباس)، بابی: (ما جاء في ركوب المياثر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧٦٠)، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز)، بابی:

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردووین کە حەوت شت بکەین: وە ڕێگریشی لێ کردووین لە حەوت شتی تر: فەرمانی پێ کردووین بە سەردانی نەخۆش، شوێنکەوتنی جەنازە ، نزای خێرکردن بۆ پژمیو، چوون بەدەم دەعوەتەوە، وەڵامدانەوەی سڵاو، یارمەتیداتی ستەم لێکراو، پشتگیری لە سوێند خۆر تا سوێندەکەی نەکەوێ، وە ڕێگریشی لێ کردووین لە حەوت شت: لە ئەنگوستیلەی ئاڵتوون کردنە پەنجە ، لە پۆشینی ئاوریشم ، لە (دیباج) کە جۆرێکە لە پۆشاکی ئاوریشمی بە نرخ ، لە (سوندوس) ، لە زینی ئاوریشم بۆ وڵاغی سواربی.

٤- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((حق المسلم على المسلم خمس: رد السلام ، وعيادة المريض ، واتباع الجنائز ، وإجابة الدعوة ، وتشميت العاطس ))[٦]

واتە: مافی موسوڵمان لەسەر برای موسوڵمانی پێنجە: وەڵامدانەوەی سەلام ، سەردانی نەخۆش ، شوێنکەوتنی جەنازە ، چوون بە دەم دەعوەتەوە ، نزای خێر بۆ پژمیو.

٥- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( حق المسلم على المسلم ست ، قيل: ما هن يا رسول الله؟، قال:

---

(الأمر باتباع الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٣٨)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الكفارات)، بابی: (إبرار المقسم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١١٥).

[٦] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر باتباع الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤٠)، هەروەها (موسلیم) لە ڕێی (حرملة بن يحيى) وە، لە کتابی (السلام)، بابی: (من حق المسلم للمسلم رد السلام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦١٥)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الأدب)، بابی: (في العطاس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٣٠).

إذا لقيته فسلم عليه ، وإذا دعاك فأجبه ، وإذا استنصحك فانصح له ، وإذا عطس فحمد الله فشمته ، وإذا مرض فعده ، وإذا مات فاتبعه ))[7]

واتە: مافی موسوڵمان لەسەر برای موسوڵمانی شەشە: وترا: ئەوانە کامانەن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: کە گەیشتی پێی سەلامی لێ بکە ، کە دەعوەتی کردیت بچۆ بە دەمیەوە ، کە داوای ئامۆژگاری لێ کردیت ئامۆژگاری بکە ، کە پژمی و سوپاسی خوای کرد، بڵێ: خوا ڕەحمەت پێ بکا، ئەگەر نەخۆش کەوت سەری لێ بدە، کە مرد شوێن جەنازەکەی بکەوە.

٦- لە (زەید) ی کوڕی (ئەرقەم) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( عادني رسول الله (ﷺ) من وجع كان بعيني ))[8] واتە : جارێکیان چاوم دەئێشا ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بۆنەی ئەوەوە هات بۆ سەرلێدانم .

٧- لە (عبدالله) ی کوڕی (عومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كنا جلوسا مع رسول الله (ﷺ) إذ جاءه رجل من الأنصار ، فسلم عليه ، ثم أدبر الأنصاري ، فقال رسول الله (ﷺ): يا أخا الأنصار كيف أخي سعد بن عبادة ؟ ، فقال: صالح ، فقال رسول الله (ﷺ): من يعوده منكم ؟ فقام ، وقمنا معه ، ونحن بضعة عشر ، ما علينا نعال ، ولا خفاف ، ولا قلانس ، ولا قمص ، نمشي في

---

[7] صحيح - (موسلیم) لە کتابی (السلام)، بابی: (من حق المسلم للمسلم رد السلام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦١٦)، هەروەها لە (تحفة الأشراف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٩٩٧).

[8] حسن - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في العيادة من الرمد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٠٢) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٩٨) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (العيادة من الرمد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٩٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٢، ص ١٨٦، ح ٣١٠٢)، و (مشكاة المصابيح / ج ١، ح ١٥٥١) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

تلك السباخ حتى جئناه ، فاستأخر قومه من حوله ، حتى دنا رسول الله (ﷺ) وأصحابه الذين معه ))[٩]

واته : جارێ له خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دانیشتبووین ، لەوکاتەدا پیاوێ لە کۆمەڵەی ئەنصارەکان هاتە خزمەتی ، سەلامی لە پێغەمبەر (ﷺ) کردو ویستی بڕوا ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ئەی برای ئەنصاری ! سەعدی کوڕی عوبادەی برام چۆنە ؟ پیاوەکە وتی: باشە . پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: سەعد نەخۆشە ، کێ دەیەوێ کە بچین بۆ سەرلێدان و هەواڵپرسینی ؟ جا پێغەمبەر (ﷺ) خۆی هەڵساو ئێمەیش کە نزیکەی دە پانزە نەفەرێ دەبووین هەڵساین و له خزمەتیدا ڕۆیشتین بۆلای (سەعد) ، هەموو پێ خاوس بووین ، نە پێڵاومان لەپێ بوو ، تەنانەت سۆلیشمان لەپێ نەبوو ، کڵاوو کراسیشمان لەبەر نەبوو ، تەواو ڕەش و ڕووت و ڕەجاڵ بووین ، بەو حاڵەوە و بەپێی پەتی ڕێمان گرتبوو ، هەتا چووینە ئەوێ ، خزمانی خۆی دەوریان چۆڵ کرد بۆ ئێمە ، جا ئێمەیش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چووینە پێشەوە بۆلای .

### ٤ ) موستەحەببە کەوا پرسیار لە کەس و کاری نەخۆش بکرێ و ئەویش وەڵام بداتەوە

لە (عبدالله) ی کوڕی (عەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( ان علي بن أبي طالب (رضي الله عنه) خرج من عند رسول الله

---

[٩] صحیح – (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في عيادة المرضى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٥).

(ﷺ) في وجعه الذي توفي فيه ، فقال الناس: يا أبا حسن ، كيف أصبح رسول الله (ﷺ)؟ فقال: أصبح بحمد الله بارئا ))[10]

واتە: لەو نەخۆشینەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کە تیایدا گیانی سپارد، (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) (خوای لێ ڕازی بێت) لە لای بوو، جا کاتێ هاتە دەرەوە خەڵکەکە پێیان وت: ئەی باوکی (حەسەن)! پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆنە؟ فەرمووی: لە سایەی خواوە چاکە و بەدیمەن حاڵی باشە .

## ٥ ) ئەوەی نەخۆش دروستە بۆ خۆی بیخوێنێ

١- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان رسول الله (ﷺ) إذا مرض أحد من أهله نفث عليه بالمعوذات ، فلما مرض مرضه الذي مات فيه ، جعلت أنفث عليه وأمسحه بيد نفسه ، لأنها كانت أعظم بركة من يدي ))[11]

واتە: ئەگەر یەکێ لە کەسەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەخۆش بکەوتایە سورەتی (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) ی بەسەردا دەخوێند و، فووی دەکرد بەسەریدا، بەڵام کاتێ خۆی نەخۆش کەوت لە نەخۆشینی وەفاتیدا، من

---

[10] صحيح – (بوخاری) لە کتابی (المغازي)، بابی: (مرض النبي (ﷺ) ووفاته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٦٦)، هەروەها لە (الأدب المفرد) دا ، بابی: (كيف أصبحت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٧٠)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی: (مسند عبد الله بن العباس بن عبد المطلب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٨٥)، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (قتال أهل البغي)، بابی: (الإستخلاف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٤١٤).

[11] صحيح – (موسلیم) لە کتابی (السلام)، بابی: (رقية المريض بالمعوذات والنفث) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٧٨)، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (١٦٩٦٤) هاتووە.

فووم دەکرد بەسەریدا و بە دەستی خۆی ڕوومەتیم دەماڵی، لەبەر ئەوەی دەستی ئەو لە دەستی من پیرۆز تر بوو.

٢- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( أن النبي (ﷺ) كان إذا اشتكى يقرأ على نفسه بالمعوذات ، وينفث ، فلما اشتد وجعه كنت أقرأ عليه ، وأمسح عنه بيده ، رجاء بركتها ))[١٢]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ نەخۆش بکەوتایە هەردوو سورەتی (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) ی دەخوێند و، فووی دەکرد بەسەر خۆیدا، بەلاّم کاتێ نەخۆشینەکەی زیادی کرد من دەمخوێند بەسەریدا و، بە دەستی خۆی دەمهێنا بە دەم و چاوو لاشەیدا، ئەوەش لەبەر پیرۆزی دەستی خۆی - واتە بۆیە بە دەستی خۆم نەم دەکرد، چونکە دەستی ئەوم بە بەرەکەت تر دادەنا -.

٣- لە (عوسمان) ی کوڕی (ئەبولعاص) ی سەقەفییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أنه شكا إلى رسول الله (ﷺ) وجعا يجده في جسده منذ أسلم فقال له رسول الله (ﷺ): ضع يدك على الذي تألم من جسدك، وقل باسم الله ثلاثا، وقل سبع مرات أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر ))[١٣]

---

[١٢] **صحیح** – (بوخاری) لە کتابی (فضل القرآن)، بابی: (فضل المعوذات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠١٦)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (السلام)، بابی: (رقية المريض بالمعوذات والنفث) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٧٩)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الطب)، بابی: (كيف الرقى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٩٠٢)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الطب)، بابی: (النفث في الرقية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٢٩).

[١٣] **صحیح** – (موسلیم) لە کتابی (السلام)، بابی: (استحباب وضع يده على موضع الألم مع الدعاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٠١)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الطب)، بابی: (كيف الرقى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٨٩١)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الطب)، بابی: (٢٩) گێڕاویەتەوە بە

واتە: جارێكیان سكالای بردە لای پێغەمبەر (ﷺ) لە ئاو ئازارێك كە لە لاشەیدا هەبوو لەو كاتەوە كە موسوڵمان بوبوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: دەستت دابنێ لەسەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە لەلاشەت، ئەمجا سێ جار بڵێ: (بسم الله) ، وە حەوت جار بڵێ: (أعوذ بالله وقدرتە من شر ما أجد وأحاذر) پەنا دەگرم بە گەورەیی و دەسەلات و توانایی خوا لە خراپە و زیانی ئەو ئێش و ئازارەی كە هەستی پێ دەكەم و مەترسیم لێی هەیە.

## ٦) زیكر و پاڕانەوەی ئەو كاتەی كە لەلای نەخۆشدای

١- لە دایكە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) كان إذا اشتكى الإنسان الشيء منه ، أو كانت به قرحة أو جرح، قال: النبي (ﷺ) بإصبعه هكذا ، ووضع سفيان سبابته بالأرض، ثم رفعها ، باسم الله ، تربة أرضنا، بريقة بعضنا، ليشفى به سقيمنا، بإذن ربنا))[14]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر مرۆڤێك ناساغ بوایە و ئازاری هەبوایە یان برینداری یان زامی پێوە بوایە پەنجەی ئاوا لێ دەكرد و دەیفەرموو: (سوفیان) كە گێڕەرەوەی فەرموودەكەیە پەنجەی شایەتمانی دەدا لە زەوی، پاشان بەرزی دەكردەوە و دەیفەرموو: (باسم الله، تربة أرضنا، بريقة بعضنا، ليشفى به سقيمنا،

---

ژمارە (٢٠٨٠)، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الطب)، بابی: (ما عوذ به النبي (ﷺ) وما عوذ به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٢٢).

[14] صحيح - (بوخاری) لە كتابی (الطب)، بابی: (رقيه النبی (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٤٥) و (٥٧٤٦)، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (السلام)، بابی: (استحباب الرقية من العين والنملة والحمة والنظرة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٨٣)، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الطب)، بابی: (كيف الرقی) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٨٩٥)، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الطب)، بابی: (ما عوذ به النبي (ﷺ) وما عوذ به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٢١).

بإذن ربنا) بەناوی خوا گڵ و خۆڵی زەوی یەکەمان بە لیکی هەندێکمانەوە دەبێتە شیفا بۆ ناساغەکانمان بە ئیزنی پەروەردگارمان

٢- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان رسول الله (ﷺ) إذا اشتكى منا إنسان ، مسحه بيمينه ، ثم قال: أذهب الباس، رب الناس ، واشف أنت الشافي ، لا شفاء إلا شفاؤك ، شفاء لا يغادر سقما ))[١٥]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستووری وابوو، کاتێ کەسێ لە ئێمە ئازارێکی ببوایە دەستی ڕاستی دەهێنا بە شوێنی ئازارەکەدا و دەیفەرموو: (أذهب الباس، رب الناس، واشف أنت الشافي، لا شفاء إلا شفاؤك ، شفاء لا يغادر سقما) ئەم ئێش و ئازارە لابەرە، ئەی پەروەردگاری هەرچی ئادەمیزادە! شیفای بدە و چاکی بکەرەوە، چونکە شیفادەری ڕاستەقینە هەر خۆتی و خۆشبوونەوە هەر بەدەستی تۆیە، بێجگە لە تۆ شیفادەری تر نییە، چارەساز هەر خۆتی ، شیفایەکی تەواوی وا کە هیچ دەرد و نەخۆشییەك نەهێڵێ.

٣- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) كان إذا عاد مريضا يقول: أذهب الباس ، رب الناس ، اشفه أنت الشافي ، لا شفاء إلا شفاؤك ، شفاء لا يغادر سقما ))[١٦]

---

[١٥] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (المرضى)، بابی: (دعاء العائد للمريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٧٥)، هەروەها لە کتابی (الطب)، بابی: (رقية النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٤٣)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (السلام)، بابی: (استحباب رقية المريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٧١)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الطب)، بابی: (ما عوذ به النبي (ﷺ) وما عوذ به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٢٠).

[١٦] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (المرضى)، بابی: (دعاء العائد للمريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٧٥)، هەروەها لە کتابی (الطب)، بابی: (رقية النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٤٣)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (السلام)، بابی: (استحباب رقية المريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستووری وابوو، کاتێ سەردانی نەخۆشێکی بکردایە دەیفەرموو: (أذهب الباس، رب الناس، اشفه أنت الشافي، لا شفاء إلا شفاؤك، شفاء لا يغادر سقما) ئەم ئێش و ئازارە لابەرە، ئەی پەروەردگاری هەرچی ئادەمیزادە! شیفای بدە و چاکی بکەرەوە ، چونکە شیفادەری ڕاستەقینە هەر خۆتی و خۆشبوونەوە هەر بەدەستی تۆیە، بێجگە لە تۆ شیفادەری تر نییە، چارەساز هەر خۆتی، شیفایەکی تەواوی وا کە هیچ دەرد و نەخۆشیەك نەهێڵێ.

٤- لە (عوسمان) ی کوڕی (ئەبولعاص) ی سەقەفییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أنه شكا إلى رسول الله (ﷺ) وجعا يجده في جسده منذ أسلم فقال له رسول الله (ﷺ): ضع يدك على الذي تألم من جسدك، وقل: باسم الله ثلاثا، وقل: سبع مرات، أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر ))[١٧]

واتە: جارێکیان سکاڵای بردە لای پێغەمبەر (ﷺ) لە تاو ئازارێك کە لە لاشەیدا هەبوو لەو کاتەوە کە موسوڵمان بوبوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: دەستت دابنێ لەسەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە لەلاشەت، ئەمجا سێ جار بڵێ: (بسم الله) ، وە حەوت جار بڵێ: (أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر) پەنا دەگرم بە گەورەیی و دەسەڵات و توانایی خوا لە خراپە و زیانی ئەو ئێش و ئازارەی کە هەستی پێ دەکەم و مەترسیم لێی هەیە .

---

(٥٦٧١)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الطب)، بابی: (ما عوذ به النبي (ﷺ) وما عوذ به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٢٠).

[١٧] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (السلام)، بابی: (استحباب وضع يده على موضع الألم مع الدعاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٧٠١)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الطب)، بابی: (كيف الرقى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٨٩١)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الطب)، بابی: (٢٩) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٨٠)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الطب)، بابی: (ما عوذ به النبي (ﷺ) وما عوذ به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٢٢).

٥- له (سەعد) ی کوڕی (ئەبی وەققاص) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: ((أن النبي (ﷺ) دخل على سعد يعوده بمكة، فبكى، قال: ما يبكيك؟ فقال: قد خشيت أن أموت بالأرض التي هاجرت منها، كما مات سعد بن خولة، فقال النبي (ﷺ): اللهم اشف سعدا، اللهم اشف سعدا، ثلاث مرار.. ))[18]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لە (مەککە) تەشریفی هات بۆ سەردانی (سەعد)، جا (سەعد) گریا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: چی دەتگرێنێ؟ (سەعد) یش وتی: قوربان دەترسم هەروەك چۆن (سەعدی کوڕی خەولە) لە مەککەدا مرد ئاوها منیش لەو شوێنە بمرم کە کۆچم لێی کردووە ، جا پێغەمبەر (ﷺ) سێ جار لەسەریەك فەرمووی: (**اللهم اشف سعدا**) خوایە ! دەرمانی دەردی (سەعد) بدە و شیفای بفەرموو.

٦- لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((من عاد مريضا، لم يحضر أجله فقال عنده سبع مرار: أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك، إلا عافاه الله من ذلك المرض))[19]

واتە: کەسێ بچێ بۆ سەرلێدانی نەخۆشێ، کە ئاکامی نەهاتبێ، لە لای ئەم نزایە حەوت جار بڵێ: (أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك، إلا عافاه الله من

---

[18] **صحيح** – (موسلیم) لە کتابی (الوصية)، بابی: (الوصية بالثلث) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٩١)، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (٣٩٤٩) هاتووە.

[19] **حسن** – (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الدعاء للمريض عند العيادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٠٦)، هەروەها (ترمزی) لە کتابی (الطب)، بابی: (٣٢) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٨٣)، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (عمل اليوم والليلة) دا، لە ژێر ناونیشانی: (موضع مجلس الإنسان من المريض عند الدعاء له) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٤٨)، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٠١).

ذلك المرض) داوا لە خوای گەورە و مەزن دەکەم ، کە خاوەنی عەرشی مەزنە کە دەرمانی دەردت بکات و شیفات بدا، مسۆگەر خوای گەورە لەو نەخۆشیە چاکی دەکاتەوە.

٧- لە (عبدالله) ی کوڕی (عەمر) ی کوڕی (عاص) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا جاء الرجل يعود مريضا، فليقل: اللهم اشف عبدك ينكأ لك عدوا، أو يمشي لك إلى صلاة))[٢٠]

واتە: ئەگەر کەسێ چووە سەردانی نەخۆشێ، ئەوە با بڵێت: (اللهم اشف عبدك ينكأ لك عدوا، أو يمشي لك إلى صلاة) خوایە شیفای بەندەکەت بدە تا دوژمنت بۆ بۆڕبدات و ئەزیەتی بدات یان لەبەر تۆ بچێت بۆ نوێژکردن.

٨- لە (ئەبو موسليم) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: شایەتی ئەدەم کەوا (ئەبو سەعیدی خودری) و (ئەبو هورەیرە) شایەتییاندا کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من قال: لا إله إلا الله والله أكبر، صدقه ربه، فقال: لا إله إلا أنا، وأنا أكبر، وإذا قال: لا إله إلا الله وحده قال: يقول الله: لا إله إلا أنا وحدي، وإذا قال: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، قال الله: لا إله إلا أنا وحدي لا شريك لي، وإذا قال: لا إله إلا الله له الملك وله الحمد، قال الله: لا إله إلا أنا، لي الملك

---

[٢٠] حسن - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الدعاء للمريض عند العيادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٠٧)، هەروەها (ابن السنی) لە (عمل اليوم والليلة)، بابی: (نوع آخر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٤٨)، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز وما يتعلق بها مقدما أو مؤخرا) دا ، بابی : (المريض وما يتعلق به - ذكر ما يستحب للمرء أن يدعو لأخيه العليل بالبرء ليطيع الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٥)، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (المناسك) دا لە ژێر ناونیشانی : (وأما حديث رافع بن خديج) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٦)، هەروەها (تەبەرانی) لە (الدعاء)، بابی: (الدعاء للمريض عند عيادته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٢٤).

ولي الحمد، وإذا قال: لا إله إلا الله ولا حول ولا قوة إلا بالله، قال الله: لا إله إلا أنا، ولا حول ولا قوة إلا بي، وكان يقول: من قالها في مرضه ثم مات لم تطعمه النار ))[21]

واتە: هەرکەسێ بڵێ: (لا إله إلا الله والله أكبر) هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە خوا، خوا لە هەموو کەسێ گەورەترە، خوای پەروەردگار بۆی مۆر دەکا و دەفەرموێ: (لا إله إلا أنا، وأنا أكبر) ڕاستە وایە، هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە خۆم، وە من لە هەموو کەسێ گەورەترم، وە کاتێ وتی: (لا إله إلا الله وحده) هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە خوای تاك و تەنها، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (لا إله إلا أنا وحدي) ، ڕاستە وایە، هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە منی تاك و تەنها، وە کاتێ وتی: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له) ، هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە خوای تاك و تەنها کە هیچ هاوبەشێکی نییە ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (لا إله إلا أنا وحدي لا شريك لي) ڕاستە وایە، هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە منی تاك و تەنها، وە هیچ هاوبەشێکیشم نییە، وە کاتێ وتی: (لا إله إلا الله له الملك وله الحمد) ، هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە خوا، هەموو موڵك و سوپاسێك هەر بۆ خوایە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (لا إله إلا أنا، لي الملك ولي الحمد) هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە خۆم، پادشایی و خاوەنێتی و سوپاس و ستایش لە ڕاستیدا هەر بۆ منە و بەس، وە کاتێ وتی: (لا إله إلا الله ولا حول ولا قوة إلا بالله) هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە

---

[21] صحيح - (ترمذی) لە کتابی (الدعوات)، بابی: (ما يقول العبد إذا مرض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٤٣٠)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الأدب)، بابی: (فضل لا إله إلا الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧٩٤)، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الرقائق)، بابی: (الأذكار- ذكر الكلمات التي إذا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٢٥).

خـوا، وه هـیـچ گـۆڕان و هێـز و توانایـەك نییـە مەگـەر بـە خـوای دەسـتـەڵاتداری کاربەجێوە، خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: (لا إلـه إلا أنـا، ولا حـول ولا قـوة إلا بـي) ڕاستە وایە، هیچ پەرستراوێ نییە شایانی پەرستن بێ جگە لە خۆم، وە هیچ گۆڕان و هێـز و توانایـەکیش نییـە ئـیللا دەبـێ ویـست و دەسـەڵاتی منـی لەگەڵـدا بـێ، وە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: هەر کەسـێ لـە نەخۆشـیدا ئەمـە بخوێنـێ، ئەگـەر لـەو نەخۆشینەدا بمرێ ئاگری دۆزەخ نایخوات - واتە: نای سوتێنێ -.

٩- لـە (ئـەبو سـەعید) ی خـودری یـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( أن جبريل أتى النبي (ﷺ) فقال: يا محمد اشتكيت؟ فقال: نعم، قال: باسم الله أرقيك ، من كل شيء يؤذيك، من شر كل نفس أو عين حاسد ، الله يـشفيك باسم الله أرقيك ))[٢٢]

واتە: (جوبرەئیل) هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و فەرمووی: ئەی (محمد) ئازارت هەیە؟ فـەرمووی: بـەڵێ، (جوبرەئیـل) فـەرمووی: (باسـم الله أرقيـك، مـن كـل شـيء يؤذيك، من شر كل نفس أو عين حاسد، الله يشفيك باسم الله أرقيك) بەناوی خـواوە نوشتەت بۆ دەخوێنم، لە هەموو شتێك کە ئازارت بدات، لە شـەڕی هـەموو دەروون نەخۆشێك، لە هەموو چاوێکی پیسیش، خوا شیفات بدات، بەناوی خـواوە نوشـتە و نزات بۆ دەخوێنم.

---

[٢٢] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (السلام)، بابی: (الطب والمرض والرقى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٦٤)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في التعوذ للمريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٧٢)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الطب)، بابی: (ما عوذ به النبي (ﷺ) وما عوذ به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٢٣).

١٠- لـه دایكـه (عائیـشه) وه (خـوای لیٚ ڕازی بێـت) دهگێڕنـهوه كـهوا فهرموویـهتی: (( كان إذا اشتكى رسول الله (ﷺ) رقاه جبريل، قال: باسم الله يبريك، ومن كل داء يشفيك، ومن شر حاسد إذا حسد، وشر كل ذي عين ))[23]

واته: ههر كاتێ پێغهمبهری خوا (ﷺ) ئازاری ببوایه (جوبرهئیل) دوعای بهسهردا دهخوێندهوه و دهیفهرموو: (باسم الله يبريك، ومن كل داء يشفيك، ومن شر حاسد إذا حسد، وشر كل ذي عين) بهناوی خواوه دهپارێمهوه ئازارت لابهرێت، له ههموو دهردێك شیفات بدات، وه له خراپهی ههموو حهسوودێك كه حهسادهت بهرێت، وه له خراپهی ههموو چاو پیسێكیش بتپارێزێت!

١١- لـه (ئیبنوعـهبباس) وه (خـوای لیٚ ڕازی بێـت) دهگێڕنـهوه كـهوا فهرموویـهتی: (( كان النبي (ﷺ) إذا دخل على مريض يعوده فقال له: لا بأس، طهور إن شاء الله، قال: قلت: طهور؟ كلا، بل هي حمى تفور، أو تثور، على شيخ كبير، تزيره القبور، فقال النبي (ﷺ): فنعم إذا ))[24] واتـه: پێغهمبـهر (ﷺ) ئهگـهر بچوایه بـۆ سـهردانی نهخۆشێك پێی دهفهرموو: (**لا بأس، طهور إن شاء الله**) قهیدی نییه، خودا حـهزكا و

---

[23] **صحيح** - (موسلیم) له كتابی (السلام)، بابی: (الطب والمرض والرقى) گێڕاویهتهوه به ژماره (٥٦٦٣)، ههروهها له (تحفة الأشراف) دا به ژماره (١٧٧٤٦) هاتووه.

[24] **صحيح** - (بوخاری) له كتابی (المرضى)، بابی: (عيادة الأعراب) گێڕاویهتـهوه بـه ژمـاره (٥٦٥٦)، ههروهها له ههمان كتابدا، بابی: (ما يقال للمريض) گێڕاویهتـهوه بـه ژمـاره (٥٦٦٢)، ههروهها لـه (الأدب المفرد) دا، بابی: (ما يقال للمريض) گێڕاویهتهوه به ژماره (٥٤٤)، ههروهها (ابن حبان) لـه كتابی (الجنائز وما يتعلق بها مقدما أو مؤخرا)، بابی: (المريض وما يتعلق بـه - ذكر مـا يـستحب للعواد أن يطيبوا قلوب الأعلاء عند عيادتهم إياهم) گێڕاویهتـهوه بـه ژمـاره (٢٠١١)، ههروهها (بهیههقی) له كتابی (الجنائز)، بـابی: (ما يستحب من تسلية للمريض) گێڕاویهتـهوه بـه ژمـاره (٦٢٠٦)، ههروهها (تهبهرانی) له (الدعاء)، بابی: (النهي عن الدعاء بالبلاء) گێڕاویهتـهوه بـه ژمـاره (١٩٠٥).

ویستی لەسەربێ کەففارەی گوناح و پاککەرەوەی نەنگە، (ئیبنوعەبباس) دەڵێ: منیش وتم: پاککەرەوەی نەنگە، نەخێر، بەڵکو ئەمە لەرز و تایە و ئەم پیرە ئیختیارە هەڵدەچۆقێنێ و لە کوڵی نابێتەوە تا نەیخاتە گۆڕ! پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: کەواتە وەك تۆ دەڵێیت با وابێ.

١٢- لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) دخل على أعرابي يعوده وهو محموم، فقال النبي (ﷺ): كفارة وطهور. فقال الأعرابي: حمى تفور على شيخ كبير تزيره القبور. فقام النبي (ﷺ) وتركه ))[٢٥]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ سەردانی پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی نەخۆش، کە سەرەخۆشی لێ کرد فەرمووی: (كفارة وطهور) کەففارەی گوناح و پاککەرەوەی نەنگە ، کابرای دەشتەکیش وتی: بەڵکو ئەمە لەرز و تایە و ئەم پیرە ئیختیارە هەڵدەچۆقێنێ و لە کوڵی نابێتەوە تا نەیخاتە گۆڕ! جا پێغەمبەر (ﷺ) لە لای کابرای دەشتەکی هەستا و ڕۆیشت.

١٣- لە (عائیشە) ی کچی (سەعد)* ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( اشتكيت بمكة فجاءني النبي (ﷺ) يعودني ،

---

[٢٥] **صحيح لغيره** - (ابن السنی) لە (عمل اليوم والليلة)، بابی: (ما يقول إذا دخل على مريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٦)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی: (ومن مسند بني هاشم - مسند أنس بن مالك رضي الله تعالى عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٣٥١)، هەروەها (ئەبویەعلا) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی: (ابوعمران الجوني) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٣٣)، هەروەها (تەبەڕانی) لە کتێبی (الدعاء)، بابی: (النهي عن الدعاء بالبلاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٠٦).

* مەبەست لە (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) ە .

ووضع يده على جبهتي ، ثم مسح صدري وبطني ، ثم قال: اللهم اشف سعدا وأتمم له هجرته ))[٢٦]

واتە : لە مەککە نەخۆش کەوتم پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ هەواڵ پرسینم ، جا دەستی لەسەر تەوێڵم دانا ، ئنجا دەستی هێنا بە سینگ و سکما و فەرمووی: خوایە ! شیفای (سەعد) بدەو ، کۆچەکەی بۆ تەواوکە و ، لە مەککە مەیمرێنە (کە شوێنی لەدایك بوونیەتی).

### ٧ ) ئەوەی دروستە نەخۆش بیلێ لە کاتی نەخۆشییەکەیدا

١- لە (عبدالله) ی کوڕی (مەسعود) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( دخلت على رسول الله (ﷺ) وهو يوعك، فمسسته بيدي ، فقلت: يا رسول الله إنك لتوعك وعكا شديدا ، فقال رسول الله (ﷺ): أجل إني أوعك كما يوعك رجلان منكم ، قال: فقلت: ذلك أن لك أجرين ، فقال رسول الله (ﷺ): أجل ، ثم قال رسول الله (ﷺ): ما من مسلم يصيبه أذى من مرض ، فما سواه إلا حط الله به سيئاته، كما تحط الشجرة ورقها ))[٢٧]

---

[٢٦] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الدعاء للمريض بالشفاء عند العيادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٠٤) ، هەروەها (بوخاری) لە کتێبی (الأدب المفرد) دا ، بابی : (العيادة جوف الليل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩٩) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٠٠) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (وضع اليد على المريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٠٠) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ٣، ص ١٨٧، ح ٣١٠٤) ، و(الأدب المفرد/ ج ١، ص ١٧٦، ح ٤٩٩) دا فەرموویەتی: (صحيح)ە.

[٢٧] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (المرضى)، بابی: (شدة المريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٤٧)، هەروەها لە هەمان کتابدا، بابی: (أشد الناس بلاء الأنبياء، ثم الأمثل فالأمثل) گێڕاویەتەوە بە

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەخۆش بوو چووم بۆ سەردانی، جا بە دەستی خۆم دەستم لێ دا، تایەکی گرانی هەبوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! تایەکی گران دایگرتوویت ، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ وایە، من کە تا دام دەگرێ بە قەد دوو پیاو لە ئێوە تا دام دەگرێ، وتم: ئەوە لەبەر ئەوەیە کە تۆ دوو قات پاداشت بۆ هەیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ ئەوە وایە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ هەر ئێش و ئازارێکی بێتە ڕێ بەهۆی نەخۆشییەوە، ئەوە خوای گەورە خراپەکانی دا دەپۆشێ، وەك چۆن گەڵای درەختێ سەرپاك هەڵوەرێ ئاوا گوناهی پێوە نامێنێ.

٢- لە (سەعد) ی کوڕی (ئەبو وەققاص) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: ((جاءنا رسول الله (ﷺ) يعودني من وجع اشتد بي ، زمن حجة الوداع، فقلت: بلغ بي ما ترى، وأنا ذو مال ، ولا يرثني إلا ابنة لي ، أفأتصدق بثلثي مالي؟ قال: لا، قلت: بالشطر؟ قال: لا ، قلت: الثلث؟ قال: الثلث كثير، أن تدع ورثتك أغنياء خير من أن تذرهم عالة يتكففون الناس، ولن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله إلا أجرت عليها، حتى ما تجعل في في امرأتك))[٢٨]

واتە: لە حەجی ماڵ ئاوایی دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی هات بۆ ماڵمان و سەردانی کردم لەبەر نەخۆشییەکی بەشیدەت کە پێی نزیك بوومەوە لە مردن،

---

ژمارە (٥٦٤٨)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (البر والصلة والآداب)، بابی: (ثواب المؤمن فيما يصيبه من مرض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٠٤).

[٢٨] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (المرضى)، بابی: (قول المريض: إني وجع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٦٨)، هەروەها لە کتابی (الدعوات)، بابی: (الدعاء برفع الوباء والوجع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣٧٣)، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (المريض يقول: وارأساه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٨٢)، هەروەها (مروزی) لە کتابی (السنة) دا، لە ژێر ناونیشانی : (ذكر الوجه الثاني من السنن التي اختلفوا فيها أهي ناسخة لبعض) هێناویەتی بە ژمارە (٢١٤).

عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەخۆشییەکەم گەیاندوومیە ئەم حاڵەی کە دەیبینی، ماڵم زۆر هەیە ، جگە لە کچێکم هیچ میراتگرێکی ترم نییە، ئایا دوو لە سێی ماڵەکەم بکەم بە خێر و صەدەقە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر، وتم: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: ئەی سێیەکی؟ فەرمووی: سێیەکیش زۆرە، ئەگەر میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بێڵی چاکترە لەوە کە بە هەژاری بەجێیان بێڵی و دەست لە خەڵك پانکەنەوە، هیچ خەرجییەك کەم یا زۆر نییە کە تەنها بۆ خوا بیکەیت و خوای گەورە پاداشتت نەداتەوە، تەنانەت ئەو پاروەی کە هەڵی دەبڕی و دەیخەیتە دەمی ژنەکەتەوە ئەوەیش هەر خێر و صەدەقەیە.

٣- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( واراساه ، فقال رسول الله (ﷺ): ذاك لو كان وأنا حي فأستغفر لك وأدعو لك، فقالت عائشة: وا ثكلياه ، والله إني لأظنك تحب موتي ، ولو كان ذاك ، لظللت آخر يومك معرسا ببعض أزواجك ، فقال النبي (ﷺ): بل أنا واراساه ، لقد هممت - أو أردت - أن أرسل إلى أبي بكر وابنه فأعهد، أن يقول: القائلون أو يتمنى المتمنون ، ثم قلت: يأبى الله ويدفع المؤمنون ، - أو يدفع الله ويأبى المؤمنون - ))[٢٩]

واتە: تووشی سەرئێشە بووبووم دەموت: ئای سەرم! پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ئەوەی کە دەیڵێی ئەگەر ببێ و من زیندوویم داوای لێخۆشبوونت بۆ

---

[٢٩] صحيح – (بوخاری) لە کتابی (الأحكام)، بابی: (الاستخلاف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٦٦)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (وفاة النبي (ﷺ) )، بابی: (بدء علة النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٨٥٢)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند الأنصار - الملحق المستدرك من مسند الأنصار - حديث السيدة عائشة رضي الله عنها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٣٣٩)، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (المريض يقول: واراساه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٨١)، هەروەها (دارەقوتنی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (التسليم في الجنازة واحدا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٩٤).

دەکەم لە خوا و دوعات بۆ دەکەم، (عائیشە) فەرمووی: وای دایك ڕۆڵەڕۆم بۆ بکا! (والله) گومانت بۆ دەبەم کە حەز بە مردنم دەکەی، ئەگەر بمرم ئێوارێی ئەو ڕۆژەت بە زاوایی دەچیە لای یەکێ لە خێزانەکانت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: من ئای سەرم ، بەڕاستی وا هات بە خەیاڵما کە بنێرم بە شوێن (ئەبوبەکر) و کوڕەکەیدا، کە وەسیەت بکەم بە خەلافەت بۆی، مەبادا هەندێ کەس قسەی لێ بکەن، ئەو بڵێ بۆ من و ئەم بڵێ بۆ من ، یا هەندێ ئومێددار بە ئومێدی بن بۆی، لە پاشان وتم: خوا ئیبا لەوە دەکا و باوەڕداران دەفعی ئەوە دەکەن کە خەلافەت بۆ غەیری ئەو بێ، یا فەرمووی: خوا دەفعی ئەوە دەکا و باوەڕداران ئیبای لێ دەکەن.

٤- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: ((سمعت النبي (ﷺ) وهو مستند إلي يقول: اللهم اغفر لي وارحمني وألحقني بالرفيق))[٢٠] واتە: لە کاتی سەرەمەرگا پێغەمبەر (ﷺ) لە باوەشما بوو، پاڵی دابوو پێمەوە، لەو دەمەدا گوێم لێی بوو دەیفەرموو: خوایە! لێم خۆشبە و، میهرەبانیم لەگەڵدا بنوێنە و بەزەییت پێتەوە پیاما و، بمبەرەوە بۆ لای یارانی پایە بەرز.

## ٨) پاڕانەوەی ئەو نەخۆشەی دەستی لە دنیا شۆشتووە و بێزاربووە

١- لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا يتمنين أحدكم الموت من ضر أصابه ، فإن كان لا بد فاعلا ، فليقل: اللهم أحيني ما كانت الحياة خيرا لي ،

---

[٢٠] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (المرضی)، بابی: (تمني المريض الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٧٤)، هەروەها (ابن ابی شیبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الدعاء) دا لە ژێر ناونیشانی: (ما ذكر فيما دعا به النبي (ﷺ) عند) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٧٣٥).

وتوفني إذا كانت الوفاة خيرا لي ))[31] واتە: ئەگەر یەکێکتان دووچاری زیانێ بوو با مەرگ بە ئاوات نەخوازێ، ئەگەر هەر زۆری بۆ هات و چاری نەبوو مەرگی خۆی بە ئاوات خواست با بڵێ: (اللهم أحيني ما كانت الحياة خيرا لي ، وتوفني إذا كانت الوفاة خيرا لي) ئەی خوایە! هەتا ژیانم باشترە بۆم بم ژێنە، کەییش مردنم باشتر بوو بۆم، بم مرێنە.

٢- لە (قەیس) ی کوڕی (حازم) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( دخلنا على خباب وقد اكتوى سبع كيات في بطنه ، فقال: لو ما أن رسول الله (ﷺ) نهانا أن ندعو بالموت ، لدعوت به ))[32]

واتە: چووم بۆ لای (خەبباب)، لە حەوت لاوە سکی خۆی داخ کردبوو، جا فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی ئەوەی لێ نەکردینایە کە مەرگ بە ئاوات بخوازین ، ئەوە مەرگی خۆم بە ئاوات دەخواست .

---

[31] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (المرضی)، بابی: (تمني المريض الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٧٢)، هەروەها لە کتابی (الدعوات)، بابی: (الدعاء بالموت والحياة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣٥١)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الذکر والدعاء)، بابی: (كراهة تمني الموت لضر نزل بە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٥٥)، هەروەها (ترمزی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في النهي عن التمني للموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٧١)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (تمني الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٢٠).

[32] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (المرضی)، بابی: (تمني المريض الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٧٢)، هەروەها لە کتابی (الدعوات)، بابی: (الدعاء بالموت والحياة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣٤٩) و (٦٣٥٠)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الذکر والدعاء)، بابی: (كراهة تمني الموت لضر نزل بە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٥٨)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الدعاء بالموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٢٢).

٣- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا يتمنى أحدكم الموت ، ولا يدع به من قبل أن يأتيه، إنه إذا مات أحدكم انقطع عمله، وإنه لا يزيد المؤمن عمره إلا خيرا ))[٣٣] واتە: هیچکام لە ئێوە با مەرگ بە ئاوات نەخوازێ ، وە لە پێش هاتنی مردنا داوای مردن نەکا ، چونکە کاتێ یەکێ لە ئێوە دەمرێ کردەوەی دەپچڕێ و مونقەتیع دەبێ ، وە ئەوەی لە تەمەنی مرۆڤی باوەڕدارا زیاد دەکا تەنها خێر و چاکەیە.

## ٩ ) دروست نییە زۆر بکەی لە نەخۆش لە کاتی خواردن و خواردنەوەیدا

لە (عوقبە) ی کوڕی (عامر) ی جوهەنییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا تكرهوا مرضاكم على الطعام والشراب، فإن الله يطعمهم ويسقيهم))[٣٤] واتە: بە زۆر نان و ئاو دەرخواردی نەخۆش مەدەن، چونکە نەخۆش خوای گەورە خۆی نان و ئاوی دەداتێ!

## ١٠ ) هەڵسوکەوتی چاك لەگەڵ نەخۆشدا و ئارام گرتن لەسەری

لە (عیمران) ی کوڕی (حوصەین) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن امرأة من جهينة أتت نبي الله (ﷺ) وهي حبلى من الزنى، فقالت: يا نبي الله (ﷺ)، أصبت حدا ، فأقمه علي ، فدعا نبي الله (ﷺ) وليها، فقال: أحسن إليها، فإذا وضعت فأتني بها، ففعل، فأمر بها نبي الله (ﷺ)، فشكت عليها ثيابها،

---

[٣٣] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الذكر والدعاء)، بابی: (كراهة تمني الموت لضر نزل به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٦٠)، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (١٤٧٦٦) هاتووە.

[٣٤] **حسن بشواهده** - (ترمذی) لە کتابی (الطب)، بابی: (ما جاء لا تكره مرضاكم على الطعام والشراب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٤٠)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الطب)، بابی: (لا تكرهوا المريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٤٤٤).

ثم أمر بها فرجمت، ثم صلى عليها، فقال له عمر: تصلي عليها يا نبي الله (ﷺ) وقد زنت؟ فقال: لقد تابت توبة لو قسمت بين سبعين من أهل المدينة لوسعتهم ، وهل وجدت توبة أفضل من أن جادت بنفسها لله تعالى؟ ))[٣٥]

واتە: ژنێکی جوهەینەیی زۆڵێکی لە سکدا بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! شایانی حەددم حەددم لێ بدە، پێغەمبەر هەقداری ژنەکەی بانگ کرد و فەرمووی: باشبە بۆی و چاك بە لەگەڵی، کە سکەکەی دانا ژنەکەم بۆ بێنە، ئەویش ئاوای کرد و فەرمایشتەکەی پێغەمبەری بەجێ هێنا، جا پێغەمبەر فەرمانی فەرموو ژنەکەیان بە جلەکانی خۆیەوە شەتەك دا هەتا لە کاتی سەنگە سارکردندا لەشی دەرنەکەوێ، جا فەرمانی کرد بەردەباران کرا، لە پاشا خۆی نوێژی مردووی لەسەر کرد، (عومەر) یش پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەمە داوێن پیسی کردووە کەچی تۆ نوێژی لەسەر دەکەی! فەرمووی: بەڕاستی ئەمە تەوبەیەکی وەهای کردووە ئەگەر بێت و دابەشبکرێ بەسەر حەفتا کەس لە خەڵکی مەدینەدا بەشی هەموویان دەکا، تەوبە لەوە باشتر دەبێ چی بێ کە گیانی خۆیی بەخشی لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە!

---

[٣٥] **صحیح** - (موسلیم) لە کتابی (الحدود)، بابی: (من اعترف على نفسه بالزنى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤٠٨)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الحدود)، بابی: (المرأة التي أمر النبي برجمها من جهينة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤٤٠)، هەروەها (ترمزی) لە کتابی (الحدود)، بابی: (تربص الرجم بالحبلى حتى تضع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٣٥)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على المرجوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٦).

## ١١) موستەحەببە زۆر یادی مردن بکات

لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( أکثـروا ذکـر هـاذم اللـذات ))[٣٦]
واتە: زۆر یادی مەرگ بکەن ، ئەو مەرگەی کە هەموو خۆشییەك تێك دەدات !

## ١٢) دروست نییە ئاوات بخوازێ بە مەرگ

١- لـە (ئەنـەس) ی کـوڕی (مالیـك) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( لا یتمـنین أحـدکم الموت مـن ضـر أصابه ، فإن کـان لا بـد فـاعلا، فلیقل: اللهم أحیني ما کانت الحیاة خیرا لي ، وتوفني إذا کانت الوفاة خیرا لي ))[٣٧]
واتە: ئەگەر یەکێکتان دووچاری زیانێ بوو بـا مـەرگ بـە ئـاوات نـەخوازێ، ئەگـەر هەر زۆری بۆ هات و چاری نەبوو مـەرگی خـۆی بـە ئـاوات خواست بـا بڵـێ: **(اللـهم**

---

[٣٦] **حسن صحیح** – (ترمذی) لە کتابی (الزهد)، بابی: (ما جاء في ذکر الموت) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٢٣٠٧)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بـابی: (کثـرة ذکـر المـوت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٨٢٣)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الزهد)، بابی: (ذکر الموت والإستعداد لـە) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٤٢٥٨)، هـەروەها شێخ (ئـەلبانی) لـە (جـامع الترمـذي / ج ٤ - ص ٥٥٣ - ح ٢٣٠٧)، و (سـنن النـسائي / ج ٤ - ص ٤ - ح ١٨٢٤)، و (سـنن ابـن ماجـە / ج ٢ - ص ١٤٢٢ - ح ٤٢٥٨)، و (صـحیح الترغیب والترهیب / ج ٣ - ح ٣٣٣٣) دا فەرموویەتی: سەنەدەکەی (حسن صحیح) ە.

[٣٧] **صحیح** – (بوخـاری) لـە کتـابی (المرضـی)، بـابی: (تمـني المـریض المـوت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٥٦٧٢)، هەروەها لە کتابی (الدعوات)، بابی: (الدعاء بالموت والحیاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣٥١)، هـەروەها (موسـلیم) لـە کتـابی (الـذکر والـدعاء)، بـابی: (کراهـة تمـني المـوت لـضر نـزل بـە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٥٥)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في النهي عن التمني للموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٧١)، هەروەها (نەسائی) لە کتـابی (الجنـائز)، بـابی: (تمـني الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٢٠).

**أحيني ما كانت الحياة خيرا لي، وتوفني إذا كانت الوفاة خيرا لي) ئەی خوایە ! هەتا ژیانم باشترە بۆم بم ژێنە، کەییش مردنم باشتر بوو بۆم، بم مرێنە.**

**٢- لە (ئوم فەزڵ) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) دخل على العباس وهو يشتكي ، فتمنى الموت ، فقال: يا عباس ! يا عم رسول الله ! لا تتمن الموت ، إن كنت محسنا تزداد إحسانا إلى إحسانك خير لك ، وإن كنت مسيئا ، فإن تؤخر تستعتب خير لك ، فلا تتمن الموت ))[38]**

**واتە : جارێ پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای (عەبباس) ی مامی کە نەخۆش بوو ، وە مردنی بە ئاوات دەخواست ، فەرمووی پێی: ئەی عەبباس ! ئەی مامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! مردن بە ئاوات مەخوازە ، چونکە ئەگەر چاکەکار بیت چاکەی تر دەخەیتە سەرچاکەکانت ، جا خێرە بۆت ، وە ئەگەر خراپەکاریش بیت ئەوە ئەگەر مردنت دوا بخرێت و هەوڵی ڕەزامەندی خوا بدەیت ، وەوەش هەر خێرە بۆت ، لەبەر ئەوە مردن بە ئاوات مەخوازە .**

---

[38] **صحيح** – (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند النساء - حديث أم الفضل امرأة عباس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٢٧٥) ، هەروەها (الحارث) لە (مسند) ە کەیدا لە کتابی (التوبة والاستغفار) ، بابی: (النهي عن تمني الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧١) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٨٦) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الکبیر) دا ، بابی : (اللام - هند بنت الحارث الخثعمية أم عبد الله بن شداد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٩٤٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٣، ح ٣٣٦٨) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

٣- لـە (قـەیس) ی كـوڕی (حـازم) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە كـەوا فەرموویەتی: (( دخلنا على خباب وقد اكتوى سبع كيات في بطنه ، فقال: لو ما أن رسول الله (ﷺ) نهانا أن ندعو بالموت ، لدعوت به ))[٣٩]

واتـە: چـووم بـۆ لای (خـەبباب)، لـە خـەوت لاوە سـكی خـۆی داخ كردبـوو، جـا فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی ئەوەی لێ نەكردینایە كە مـەرگ بە ئاوات بخوازین، ئەوە مەرگی خۆم بە ئاوات دەخواست.

٤- لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە كـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا يتمنى أحدكم الموت، ولا يدع به من قبل أن يأتيه ، إنه إذا مات أحدكم انقطع عمله ، وإنه لا يزيد المؤمن عمره إلا خيرا ))[٤٠]

واتە: هیچكام لە ئێوە با مەرگ بە ئاوات نەخوازێ، وە لە پێش هـاتنی مردنـا داوای مردن نەكا، چونكە كاتـێ یـەكێ لـە ئێـوە دەمـرێ كـردەوەی دەپـچڕێ و مونقـەتیع دەبێ، وە ئەوەی لە تەمەنی مرۆڤی باوەڕدار زیاد دەكا تەنها خێر و چاكەیە.

**بەڵام ئەگەر كەسێك ترسی هەڵگەڕانەوەی لە ئایین هەبوو ، یاخود ترسی لە تووشبوون بە فیتنە و ئاشووب هەبوو ، ئەوە قەیناكا حەز لە مردن بكات:**

لـە (موعـاز) ی كـوڕی (جەبـەل) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە كـەوا فەرموویەتی: (( احتبس عنا رسول الله (ﷺ) ذات غداة من صلاة الصبح حتى كدنا

---

[٣٩] صحیح - (بوخاری) لـە كتـابی (المرضی)، بـابی: (تمـني المـریض المـوت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٥٦٧٢)، هەروەها لە كتابی (الدعوات)، بابی: (الدعاء بالموت والحياة) گێڕاویەتەوە بە ژمـارە (٦٣٤٩) و (٦٣٥٠)، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (الذكر والدعاء)، بابی: (كراهة تمـني المـوت لـضر نـزل بـە) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٦٧٥٨)، هـەروەها (نەسـانی) لـە كتـابی (الجنـائز)، بـابی: (الـدعاء بـالموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٢٢).

[٤٠] صحیح - (موسـلیم) لـە كتـابی (الـذكر والـدعاء)، بـابی: (كراهـة تمـني المـوت لـضر نـزل بـە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٦٠)، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (١٤٧٦٦) هاتووە.

نتراءى عين الشمس ، فخرج سريعا فثوب بالصلاة ، فصلى رسول الله (ﷺ) وتجوز في صلاته ، فلما سلم دعا بصوته فقال لنا: على مصافكم كما أنتم ، ثم انفتل إلينا فقال: أما إني سأحدثكم ما حبسني عنكم الغداة: أني قمت من الليل فتوضأت فصليت ما قدر لي فنعست في صلاتي فاستثقلت ، فإذا أنا بربي تبارك وتعالى في أحسن صورة ، فقال: يا محمد قلت: لبيك رب ، قال: فيم يختصم الملأ الأعلى؟ قلت: لا أدري رب ، قالها ثلاثا ، قال: فرأيته وضع كفه بين كتفي حتى وجدت برد أنامله بين ثديي ، فتجلى لي كل شيء وعرفت ، فقال: يا محمد ، قلت: لبيك رب ، قال: فيم يختصم الملأ الأعلى؟ قلت: في الكفارات ، قال: ما هن ؟ قلت: مشي الأقدام إلى الجماعات ، والجلوس في المساجد بعد الصلوات ، وإسباغ الوضوء في المكروهات ، قال: ثم فيم ؟ قلت: إطعام الطعام ، ولين الكلام ، والصلاة بالليل والناس نيام . قال: سل . قلت: اللهم إني أسألك فعل الخيرات ، وترك المنكرات ، وحب المساكين ، وأن تغفر لي وترحمني ، وإذا أردت فتنة في قوم فتوفني غير مفتون ، وأسألك حبك وحب من يحبك ، وحب عمل يقرب إلى حبك ، قال رسول الله (ﷺ): إنها حق فادرسوها ثم تعلموها ))[41]

واتە : بەیانیەکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) درەنگ تەشریفی هێنا بۆلامان بۆ نوێژی بەیانی ، تەنانەت ئەوەندە درەنگ هات خەریکبوو خۆر خۆی ببینین ، لەپاشا بە پەلە هات و قامەتی نوێژ کراو نوێژی بە گورجی بۆ کردین ، جا کە سەلامی نوێژی

---

[41] **صحيح** - (ترمذی) لە کتابی (تفسير القرآن) ، بابی : (ومن سورة ص) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٣٥) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند الأنصار - حديث معاذ بن جبل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٥٣١) ، هەروەها (ابن خزيمة) لە کتێبی (التوحيد) دا ، لە ژێر ناونیشانی: (أخبار عبد الله بن مسعود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٥، ص ٣٦٨، ح ٣٢٣٥) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ١، ح ٧٤٨) ، و (ظلال الجنة/ ج ١، ح ٣٨٨) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

دایەوە بە دەنگی خۆی بانگی کردین پێی فەرمووین: با پێتان بڵێم کە بۆچی ئەم بەیانیە درەنگ هاتم بۆ ناوتان: ئەمشەو هەڵسام دەستنوێژم گرت و ئەوەندەی کە خوا لە چارەی نووسیبووم نوێژم کرد ، تا بەدەم نوێژکردنەوە خەو بردمیەوە ، تەنانەت لەشم قورس بوو ، جا کاتێکم زانی کەوا پەروەردگاری گەورەم لە جوانترین شێوەدا هاتۆتە خەوم ، فەرمووی پێم: ئەی موحەممەد ! وتم: بفەرموو ئەی پەروەردگارم ! فەرمووی: ئەنجوومەنی باڵا لەسەر چی مشتومڕو دەمەقاڵێیانە ! وتم: نازانم ، پێغەمبەر (ﷺ) سێ جار ئەم پرسیارو وەڵامەی وتەوە ، ئنجا فەرمووی: جا چاوم لێ بوو خوای گەورە دەستی دانا لەسەر ناوشانم ، ئیتر فێنکایی سەر پەنجەکانی گەیشت بەناو هەناوم و دڵم پڕبوو لە زانست و هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوە و شت نەما کە نەیزانم ، جا خوای گەورە فەرموویەوە: ئەی موحەممەد ! وتم: بفەرموو ئەی بینایی چاوان ! فەرموویەوە: ئەنجوومەنی باڵا لەسەر چی مشتومڕو دەمەقاڵێیانە ! وتم: لەسەر نووسین و تۆمارکردنی ئەو کردەوە باشانە مقۆمقۆیانە کە دەبن بە مایەی گەیشتن بە پایە بەرزەکانی بەهەشت ، یا دەبن بەهۆی سڕینەوەی گوناهو تاوان ، فەرمووی: جا ئەوانە چی و چین ؟ وتم: تێکۆشان و هەنگاونانە بۆ ڕێی خێرو چاکە ، وە دانیشتنە لە مزگەوت لەپاش کردنی نوێژەکان ، وە دەستنوێژگرتنی تێرو تەسەلە لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا ، فەرموویەوە: لەسەر چی تریش ؟ عەرزم کرد: لەبارەی نانبدەیی و قسە نەرمی و گوفتار شیرینی و شەونوێژکردن لەو کاتانەدا کە خەڵك وان لە خەوی شیریندا ، فەرمووی: داوا بکە . منیش وتم: خوایە داوات لێ دەکەم یارمەتیم بدەیت کاری خێر بکەم و واز لە خراپەکاری بهێنم و ، هەژارانم خۆش بوێت ، وە داوات لێ دەکەم لێم ببوریت و بەزەییت پێمدا بێتەوە ، وە ئەگەر ویستت نەتەوەکەم تووشی ئاشووب و فیتنەیەك بکەیت ئەوە من بمرێنە بێ ئەوەی تووشی فیتنە ببم ، وە داوات لێ دەکەم خۆشەویستی خۆت بخەیتە دڵمەوە ، وە ئەوانەم خۆش بوێت کە

تۆیان خۆش دەوێت ، وە کارێکم خۆش بوێت کە نزیکم بکاتەوە بۆ خۆشەویستی تۆ . دواتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەم خەون و فەرمایشت و وشانە ڕاست و دروستن هەم لەبەریان بکەن و ، هەم دوعاو نزایان پێ بکەن و ، هەم فێری خەڵکی تریان بکەن .

## ١٣ ) چاکێتی تەمەن درێژی لەگەڵ بەردەوامێتی کردەوەی چاکدا

أ- لە (عبدالرحمن) ی کوڕی (ئەبی بەکر) ی سەقەفییەوە لە باوکیەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رجلا قال: يا رسول الله (ﷺ) أي الناس خير ، قال: من طال عمره ، وحسن عمله ، قال: فأي الناس شر ؟ قال: من طال عمره وساء عمله ))[٤٢]

واتە : باوکم فەرمووی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! چاکترین کەس کێ یە ؟ فەرمووی: ئەوکەسەی تەمەنی درێژ بێت و کردەوەی چاك بێت . وتی: ئەی خراپترین کەس کێ یە ؟ فەرمووی: ئەوکەسەی تەمەنی درێژ بێ و کردەوەی خراپ بێت .

---

[٤٢] **صحيح** - (ترمذی) لە کتابی (الزهد) ، بابی : (منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٢٩) ، هەروەها (دارەمی) لە کتابی (الرقاق) ، بابی : (أي المؤمنين خير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٩٤) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (أول مسند البصريين - حديث أبي بكرة نفيع بن الحارث بن كلدة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٩١٣) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الزهد) ، بابی : (ما ذكر عن نبينا في الزهد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٣٧٥٥) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (طوبى لمن طال عمره وحسن عمله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٣٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذی/ ج ٤، ص ٥٦٥، ح ٢٣٢٩) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٣٢٩٧) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

ب- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ألا أنبئكم بخيركم؟ ، قالوا: نعم يا رسول الله (ﷺ). قال: خياركم أطولكم أعمارا ، وأحسنكم أعمالا ))[٤٣]

واتە : ئایا پێتان بڵێم چاکترینتان کامانەن ؟ وتیان: بەڵێ پێمان بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، فەرمووی: چاکترینتان ئەوانەن کە تەمەنیان درێژتر بێت و چاکترین کردەوە بکەن .

### ١٤ ) کردنی کردەوەی چاك پێش مردن نیشانەی عاقیبەت خێرییە

لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا أراد الله بعبد خيرا استعمله ، فقيل: كيف يستعمله يا رسول الله (ﷺ)؟ قال: يوفقه لعمل صالح قبل الموت ))[٤٤]

---

[٤٣] **صحيح** - (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند أبي هريرة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٠٣١) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (فصل في أعمار هذه الأمة - ذكر البيان بأن من خيار الناس من حسن عمله في طول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٣٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ٣، ص ٢٨٦، ح ١٢٩٨) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٣٢٦٢) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

[٤٤] **صحيح** - (ترمذی) لە کتابی (القدر) ، بابی : (ما جاء أن الله كتب كتابا لأهل الجنة وأهل النار) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٤٢) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند أنس بن مالك رضي الله تعالى عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٨٠٢) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٨٩) ، هەروەها (عبد بن حميد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند انس بن مالك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٩٥) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتێبی (الأسماء والصفات) دا ، بابی : (قول الله عز وجل : ﴿يريد الله ليبين لكم﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٠) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذی/ ج ٤، ص ٤٥٠، ح ٢١٤٢) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٣٠٥) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ٣، ح ٥٢٨٨) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٣، ح ٣٣٥٧) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

واتە : ئەگەر خوای گەورە چاکەی بەندەیەکی بوێت بەکاری دەهێنێت ، وتیان: چۆن بەکاری دەهێنێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی: پێش ئەوەی بمرێ یارمەتی دەدات بۆ کردەوەی چاك پاشان گیانی دەکێشێت .

## ١٥) گومانی باش بە خوا لەکاتی سەرەمەرگا پەسەندە

لە (جابیر) ی کوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( سمعت النبي (ﷺ) قبل وفاته بثلاث ، يقول: لا يموتن أحدكم إلا وهو يحسن بالله الظن ))[45] واتە : لە پێغەمبەرم بیست (ﷺ) لەپێش مردنیا ، بەسێ ڕۆژ ، دەیفەرموو: مەمرن تا ئومێدی باشتان بەهێز دەبێ بە بەخشش و کەرەمی خوای گەورە !

## ١٦) هەرکەسێ حەز بە دیداری خوا بکات خوایش حەز بەدیداری ئەو دەکات

لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من أحب لقاء الله ، أحب الله لقاءه ، ومن كره لقاء الله ، كره الله لقاءه ، فقلت: يا نبي الله أكراهية الموت ؟ فكلنا نكره الموت ، فقال: ليس كذلك ، ولكن المؤمن إذا بشر برحمة الله ورضوانه وجنته ، أحب لقاء الله ، فأحب الله لقاءه ، وإن الكافر إذا بشر بعذاب الله وسخطه ، كره لقاء الله ، وكره الله لقاءه ))[46]

---

[45] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنة وصفة نعيمها وأهلها) ، بابی : (الأمر بحسن الظن بالله تعالى عند الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٥٨) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الزهد) ، بابی : (التوكل واليقين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٦٧).

[46] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الرقاق) ، بابی : (من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٠٧) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الذكر والدعاء) ، بابی : (من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه ومن كره لقاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٦٣).

واته : هەرکەسێ حەز بە دیداری خوا بکات، خوایش حەز بەدیداری ئەو دەکات ، وە هەرکەسێ حەز لە دیداری خوا نەکات، خوایش حەز لەدیدارو چارەی ئەو ناکات. (عائیشه) فەرمووی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! خۆ ئەگەر مەبەست لەم حەز پێ نەکردنە حەز نەکردن بێ لەمردن، ئەوە کەسمان حەزمان لەمردن نیە، فەرمووی: مەبەست ئەوە نیە کەتۆ تێی گەیشتوویت، بەڵام موسوڵمان لەسەرەمەرگا مەلائیکە مژدەی ڕەحمەت و سۆزو ڕەزامەندی خوای دەدەنێ ، لەگەڵ موژدەی شاد بوون بە بەهەشت ، ئیتر ئەویش هیچی تری وەك ئەوە پێخۆش نابێ، وە حەز لە دیداری خوا دەکاو خوایش حەز لە دیداری ئەو دەکا، وە کافرو بێ بڕواش کاتێ کە مردن ئێخەی دەگرێ و موژدەی سزاو تۆڵە لێ سەندن و تووڕەیی خوای پێ دەدرێ ، ئیتر هیچی تری وەك ئەوە پێ ناخۆش نابێ ، وە حەز لە دیداری خوا ناکا و خوایش حەز لە دیداری ئەو ناکا .

## ١٧ ) پاڕانەوە بۆ ئەوەی لە شوێنێکی پیرۆزا بمرێ

لە (زەید) ی کوڕی (ئەسلەم) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕنەوە کەوا (عومەر) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: (( اللهم ارزقني شهادة في سبيلك ، واجعل موتي في بلد رسولك (ﷺ) ))[٤٧]

واته: خوایە! شەهیدیم پێ ببەخشی لە پێناو ڕێبازەکەتدا، وە بم مرێنی لە شاری پێغەمبەرەکەتدا (ﷺ).

---

[٤٧] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (فضائل المدینة)، بابی: (کراهیة النبي (ﷺ) أن تعری المدینة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٦)، هەروەها (مالیك) لە (موطأ) دا لە کتابی (الجهاد)، بابی: (ما تکون فیه الشهادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٩٣)، هەروەها (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجهاد)، بابی: (من سأل الشهادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٢٥٨).

(موهله) يە - (موهله): ئەو چڵكە شلەيە كە لە مرۆڤەوە دەردەچێت پاش مردن - جا وەفاتی نەكرد تا ئێوارەی سێ شەممە ، جا پێش ئەوەی بەیانی بێتەوە نێژرا و بەخاك سپێررا .

٢- لە (عەمر) ی كوڕی (مەیمون) ی ئەودییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( رأيت عمر بن الخطاب (رضي الله عنه)، قال: يا عبد الله بن عمر، اذهب إلى أم المؤمنين عائشة رضي الله عنها، فقل: يقرأ عمر بن الخطاب عليك السلام ، ثم سلها، أن أدفن مع صاحبي ، قالت: كنت أريده لنفسي فلأوثرنه اليوم على نفسي، فلما أقبل، قال: له ما لديك؟ قال: أذنت لك يا أمير المؤمنين، قال: ما كان شيء أهم إلي من ذلك المضجع ، فإذا قبضت فاحملوني ، ثم سلموا، ثم قل: يستأذن عمر بن الخطاب ، فإن أذنت لي، فادفنوني ، وإلا فردوني إلى مقابر المسلمين ..))[49]

واتە: (عومەری كوڕی خەتتاب) م بینی (خوای لێ ڕازی بێت) لە كاتی پێكرانەكەیدا، لە پاشا فەرمووی: ئەی (عبدالله) ی كوڕی (عومەر) بچۆرە خزمەت دایكی باوەڕداران (خوای لێ ڕازی بێت) و بڵێ: (عومەری كوڕی خەتتاب) سەلامت لێ دەكا، پاشان بڵێ: (عومەری كوڕی خەتتاب) داوای مۆڵەتت لێ دەكات كە لە خزمەت هاوڕێكانیدا - كە پێغەمبەر و (ﷺ) ئەبوبەكرە - بنێژرێت ، دایكی ئیماندارانیش لە وەڵامی (عبدالله) دا فەرمووی: ئەو جێیەم بۆ خۆم دانابوو، بەڵام ئیمڕۆ فەزڵی ئەو دەدەم بەسەر خۆمدا، جا كە (عبدالله) گەڕایەوە و چووە خزمەتی، ئیمامی (عومەر) پێی فەرموو: ها چیت لایە؟ (عبدالله) ش عەرزی كرد: مۆڵەتی دای ئەی ئەمیری باوەڕداران، فەرمووی: هیچ شتێ لە لام لەو شوێنە گرنگتر نەبوو - واتە

---

[49] **صحيح** - (بوخاری) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في قبر النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٩٢)، هەروەها (حاكم) لە (مستدرك) دا لە كتابی (معرفة الصحابة رضي الله عنهم) دا ، لە ژێر ناونیشانی : (مقتل عمر رضي الله عنه على الاختصار) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤٦٨).

زۆرخەمیم بوو - جا کاتێ تەمەنم کۆتایی پێ هات و گیانم کێشرا هەڵم بگرن و - بمبەن بۆ لای حوجرەی (عائیشە) - پاشان سەلامی عەرز بکە و، بڵێ: کە (عومەری کوڕی خەتتاب) داوای مۆڵەت دەکا، ئەگەر مۆڵەتی دام ئەوە بمبەنە ژوورێ و لەوێ بمنێژن ، وە ئەگەر مۆڵەتی نەدام ئەوە بمگێڕنەوە بۆ گۆڕستانی موسوڵمان و لەوێ بمنێژن - چونکە نەبادا ئیزنی پێشووی لە ڕوو دامابێ - .

٣- لە (عامر) ی کوڕی (سەعد) ی کوڕی (ئەبی وەققاص) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن سعد بن أبي وقاص ، قال: في مرضه الذي هلك فيه: الحدوا لي لحدا ، وانصبوا علي اللبن نصبا ، كما صنع برسول الله (ﷺ) ))[٥٠]

واتە: (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) لەو نەخۆشینەدا کە تێیدا وەفاتی کرد، فەرمووی: لەسەر شێوەی (لەحەد) گۆڕم بۆ هەڵکەنن ، و پاشان خشت دابنێن لەسەرم ، هەروەك چۆن بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنجام درا.

٤- لە (ئیبن شەمماسە) ی میهری یەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( حضرنا عمرو بن العاص ، وهو في سياقة الموت ،... فإذا أنا مت فلا تصحبني نائحة ، ولا نار ، فإذا دفنتموني فشنوا علي التراب شنا ، ثم أقيموا حول قبري قدر ما تنحر جزور ويقسم لحمها ، حتى أستأنس بكم ، وأنظر ماذا أراجع به رسل ربي ))[٥١]

---

[٥٠] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في اللحد ونصب اللبن على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٣٧)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (اللحد والشق) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٠٧)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في استحباب اللحد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٥٦).

[٥١] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الإيمان)، بابی: (كون الإسلام يهدم ما قبله وكذا الهجرة والحج) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٧)، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (١٠٧٣٧) هاتووە.

واتە: لەو كاتەی (عەمر) ی کوڕی (عاص) لە سەرەمەرگدا بوو ئێمەیش لەلای ئامادە بووین ،...، جا فەرمووی: کە مردم نە سەردۆلکەبێژ - واتە ژنی شیوەنكەر - و، نە ئاگر و بخوردم لەگەڵدا نەیەت بۆ سەر گۆڕستان ، وە لە كاتی ناشتنمدا خۆڵ و گڵەکە کەمە کەمە بکەن بەسەرما، لە پاشدا ئەوەندە لە دەوری گۆڕەکەم بوەستن کە وشترێ سەربېڕێ و گۆشتەکەی دابەش بکرێ ، هەتا هۆبگرم پێتانەوە و بە زاتی ئێوەوە سامم بشکێ و بیرێ بکەمەوە کە چۆن وەڵامی نێردراوەکانی پەروەردگارم بدەمەوە و چییان پێ بڵێم !

## ١٩ ) باش نیە مرۆڤ بە قەرزاری بمرێ

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( نفس المؤمن معلقة بدينه حتى يقضى عنه))[٥٢] واتە : ڕۆحی موسوڵمان لەپاش مردنی بەندو گیرۆدەی ئەو قەرزەیە کە لەسەریەتی ، هەروا دەمێنێ و پایەی بەڕێزی خۆی لێ قەدەغەیە تا قەرزەکەی بۆ دەدەنەوە .

---

[٥٢] صحیح - (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء عن النبي (ﷺ) أنه قال) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٨) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الصدقات) ، بابی : (التشديد في الدين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤١٣) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی: (فصل في الصلاة على الجنازة - ذكر العلة التي من أجلها كان لا يصلي النبي صلى الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٦) ، هەروەها (دارمی) لە کتابی (البیوع) ، بابی : (ما جاء في التشديد في الدين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٤٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٣، ص ٣٨٩، ح ١٠٧٨) ، و (سنن ابن ماجە/ ج ٢، ص ٨٠٦، ح ٢٤١٣) ، و (إرواء الغليل/ ج ٣، ح ٧٦٣) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٦٧٧٩) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٢، ح ١٨١١) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ٢، ح ٢٩١٥) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

## ٢٠ ) مردن مایەی حەسانەوەی بەندەکانە

له (ئەبی قەتادە) ی کوڕی (ڕیبعی) ئەنصارییەوە (خوای لیّ ڕازی بیّت) دەگیّڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) مر عليه بجنازة ، فقال: مستريح ومستراح منه ، قالوا: يا رسول الله (ﷺ) ! ما المستريح والمستراح منه ؟ فقال: العبد المؤمن يستريح من نصب الدنيا ، والعبد الفاجر يستريح منه العباد ، والبلاد ، والشجر ، والدواب ))[٥٢]

واتە : تەرمیّ بەلای پیّغەمبەری خوادا (ﷺ) تیّ پەڕی ، فەرمووی: یا بۆ خۆی ڕزگاری بوو ، یاخود خەڵك لەدەستی ڕزگاریان بوو ، وتیان: چۆن چۆنی ئەی پیّغەمبەری خوا (ﷺ) ! فەرمووی: بەندەی خاوەن ئیمان کە دەمریّ بۆ خۆی لە کیّشە و بەرەی دونیا قوتاری دەبیّ و دەحەسیّتەوە ، وە بەندەی بەدکارو تاوانکاریش کە دەمریّ عەالەمیّ دەحەویّتەوە: بەندەکان و ، وڵات و ، دارو درەخت و ، زیندەوەران لەدەست زیان و وەزەنی ڕزگاریان دەبیّ !

## ٢١ ) مردنی کوتوپڕ

(ئەبوداود) ی سەجستانی لە (عوبەید) ی کوڕی (خالید) ی سولەمییەوە (خوای لیّ ڕازی بیّت) دەگیّڕیّتەوە کە یەکیّکە لە هاوەڵانی پیّغەمبەری خوا (ﷺ) کەوا فەرموویەتی: جاریّك دەڵیّ: کە پیّغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ، وە جاریّك دەڵیّ: کە

---

[٥٢] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الرقاق) ، بابی : (سكرات الموت) گیّڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥١٢) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في مستريح ومستراح منه) گیّڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٩٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (استراحة المؤمن بالموت) گیّڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٢٩).

(عوبەید) خۆی فەرموویەتی: (( موت الفجأة أخذة أسف ))[54] واتە : مردنی کوتوپڕ جێی نیگەرانی و داخە .

## ٢٢ ) تەمەنی ئادەمیزادەکانی ئوممەتی ئیسلام

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( أعمار أمتي ما بين الستين إلى السبعين ، وأقلهم من يجوز ذلك ))[55]

واتە : تەمەنی ئادەمیزادی ئوممەتەکەم لە نێوان شەست و حەفتاساڵیدایە و ، کەم کەسیان لەوە تێ دەپەڕێت.

---

[54] **صحيح** – (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (موت الفجأة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٠) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند المكيين - حديث عبيد بن خالد السلمي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٢٠٠) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٢، ص ١٨٨، ح ٣١١٠) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٦٦٣١) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[55] **حسن** – (ترمذی) لە کتابی (الدعوات) ، بابی : (منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٥٠) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الزهد) ، بابی : (الأمل والأجل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٣٦) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (فصل في أعمار هذه الأمة - ذكر الإخبار عن وصف العدد الذي به يكون عوام أعمار الناس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٣٢) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (التفسیر) ، لە ژێر ناونیشانی: (تفسير سورة الملائكة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٣٢) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من بلغ ستين سنة فقد أعذر الله إليه في العمر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٣٧) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٥، ص ٥٥٣، ح ٣٥٥٠) ، و (سنن ابن ماجه/ ج ٢، ص ١٤١٥، ح ٤٢٣٦) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ٣، ح ٥٢٨٠) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

## ٢٣ ) پاداشتی منداڵ مردن

١- لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا یموت لمسلم ثلاثة من الولد ، فیلج النار ، إلا تحلة القسم ))[56] واتە : هەر موسوڵمانێ سێ منداڵی بمرن مەگەر بۆ ئاهی سوێند بچێتە دۆزەخ !

٢- لـە (ئەبوسـەعید) ی خودرییـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( أن النساء قلن للنبي (ﷺ): اجعل لنا یوما فوعظهن ، وقال: أیما امرأة مات لها ثلاثة من الولد ، کانوا حجابا من النار ، قالت امرأة: واثنان ؟ قال: واثنان ))[57] واتە : ئافرەتان وتیان بـە پێغەمبـەر (ﷺ) کەوا ڕۆژێکمان بۆ دابنێ ، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕۆژێکی تایبەتیْ بۆ دیاری کردن و لەو ڕۆژەدا پەندی دادان و ئامۆژگاری کردن و فەرمووشی: هەر ژنێ سێ جگەر گۆشەی بمرن دەبن بـە شووراو پەرژین بۆی بـە دەوری ئاگری دۆزەخدا ، ئافرەتێکیش وتی: ئەی ئەگەر دوانی بمرێ چۆنە؟ فەرمووی: ئەگەر دوانیشی بمرێ هەروایە !

---

[56] **صحیح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (فضل من مات لە ولد فاحتسب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥١) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (البر والصلة) ، بابی : (فضل من یموت لە ولد فیحتسبە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٣٩) ، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الکبری) دا ، لە ژێر ناونیشانی: (سورة الرعد - قولە تعالی: ﴿وإن منکم إلا واردها﴾) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٨٧٥) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في ثواب من اصیب بولدە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٠٣).

[57] **صحیح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (فضل من مات لە ولد فاحتسب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤٩) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (البر والصلة) ، بابی : (فضل من یموت لە ولد فیحتسبە) لە ڕێی (ئەبوهورەیرە) وە گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٤٢).

٣- لـە (ئەبوموسـا) ی ئەشـعەری یـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا مات ولد العبد قال الله لملائكته: قبضتم ولد عبدي ، فيقولون: نعم ، فيقول: قبضتم ثمرة فؤاده ، فيقولون: نعم، فيقول: ماذا قال عبدي؟ فيقولون: حمدك واسترجع ، فيقول الله: ابنوا لعبدي بيتا في الجنة ، وسموه بيت الحمد ))[٥٨]

واتـە: کاتـێ کـە بەندەیـە منـاڵێکی دەمـرێ، خـوای گـەورە بـە مەلائیکەتـەکانی دەفـەرموێ: گیـانی منـداڵی بەندەکـەمتان کێـشا؟ دەڵـێن: بـەڵێ، دەفـەرموێ: جگەرگۆشەکەیتان لێ سەند و بەشی دڵتان لێ وەرگرت؟ دەڵێن: بەڵێ، جا دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم چی گوت؟ دەڵێن: حەمد و سوپاسی تۆی کرد و وتی: (**إنا لله وإنا إليه راجعون**) ، ئەوجا خوای گەورە دەفەرموێ: کۆشکێ لە بەهەشتدا دروست بکەن بۆ ئەو بەندەیەم و ناوی لێ بنێن کۆشکی حەمد و سوپاس.

---

[٥٨] **حسن** – (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (فضل المصيبة إذا احتسب) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٠٢١)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لـە ژێـر ناونیـشانی: (أول مـسند الكوفيين - حـديث أبي موسى الأشعري) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٢٧٩)، هـەروەها (ابـن حبـان) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في الـصبر وثـواب الأمـراض والأعـراض) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٧٢٦)، هـەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يرجى في المصيبة بالأولاد إذا احتسبهم) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٦٧٢٥) ، هـەروەها شێخ (ئـەلبانی) لـە (جـامع الترمـذي/ ج ٢، ص ٣٤١، ح ١٠٢١) ، و (صـحيح الجـامع الـصغير/ ح ٧٩٥) ، و (سلـسلة الأحاديـث الـصحيحة/ ج ٣، ص ٣٩٨، ح ١٤٠٨) ، و (ريـاض الصالحين/ ص ٣٦٢، ح ٩٢٧) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

# بەشی دووەم
# ئەوانەی سوننەتە لە سەرەمەرگدا و لەدوای مردن بکرێ

## یەکەم: ئەوانەی سوننەتە بۆ سەرەمەرگێ بکرێ

### ١) تەڵقین دادانی:

مەبەست لە تەڵقین کردنی ئەوەیە: بەردەوام ئەوانەی لە دەوروبەری دان (**لا إله إلا الله**) بخەنەوە یادی ، وە هەوڵی لە گەڵدا بدەن بە نەرمی کەوا بەردەوام بیڵێتەوە .

أ- لە (موعاز) ی کوڕی (جەبەل) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من كان آخر كلامه لا إله إلا الله دخل الجنة ))[٥٩] واتە: کەسێ دوا قسەی (**لا إله إلا الله**) بێ دەچێتە بەهەشتەوە.

ب- لە (ئەبو سەعید) ی خودری یەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لقنوا موتاكم لا إله إلا الله ))[٦٠]

---

[٥٩] **صحيح بشواهده** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في التلقين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٦)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند الأنصار - حديث معاذ بن جبل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٥٥٠)، هەروەها (تەبەرانی) لە (معجم الكبير) دا لە ژێر ناونیشانی (من اسمه معاذ - حديث كثير بن مرة الحضرمي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧٠٣٩)، هەروەها لە (الدعاء)، بابی: (فضل قول: لا إله إلا الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٦٨)، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٣٣)، هەروەها (بەیهەقی) لە (شعب الإيمان) دا، لە ژێر ناونیشانی : (في آداب العيادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٩٠٢)، هەروەها (بەززار) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی: (أول الخامس والعشرين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٧٧).

واتە: ئەو کەسانەتان کەلە سەرەمەرگدان (لا إله إلا الله) یان بدەن بە گوێدا و - ئەم وشە پیرۆزەیان لەو کاتە ناسکەدا یاد بخەنەوە .

**زانایان دەفەرموون**[*] : نابێ زۆری لێ بکرێ بۆ وتنی ، وە نابێ بوترێت بڵێ: (لا إله إلا الله) نەك ماندوو ببێت و قسەیەکی نادروست بکات ، بەڵکو دەبێ بە شێوەیەك بێت خۆی لەبەر خۆیەوە وشەی (لا إله إلا الله) بڵێت و بیدات بە گوێی دا ، بۆ ئەوەی مردووەکە تێ بگات کە مەبەستیان ئەوە و بتوانێ بیڵێت ، وە ئەگەر جارێك وتی زۆری لێ نەکرێت بۆ دووبارە کردنەوەی ، ئەگەر لەدوای ئەوە قسەی تری نەکرد ، بۆ ئەوەی دوا وشەی ئەوە بێت .

**جومهوری زانایان ڕایان وایە:** کە ئەوکەسەی لەسەرە مەرگدایە تەنها فێری وتنی (لا إله إلا الله) بکرێت ، ئەویش بەپێی ڕواڵەتی فەرموودەکە .

**بەڵام کۆمەڵێ لە زانایان دەفەرموون:** دەبێ شایەتمانی بەتەواوی فێر بکرێت ، چونکە یادی یەکخواپەرستی و باوەڕ لەسەر ئەو دوانە وەستاوە کە بریتیە لە (لا إله إلا الله محمد رسول الله).

---

[٦٠] **صحيح** – (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (تلقين الموتى لا إله إلا الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٢٠)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في التلقين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٧)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في تلقين المريض عند الموت والدعاء له عنده) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٧٦)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (تلقين الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٢٥)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في تلقين الميت لا إله إلا الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٤٥).

[*] (شرح مسلم لإمام النووي/ ج ٢، ص ٥٨٠) ، و (المجموع/ ج ٥، ص ١١٠) ، و (المغني/ ج ٢، ص ٤٥٠).

**هەروەها لەلای هەندێ لە زانایانی فیقهزان**[*] : موستەحەببە کەوا سورەتی (یس) لەلای ئەوکەسەی کە لەسەرەمەرگدایە بخوێنرێ ، ئەوەش بە بەڵگەی ئەو حەدیسە مەرفوعەی کەوا دەفەرموێ: (( اقرءوا على موتاكم ﴿يس﴾ ))[٦١] ، بەڵام ئەم حەدیسە وەك شێخ (ئەلبانی) دەفەرموێ: سەنەدەکەی لاوازە و کاری پێ ناکرێ.

**٢) ڕووی بکرێتە قیبلە و لەسەر لای ڕاست ڕا بکێشرێت:**

١- لە (ئەبی قەتادە) ی ئەنصارییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) حين قدم المدينة سأل عن البراء بن معرور ، فقالوا: توفي وأوصى بثلثه لك يا رسول الله (ﷺ)، وأوصى أن يوجه إلى القبلة لما احتضر، فقال رسول الله (ﷺ): أصاب الفطرة وقد رددت ثلثه على ولده ، ثم ذهب فصلى عليه ، فقال: اللهم اغفر له وارحمه ، وأدخله جنتك ، وقد فعلت ))[٦٢]

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ هاتە مەدینە هەواڵی (بەڕرائی کوڕی مەعرور) ی پرسی؟ وتیان: نەماوەو وەسێتی کردووە سێیەکی ماڵەکەی بدرێت بە تۆ ئەی

---

[*] (ابن عابدين/ ج ٢، ص ١٩١) ، و (الدسوقي/ ج ١، ص ٤٢٣) ، و (مغني المحتاج/ ج ٢، ص ٥) ، و (كشاف القناع/ ج ٢، ص ٨٢).

[٦١] **ضعيف** - (نەسائی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (عمل اليوم والليلة) ، بابی : (ما يقرأ على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٧٥) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (فصل في المحتضر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٥٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (ضعيف الجامع الصغير/ ح ١٠٧٢) دا فەرموویەتی: (ضعيف) ە.

[٦٢] **حسن بطرقه** - (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٢٨) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يستحب من توجيهه نحو القبلة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢١٤) ، هەروەها (ابن المنذر) لە کتێبی (الأوسط) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ذكر الاستقبال بالميت إلى القبلة إذ هو من الفطرة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٤٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (الغسل والكفن/ ص ٢٢) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، وە کاتی سەرەمەرگ ڕووی بکرێتە قیبلە ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی سروشت و فیطرەتی خۆی پێکاوە ، وا منیش سێیەکیماڵەکەیم دایەوە بە منداڵەکانی ، پاشان چوو نوێژی لەسەر کردو فەرمووی: خوایە لێی خۆشبە و میهرەبانبە لەگەڵیا ، وە بیخەرە بەهەشتەکەتەوە ، وا نزاو پاڕانەوەکەشت وەرگرتم .

**پێشەوا (حاکم) دەفەرموێ:** دەربارەی ڕوو بەرەو قیبلەکردنی مردوو لەوە زیاتر هیچی تر نازانم .

٢- لە (ئوم سەلەمە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( اشتكت فاطمة بنت رسول الله (ﷺ) فمرضتها ، فأصبحت يوما كأمثل ما كانت ، فخرج علي بن أبي طالب ، فقالت فاطمة: يا أمتاه ، اسكبي لي ماء غسلا ، فسكبت لها، فقامت فاغتسلت كأحسن ما كانت تغتسل ، ثم قالت: هاتي ثيابي الجدد ، فأعطيتها ، فلبستها ثم جاءت إلى البيت الذي كانت فيه ، فقالت: قدمي الفراش إلى وسط البيت ، فقدمته فاضطجعت واستقبلت القبلة ، فقالت: يا أمتاه ، إني مقبوضة الآن ، وإني قد اغتسلت ، فلا يكشفني أحد ، وقبضت ، فجاء علي بن أبي طالب فأخبرته ، فقال: لا والله لا يكشفها أحد ، ثم حملها بغسلها ذلك فدفنها ))[٦٣]

واتە : .... ، (فاتیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) ) لە کاتی سەرەمەرگدا ڕووی کردبووە قیبلە و لەسەر لای ڕاست ڕاکشابوو .

---

[٦٣] **إسناده ضعيف** – (ئەحمەد) لە کتێبی (فضائل الصحابة) دا ، لە ژێر ناونیشانی : (ومن فضائل علي رضي الله عنه من حديث ابي بكر بن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٣١) ، هەروەها (ابن شبة) لە کتێبی (تاريخ المدينة) دا ، بابی : (متوفى فاطمة بنت رسول الله (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٤).

ئەمەش ئەو شێوە ڕاكشانەیە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان دەكات بە خەوتوو كە لەسەر ئەو شێوە بخەوێت ، هەروەها مردووش لە گۆڕدا لەسەر ئەو شێوەیە دەنێژرێت ، وە ئەمە قسەی جومهوری زانایانە ، وە لەم بارەیەوە ئیمام (نەوەوی) ئیجماعی زانایانی نەقڵ كردووە*.

٣- لە (بەڕڕائی) كوڕی (عازیب) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( قال لي رسول الله (ﷺ): إذا أتيت مضجعك ، فتوضأ وضوءك للصلاة، ثم اضطجع على شقك الأيمن ، وقل: اللهم أسلمت نفسي إليك ، وفوضت أمري إليك ، وألجأت ظهري إليك ، رهبة ورغبة إليك ، لا ملجأ ولا منجا منك إلا إليك ، آمنت بكتابك الذي أنزلت ، وبنبيك الذي أرسلت ، فإن مت مت على الفطرة ، فاجعلهن آخر ما تقول ))[٦٤]

واتە: كاتێ ویستت بخەویت ، دەست نوێژ بگرە وەك چۆن دەست نوێژ دەگریت بۆ نوێژ كردن ، پاشان لەسەر لای ڕاست ڕابكشێ و بڵێ: خوایە خۆم سپارد بە تۆ ، و كارەكانم سپارد بە تۆ ، و پەنام بردە بەر تۆ ، بە ڕەغبەت و ترسەوە، خوایە هیچ پەناگە و جێی ڕزگارییەك نییە لە تۆ مەگەر لای تۆ نەبێت ، باوەڕم بەو كتێبە هەیە كە ناردووتە خوارەوە ، وە بەو پێغەمبەرەی كە ڕەوانەت كردووە ، لە پاشاندا

---

* (المغني/ ج ٢، ص ٤٥١) ، و (الغسل والكفن لشيخ مصطفى بن العدوى/ ص ٢٥).

[٦٤] **صحيح** – (بوخاری) لە كتابی (الدعوات)، بابی: (إذا بات طاهرا وفضله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣١١)، هەروەها لە كتابی (الوضوء)، بابی: (فضل من مات على الوضوء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤٧) ، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (الذكر والدعاء)، بابی: (ما يقول عند النوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٨٢٠)، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الأدب)، بابی: (ما يقال عند النوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٤٦) ، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الدعوات)، بابی: (ما جاء في الدعاء إذا أوى إلى فراشه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٣٩٤).

فەرمووی: ئەگەر بمریت ئەوە لەسەر سروشت دەمریت ، وە با ئەو نزایەت دوا قسەت بێت.

**بەڵام لەلای ئیمام (شافیعی)**[*] : مردوو لەسەر پشت ڕا دەکێشرێت و قاچەکانی بەرەو قیبلە دەکرێت ، وە نەختێ سەری بەرز دەکرێتەوە بۆ ئەوەی ڕووی لە قیبلە بێت .

**٣) ستایش کردنی لە کاتی بێ هیوا بوون بە کردەوەکانی خۆی:**

أ- لە (میسوەر) ی کوڕی (مەخرەم) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( لما طعن عمر جعل يألم، فقال له ابن عباس وكأنه يجزعه: يا أمير المؤمنين، ولئن كان ذاك، لقد صحبت رسول الله (ﷺ) فأحسنت صحبته، ثم فارقته وهو عنك راض ، ثم صحبت أبا بكر فأحسنت صحبته ، ثم فارقته وهو عنك راض، ثم صحبت صحبتهم فأحسنت صحبتهم، ولئن فارقتهملتفارقنهم وهم عنك راضون، قال: أما ما ذكرت من صحبة رسول الله (ﷺ) ورضاه ، فإنما ذاك من من الله تعالى من به علي ، وأما ما ذكرت من صحبة أبي بكر ورضاه ، فإنما ذاك من من الله جل ذكره من به علي ، وأما ما ترى من جزعي فهو من أجلك وأجل أصحابك ، والله لو أن لي طلاع الأرض ذهبا لافتديت به من عذاب الله عز وجل، قبل أن أراه ))[٦٥]

واتە: کە (عومەر) (خوای لێ ڕازی بێت) خەنجەرەکەیان لێدا ئازار پەرێشانی کرد بوو، جا (ئیبنوعەبباس) (خوای لێ ڕازی بێت) بۆ سارێژبوونی ئازارەکەی عەرزی کرد: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر ئەوە - واتە مردنت - بێتە دی ئەوە خۆتۆ هاوەڵی پێغەمبەرت (ﷺ) کردووە و هاوەڵییەکەشت بە جوانترین شێوە بەجێ هێناوە ، لە پاشان لێی جوێ بوویتەوە لە کاتێکدا کە لێت ڕازی بووە، لە دوای ئەو

---

[*] (المجموع/ ج ٥، ص ١١٦).

[٦٥] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (المناقب)، بابی: (مناقب عمر بن الخطاب أبي حفص القرشي العدوي رضي الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٩٢).

هاوەڵی (ئەبوبەکر) ت کردووە (خوای لێ ڕازی بێت) هاوەڵی ئەویشت جوان بەجێ هێناوە ، لە پاشان لێی جوێ بوویتەوە لە کاتێکدا کە لێت ڕازی بووە، لە پاشان هاوەڵی هاوەڵانی ئەوانت کردووە ئەگەر لێیان جوێ ببیتەوە لە کاتێکدا لێیان جوێ دەبیتەوە کە هەموو لێت ڕازی دەبن، فەرمووی: بەڵام ئەوەی کە دەڵێی هاوەڵی پێغەمبەرم (ﷺ) کردووە و لێم ڕازی بووە ئەوە منەتێکە خوای بەرز و باڵا ناویەتی بەسەرما ، ئەوەی کە دەڵێی هاوەڵی (ئەبوبەکر) م (خوای لێ ڕازی بێت) کردووە و لێم ڕازی بووە ئەویش لەو منەتانەیانە کە خوای بەرزو باڵا پێی بەخشیوم ، بەڵام ئەو پەرێشانییەی کە دەیبینی لەبەر تۆو هاوەڵانی تۆیە، (واللە) ئەگەر پڕ بە زەوی ئاڵتوونم ببێ دەیدەم بە فیدیەی ڕزگاربوونم لە سزای خوای بەرز و باڵا بەرلەوەی کە بیبینم.

ب- لە (ئیبن شوماسە) ی مەهرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( حضرنا عمرو بن العاص، وهو في سياقة الموت، يبكي طويلا، وحول وجهه إلى الجدار، فجعل ابنه يقول: يا أبتاه، أما بشرك رسول الله (ﷺ) بكذا؟ أما بشرك رسول الله (ﷺ) بكذا؟ قال: فأقبل بوجهه، فقال: إن أفضل ما نعد شهادة أن لا إله إلا الله، وأن محمدا رسول الله ، إني قد كنت على أطباق ثلاث، لقد رأيتني وما أحد أشد بغضا لرسول الله (ﷺ) مني، ولا أحب إلي أن أكون قد استمكنت منه، فقتلته، فلو مت على تلك الحال لكنت من أهل النار.. ))[٦٦]

واتە: هاتین بۆ لای (عەمری کوڕی عاص) (خوای لێ ڕازی بێت) لەسەرەمەرگا بوو، زۆر گریا ، وە ڕووی کردە دیوارەکە ، وایکرد لە کوڕەکەی کە بڵێ: ئەی باوکە ، ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژدەی فلان شتی نەدایتێ؟ ئایا مژدەی فلان شتی نەدایتێ؟

---

[٦٦] صحیح – (موسلیم) لە کتابی (الإیمان)، بابی: (كون الإسلام يهدم ما قبله وكذا الهجرة والحج) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٧)، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (١٠٧٣٧) هاتووە.

دەڵێ: ئنجا ڕووی تێکردین و فەرمووی: باشترین شت کە ئامادەی بکەیت: شایەتیدانە کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە خوا، وە (محمد) یش ڕەوانەکراوی خوایە ، من لەسەر سێ حاڵ بووم، کاتێ هەبوو کەس بە قەدەر من ڕقی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبوو، هیچ شتێکیشم ئەوەندە پێ خۆش نەبوو کە دەستم بەسەر کوشتنیا بڕۆیشتایە ، جا ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەیان بمردمایە ئەوە بێگومان دەچوومەوە ئاگرەوە .

ج- لە (قاسم) ی کوڕی (محمد) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن عائشة اشتكت ، فجاء ابن عباس فقال: يا أم المؤمنين تقدمين على فرط صدق على رسول الله (ﷺ) وعلى أبي بكر ))[٦٧]

واتە: (عائیشە) نەخۆش کەوت ، جا (ئیبنوعەبباس) هاتە سەزدانی و، فەرمووی: ئەی دایکی باوەڕداران تەشریفت دەچێتە خزمەت کەسێ کە لە پێش ئوممەتەوە تەشریفی چووە کە پێشکەوتوومیەکی صادقە و ڕاستە، کە ئەویش پێغەمبەری خوا و (ﷺ) (ئەبوبەکر) ی صددیقە.

د- لە (ئیبنو ئەبی مەلیکە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( استأذن ابن عباس قبل موتها على عائشة وهي مغلوبة، قالت: أخشى أن يثني علي، فقيل: ابن عم رسول الله (ﷺ) ومن وجوه المسلمين، قالت: ائذنوا له، فقال: كيف تجدينك؟ قالت: بخير إن اتقيت، قال: فأنت بخير إن شاء الله، زوجة رسول الله (ﷺ)، ولم ينكح بكرا غيرك ، ونزل عذرك من السماء ))[٦٨]

---

[٦٧] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (المناقب)، بابی: (فضل عائشة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧٧١).

[٦٨] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (تفسير القرآن)، بابی: (﴿ولولا إذ سمعتموه قلتم ما يكون لنا أن نتكلم بهذا﴾) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٧٥٣) و (٤٧٥٤).

واتە: (ئیبنوعەبباس) (خوای لێ ڕازی بێت) داوای مۆڵەتی کرد بۆ چوونە خزمەتی دایکە (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت) پێش ئەوەی کە کۆچی دوایی بکا، لە کاتێکدا کە حاڵی پەرێشان بوو، جا دایکە (عائیشە) فەرمووی: دەترسم لەوەی کە ستایش و سەنام بکا ، جا پێی وترا: ئاخر کوڕی مامەی پێغەمبەری خوایە و (ﷺ) لە پیاو ماقوڵانی موسوڵمانانیشە ، فەرمووی: دە قەیناکە مۆڵەتی بدەن با بێتە ژوورەوە، جا کاتێ هاتە خزمەتی عەرزی کرد: خۆت چۆن دەبینی؟ فەرمووی: باشم ئەگەر تەقوادارېم ، (ئیبنوعەبباس) یش فەرمووی: خوا حەزکات تۆ زۆر باشی، ئەی هاوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ)، چونکە هیچکام لە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) بە کچێنی شووی بە پێغەمبەر (ﷺ) نەکردووە جگە لە تۆ، وە لەسەر پاك داوێنیت لە ئاسمانەوە ئایەتی خوا هاتۆتە خوار.

## دوو بابەتی تایبەت

### ١) داوای باوەڕهێنان لە منداڵی جوولەکە

لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان غلام يهودي يخدم النبي (ﷺ)، فمرض، فأتاه النبي (ﷺ) يعوده، فقعد عند رأسه ، فقال له: أسلم، فنظر إلى أبيه وهو عنده فقال له: أطع أبا القاسم (ﷺ)، فأسلم، فخرج النبي (ﷺ) وهو يقول: الحمد لله الذي أنقذه من النار))[٦٩]

واتە: کوڕە جولەکەیەك خزمەتی پێغەمبەری (ﷺ) دەکرد، کوڕەکە نەخۆش کەوت، جا پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی چوو بۆ سەردانی و لەسەرینییەوە دانیشت و پێی

---

[٦٩] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (إذا أسلم الصبي فمات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٥٦)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الطب) دا لە ژێر ناونیشانی: (عيادة المشرك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٢٥٢)، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٧٥)، هەروەها لە کتابی (الأدب) دا لە ژێر ناونیشانی: (وأما حديث سالم بن عبيد النخعي في هذا الباب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٨٥٧).

فەرموو: موسوڵمان ببە، کوڕەکەیش سەیری باوکی کرد ، باوکیشی پێی وت: کوڕم بە گوێی (أبوالقاسم) بکە، جا ئەویش موسوڵمان بوو، جا پێغەمبەر (ﷺ) کە هەڵسا فەرمووی: (**الحمد لله الذي أنقذه من النار**) سوپاس بۆ خوا کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری کرد .

**٢ ) داوای باوەڕهێنان لە مرۆڤی بێ بڕوا**

لە (موسەییب) ی کوڕی (حەزن) ی باوکی (سەعید) ی کوڕی (موسەییب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( لما حضرت أبا طالب الوفاة ، جاءه رسول الله (ﷺ)، فقال: قل لا إله إلا الله ، كلمة أحاج لك بها عند الله))[٧٠]

واتە: کاتێ (ئەبوتاڵیب) کەوتە سەرەمەرگەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە سەردانی و پێی فەرموو: بڵێ: (**لا إله إلا الله**) ئەوە وشەیەکە دەیکەمە بەڵگە لەلای خوا - بۆ ڕزگاربوونت لە سزای دۆزەخ .

---

[٧٠] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (إذا قال المشرك عند الموت: لا إله إلا الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٦٠)، هەروەها لە کتابی (فضائل الصحابة)، بابی: (قصة أبي طالب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٨٨٤)، هەروەها لە کتابی (الأيمان والنذور)، بابی: (إذا قال: والله لا أتكلم اليوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٨١)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الإيمان)، بابی: (الدليل على صحة إسلام من حضره الموت، ما لم يشرع في النزع، وهو الغرغرة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣١)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (النهي عن الإستغفار للمشركين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣٤).

## دووەم: ئەوانەی سوننەتە و باشە بۆ مردوو بکرێ

هەرکاتێ موسوڵمانێك مرد وا باشە کە کەسانی دەوروبەری ئەم شتانە جێ بەجێ بکەن:

**١) داخستنی چاوەکانی:**

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ لە لای (ئەبو سەلەمە) بوو گیانی سپارد چاوەکانی بۆ داخست و ، پاشان فەرمووی: (( إن الروح إذا قبض تبعه البصر ))[٧١]
واتە : بەڕاستی گیان کاتێك دەردەکرێت چاو لە شوێنی دەچێت .

**٢) ئەوەی دەوترێ لەکاتی چاوداخستنی مردووەکەدا:**

أ- لە (ئوم سەلەم) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( دخل رسول الله (ﷺ) على أبي سلمة وقد شق بصره، فأغمضه، ثم قال: إن الروح إذا قبض تبعه البصر، فضج ناس من أهله ، فقال: لا تدعوا على أنفسكم إلا بخير، فإن الملائكة يؤمنون على ما تقولون ، ثم قال: اللهم اغفر لأبي سلمة وارفع درجته في المهديين ، واخلفه في عقبه في الغابرين، واغفر لنا وله يا رب العالمين ، وافسح له في قبره ، ونور له ))[٧٢]

---

[٧١] **صحيح** - (موسليم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في إغماض الميت والدعاء له إذا حضر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٢٧) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی: (تغميض الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٨) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في تغميض الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٥٤).

[٧٢] **صحيح** - (موسليم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في إغماض الميت والدعاء له إذا حضر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٢٧)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (تغميض الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٨)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في تغميض الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٥٤).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لای (ئەبوسەلەمە) گیانی دەرچوو بوو، چاوی داچەقابوو ، جا پێغەمبەر (ﷺ) چاوەکانی لێکنان و فەرمووی: کاتێ گیان دەکێشرێ چاو شوێنی دەکەوێ - تا بزانێ بۆ کوێ دەچێ - جا لەم کاتەدا هەندێ لە کەس و کارەکەی کردیان بە قیژە و هەراو نزای خراپیان لە خۆیان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نزای باش بکەن، نزای خراپ لە خۆتان مەکەن ، چونکە ئێوە هەرچی بڵێن مەلائیکە ئامینی لەسەر دەکەن جا فەرمووی: **( اللهم اغفر لأبي سلمة وارفع درجته في المهديين، واخلفه في عقبه في الغابرين، واغفر لنا وله يا رب العالمين، وافسح له في قبره، ونور له)** ئەی خوایە ! لە (ئەبوسەلەمە) خۆشبە و پلە و پایەی لەناو ئەوکەسانەدا کە خۆت ڕێگەی ڕاستت نیشان داون بەرز بکەرەوە ، وە خۆت سەرەوکاری ئەو کەس و کارەی بکە کەلە پاشی بەجێماون ، وە لە ئێمەش و ئەویش بە میهرەبانی خۆت خۆشبە ، ئەی پەروەردگاری جیهانییان ! وە گۆڕەکەشی گوشاد کە و پڕیکە لە نوور و ڕووناکی بۆی .

ب- لە (بەکر) ی کوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( إذا غمضت الميت فقل: بسم الله ، وعلى ملة رسول الله (ﷺ)، وإذا حملته فقل: بسم الله، ثم سبح ما دمت تحمله ))[٧٣]

واتە: کاتێ ویستت چاوی مردوویەك دابخەی ئەوە بڵێ: بەناوی خوا، وە لەسەر میللەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، وە کاتێ ویستت جەنازەکەی هەڵبگری ئەوە بڵێ: بەناوی خوا، لە پاشان هەرخەریکی تەسبیحاتی خوا بە مادام لەسەر شانتە و داتنەناوەتە سەر زەوی .

---

[٧٣] **مقطوع صحيح** - (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يستحب من إغماض عينيه إذا مات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢١٩).

**٣) هەندێ لە زانایانی فیقهزان ئەم شتانەیان پێ باشە کەوا بۆ مردووەکە بکرێ*:**

**یەکەم:** بەستنی دەمی بەسەریەوە تا دەمی دانەچەقێ و بکرێتەوە.

**دووەم:** جوولان و نەرم کردنەوەی جومگەکان بۆ ئەوەی ئەو لاشەیە ڕەق نەبێت.

**سێیەم:** زوو جلەکانی لەبەر دادەکەنرێ بۆ ئەوەی پیس نەبێ.

**چوارەم:** لەسەر قەڵەوێرمیە یا سەکۆیە دادەنرێ بۆ ئەوەی لاشەکە زوو تێکنەچێ.

**پێنجەم:** شتێك دەخرێتە سەر سکی مردووەکە بۆ ئەوەی هەڵنەئاوسێ.

**٤) بە پۆشاکێك هەموو لاشەی مردووەکە داپۆشرێ:**

لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) حين توفي سجي ببرد حبرة ))[٧٤] واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی فەرموو بە پۆشاکێکی (حیبرە)*داپۆشرا.

**٥) نزاو پاڕانەوە بۆ مردووەکە:**

لە (ئوم سەلەم) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا حضرتم المريض ، أو الميت ، فقولوا خيرا ، فإن الملائكة يؤمنون على ما تقولون ، قالت: فلما مات أبو سلمة أتيت النبي (ﷺ)، فقلت: يا رسول الله (ﷺ) إن أبا سلمة قد مات ، قال: قولي: اللهم اغفر لي وله ،

---

* (البدائع/ ج ١، ص ٣٠٠) ، و (ابن عابدين/ ج ٢، ص ١٩٤) ، و (مواهب الجليل/ ج ٢، ص ٢٢٣) ، و (الأم/ ج ١، ص ٢٤٨) ، و (المغني/ ج ٢، ص ٤٥١) ، و (الفروع/ ح ٢، ص ١٩٢).

[٧٤] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (اللباس) ، بابی : (البرود والحبر والشملة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٨١٤) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (تسجية الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨٠) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الميت يسجى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٢٠).

* **(حبرة):** جۆرێکە لە پۆشاکی یەمەنی .

وأعقبني منه عقبى حسنة ، قالت: فقلت، فأعقبني الله من هو خير لي منه محمدا (ﷺ) ))[٧٥] واته: كه دهچن بۆ لای نەخۆش و، ئەوكەسانەی كە لە گیانەڵادان قسەی باش بكەن و قسەی خراپ مەكەن ، چونكە مەلائیكەتەكان ئامینی لەسەر دەكەن، (ئوم سەلەمە) وتی: جا كە (ئەبوسەلەمە) ی مێردم مرد چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ئەبوسەلەمە) مرد، فەرمووی: بڵێ: **(اللهم اغفر لي وله، وأعقبني منه عقبى حسنة)** خوایە لە منیش و لەویش خۆشبە و، تۆڵەیەكی باشم بۆ بكەرەوە و كەسێكی چاكم بۆ بخەرەوە شوێنی ، (ئوم سەلەمە) وتی: منیش وام وت ، ئەوە بوو خودا لە تۆڵەی ئەودا (محمد) ی (ﷺ) داوە پێم كە زۆر زۆر لە (ئەبو سەلەمە) باشترە بۆم .

**٦) سوپاس و ستایش كردنی خوا لەلایەن باوك و دایكەوە:**

أ- لە (ئەبوموسا) ی ئەشعەری یەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا مات ولد العبد قال الله للملائكته: قبضتم ولد عبدي ، فيقولون: نعم ، فيقول: قبضتم ثمرة فؤاده ، فيقولون: نعم ، فيقول: ماذا قال عبدي؟ فيقولون: حمدك واسترجع ، فيقول الله: ابنوا لعبدي بيتا في الجنة ، وسموه بيت الحمد ))[٧٦]

---

[٧٥] **صحيح** - (موسلیم) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقال عند المريض والميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٢٦)، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما يستحب أن يقال عند الميت من الكلام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٥)، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في تلقين المريض عند الموت والدعاء له عنده) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٧٧)، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (كثرة ذكر الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٢٤)، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء فيما يقال عند المريض إذا حضر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٤٧).

[٧٦] **حسن** - (ترمذی) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (فضل المصيبة إذا احتسب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٢١)، هەروەها (ابن السنی) لە (عمل اليوم والليلة)، بابی: (ما يقول إذا أصيب بولده)

واتــە: کاتـێ کـە بەندەیـە منـاڵێکی دەمـرێ، خـوای گـەورە بـە مەلائیکەتـەکانی دەفـەرموێ: گیـانی منـداڵی بەندەکـەمتان کێـشا؟ دەڵـێن: بـەڵێ، دەفـەرموێ: جگەرگۆشەکەیتان لێ سەند و بەشی دڵتان لێ وەرگرت؟ دەڵێن: بەڵێ، جا دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم چی گوت؟ دەڵێن: حەمد و سوپاسی تۆی کرد و وتی: **(إنا لله وإنا إليه راجعون)** ، ئەوجا خوای گەورە دەفەرموێ: کۆشکێ لە بەهەشتدا دروست بکەن بۆ ئەو بەندەیەم و ناوی لێ بنێن کۆشکی حەمد و سوپاس.

ب- لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( يقول الله تعالى: ما لعبدي المؤمن عندي جزاء ، إذا قبضت صفيه من أهل الدنيا ثم احتسبه ، إلا الجنة ))[٧٧]

واتــە: خــوای گــەورە دەفــەرموێ: کــاتێ لــە بەنــدەی موســوڵمانی خــۆم ، خۆشەویستەکەیی لێ دەسەنمەوە، کە خۆشەویستی دنیایـەتی، وە ئـارام و صـەبری لەسەر دەگرێ و ناشوکری ناکا و دەیکا بـە توێـشووی قیامـەتی ، ئـەوە لـە پاداشی ئەوەدا بەهەشتی دەدەمێ .

---

گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٥٨٠)، هـەروەها (بەیهـەقی) لـە (الآداب)، بـابی: (الـصبر والإسـترجاع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٥٦)، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح جامع الترمذي/ ج ٢ - ص ٣٤١ - ح ١٠٢١) و، (صـحيح الجـامع الـصغير/ ح ٧٩٥) و، (صـحيح الترغيـب والترهيـب/ ج ٣ - ح ٣٤٩١) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

[٧٧] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الرقائق)، بابی: (العمل الذي يبتغى به وجه الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٢٤)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی: (مـسند أبـي هريـرة رضي الله عنـه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٩١٨٨)، هـەروەها (بەیهـەقی) لـە (شـعب الإيمـان) دا لـە ژێـر ناونیشانی: (فصل فيما يقول العاطس في جواب التشميت - فصل في ذكر مـا في الأوجـاع والأمـراض والمصيبات من الكفارات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٤٨١).

**٧) موستەحەبە کەسوکاری مردووەکە ئەم زیکرە بڵێن: (إنا لله وإنا إليه راجعون):**

أ- خوای پەروەردگار لەم بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَـٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾﴾ (البقرة : ١٥٦ - ١٥٧)

واتە: وە موژدە بدە بە ئارام گرتووان ، ئەوانەی کاتێ دووچاری بەڵایەك دەبن دەستبەجێ دەڵێن: بەڕاستی ئێمە موڵکی خواین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە.

ب- لە (ئوم سەلەم) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (( ما من مسلم تصيبه مصيبة ، فيقول ما أمره الله: ﴿إنا لله وإنا إليه راجعون﴾ ، اللهم أجرني في مصيبتي ، وأخلف لي خيرا منها، إلا أخلف الله له خيرا منها ))[٧٨]

واتە: هەر موسوڵمانێك کاتێك کە تووشی بەسەرهاتێکی ناڕەحەت دەبێت، جا ئەوە بڵێت کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە: ﴿**إنا لله وإنا إليه راجعون**﴾ ئێمە لەلایەن خواوەین و بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە ، (**اللهم أجرني في مصيبتي**) خوایە پاداشتم بدەیتەوە لەم موسیبەتەدا و، کەسێکی باشترم بۆ بخەرەوە جێگەی، ئیللا خوا لەوە باشتر دەخاتە جێگەی.

**٨ ، ٩) لابردنی سەری مردوو، وە ماچ کردنی:**

هیچ گوناهو کەراهەتێکی تێدا نییە ئەگەر ماچی دەم و چاوی مردوویەکی پیاوچاك ، یا کەسێك لە کەسە نزیکەکانی خۆت بکەیت:

أ- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أقبل أبو بكر رضي الله عنه على فرسه من مسكنه بالسنح حتى نزل، فدخل

---

[٧٨] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقال عند المصيبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٢٢)، هەروەها لە (تحفة لأشراف) دا بە ژمارە (١٨٢٤٨) هاتووە.

المسجد، فلم يكلم الناس حتى دخل على عائشة رضي الله عنها ، فتيمم النبي (ﷺ) وهو مسجى ببرد حبرة، فكشف عن وجهه، ثم أكب عليه، فقبله، ثم بكى، فقال: بأبي أنت يا نبي الله، لا يجمع الله عليك موتتين، أما الموتة التي كتبت عليك فقد متها ))[٧٩]

واتە: (ئەبوبەکر) (خوای لێ ڕازی بێت) بە سواری ئەسپەکەیەوە لە ماڵی خۆیەوە لە (سەنح) ە وە هات، تاکو لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و چووە ناو مزگەوتەوە ، هیچ لەگەڵ خەڵکدا قسەی نەکرد تاوەکو چووە لای (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت)، ڕووی کردە لای پێغەمبەر (ﷺ) و ڕۆیشتە لای، کە بە جۆرە عەبایەکی یەمەنی پێی دەوترێ عابای (حەبرە) داپۆشرا بوو، عاباکەی لەسەر ڕوومەتی لادا و خۆیدا بەسەریدا و پاشان ماچی نێو چاوانی کرد ، لەپاشا دەستی کرد بە گریان و، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! دایك و باوکم بە سەرگەردانت بێ، هەرگیز خوای گەورە دوو مردنت لەسەر کۆناکاتەوە ، ئەو مردنەی کە خوا لەسەری نووسیبوویت ئەوا مردیت ، ئیترجارێکی تر نامریتەوە .

ب- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( رأيت رسول الله (ﷺ) يقبل عثمان بن مظعون وهو ميت ، حتى رأيت الدموع تسيل ))[٨٠] واتە : دیتم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) (عوسمانی کوڕی مەظعون) ی بە مردوویی ماچ دەکرد ، وە هۆن هۆن فرمێسك بە چاویا دەهاتە خوارەوە.

---

[٧٩] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الدخول على الميت بعد الموت إذا أدرج في أكفانه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤١)، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (القسامة)، بابی: (الأئمة من قريش) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٣٨٠).

[٨٠] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في تقبيل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٦٣)، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٢، ص ٢٠١، ح ٣١٦٣) ، و (مختصر الشمائل/ ص ١٧٢) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**١٠) گریان لەسەر مردوو:**

**زانایان هەموویان کۆن لەسەر ئەوەی کە گریان لەسەر مردوو دروستە ، بەڵام بە مەرجێ ئەو گریانە شیوەن و لاواندنەوە و هاوار هاواری تێدا نەبێت.**

**١- لە (عبدالله) ی کوڕی (عومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( اشتكى سعد بن عبادة شكوى له ، فأتاه النبي (ﷺ) يعوده مع عبد الرحمن بن عوف ، وسعد بن أبي وقاص ، وعبد الله بن مسعود (رضي الله عنه)م، فلما دخل عليه فوجده في غاشية أهله ، فقال: قد قضى ، قالوا: لا يا رسول الله (ﷺ)، فبكى النبي (ﷺ)، فلما رأى القوم بكاء النبي (ﷺ) بكوا، فقال: ألا تسمعون إن الله لا يعذب بدمع العين ، ولا بحزن القلب ، ولكن يعذب بهذا - وأشار إلى لسانه - أو يرحم))[٨١]**

**واتە: (سەعدی کوڕی عوبادە) ناساغییەکی هەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (عبدالرحمن کوڕی عەوف) و (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) و (عبدالله کوڕی مەسعود)، چوون بۆ سەردانی ، کاتێ کە چوونە ژوورەوە بۆ لای لە هۆش خۆی چوو بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا تەواو بوو، وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کرد بە گریان ، کاتێ خەڵکەکە گریانی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) بینی، هەموو دەستیان کرد بە گریان ، پاشان فەرمووی: ئایا نەتان بیستووە کە خوای گەورە سزا نادات لەسەر فرمێسکی چاو، لەسەر غەمباری دڵ ، بەڵکو بەهۆی ئەمەوە سزا دەدات - ئاماژەی بۆ زمانی کرد - یان ڕەحم دەکات.**

---

[٨١] **صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (البكاء عند المريض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٤)، هەروەها (موسليم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٤).**

٢- لـە (ئوسـامە) ی کـوڕی (زەیـد) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( أرسلت ابنة النبي (ﷺ) إليه إن ابنا لي قبض ، فأتنا ، فأرسل يقرئ السلام ، ويقول: إن لله ما أخذ ، وله ما أعطى ، وكل عنده بأجل مسمى، فلتصبر، ولتحتسب ، فأرسلت إليه تقسم عليه ليأتينها ، فقام ومعه سعد بن عبادة ، ومعاذ بن جبل ، وأبي بن كعب ، و زيد بن ثابت و رجال ، فرفع إلى رسول الله (ﷺ) الصبي ونفسه تتقعقع - قال: حسبته أنه قال كأنها شن - ففاضت عيناه ، فقال سعد: يا رسول الله ، ما هذا؟ فقال: هذه رحمة جعلها الله في قلوب عباده ، وإنما يرحم الله من عباده الرحماء ))[٨٢].

واتە: کچێکی پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بە دوای پێغەمبەردا (ﷺ) کەوا منداڵێکی لە سەرەمەرگدایە*، تەشریفت بێنە بۆ لامان ، (ئوسامە) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کەسێکی نارد بۆلای کە سەلامی لێ بکات و پێی بڵێت: ئەوەی کە براوەتەوە هی خوایە و، ئەوەش کە بەخشراوە هەر هی خوایە ، هەموو شتێکیش لای خوا کاتێکی دیاری کراوی هەیە ، دە با ئارام بگرێت و، چاوەڕوانی پاداشتی خوا بکات، دوای ئەوە ناردییەوە فەرمووی پێی ڕابگەیەنن کە سوێندی لەسەر خواردووی، کە دەبێت ئامادە ببیت، جا پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و، وە (سەعدی کوڕی عوبادە) و (موعازی

---

[٨٢] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (قول النبي (ﷺ): يعذب الميت ببعض بكاء أهله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٨٤)، هەروەها لە کتابی (المرض)، بابی: (عيادة الصبيان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٥٥)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٢)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٢٥)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإحتساب والصبر عند نزول المصيبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٦٧)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٨٨).

* منداڵەکە ناوی (ئومەیمە) ی کچی (زەینەب) ی کچی (پێغەمبەر) (ﷺ) بوو.

کوڕی جەبەل) و (ئوبەی کوڕی کەعب) و (زەیدی کوڕی پابت) و هەندێ پیاوی تریش لە خزمەتیدا ڕۆیشتن، جا کوڕەکەیان بەرزکردەوە بۆ باوەشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و، گیانی تێکچوو بوو هەناسە بڕکێ ی بوو، وردە وردە خەریك بوو دەمرد، لەو کاتەدا چاوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) پڕبوون لە فرمێسك، (سەعد) یش پێی وت: ئەمە چی یە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: بەڕاستی ئەمە بەزەییەکی خوایە دەیخاتە دڵی هەر کەسێك کە بیەوێت لە بەندەکانی، بەڕاستی خوا بەزەیی بە بەندە بە بەزەیی یەکانیدا دێتەوە.

٣- لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( دخلنا مع رسول الله (ﷺ) على أبي سيف القين ، وكان ظئرا لإبراهيم (عليه السلام) ، فأخذ رسول الله (ﷺ) إبراهيم ، فقبله ، وشمه ، ثم دخلنا عليه بعد ذلك وإبراهيم يجود بنفسه ، فجعلت عينا رسول الله (ﷺ) تذرفان، فقال له عبد الرحمن بن عوف (رضي الله عنه): وأنت يا رسول الله؟ فقال: يا ابن عوف إنها رحمة، ثم أتبعها بأخرى ، فقال (ﷺ): إن العين تدمع ، والقلب يحزن ، ولا نقول إلا ما يرضى ربنا ، وإنا بفراقك يا إبراهيم ))[٨٣]

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چووین بۆ ماڵی (ئەبو سەیف) ی ئاسنگەر، کە مێردی ئەو ئافرەتە بوو شیری بە (ئیبراهیم) ی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) دەدا ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ئیبراهیم) ی گرتە باوەشەوە و ماچی کرد و بۆنی کرد، دوای ئەوە کە جارێکی تر چووینەوە بۆ لای (ئەبو یوسف) (ئیبراهیم) لەسەرە مەرگدا بوو و دوا هەناسەی دەدا، چاوەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پڕبوون لە

[٨٣] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (قول النبي (ﷺ): إنا بك لمحزونون) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٣)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الفضائل)، بابی: (رحمته الصبيان والعيال، وتواضعه، وفضل ذلك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٩٧٩)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٢٦).

فرمێسك ، جا (عبدالرحمن) ی كوڕی (عەوف) بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) وت: تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگریت؟! فەرمووی: ئەی كوڕی (عەوف) ئەمە ڕەحمەتێكە، پاشان فەرمووی: چاوەكان فرمێسك، و دڵیش تەنگ دەبێت ، وە ئێمە هیچ شتێك ناڵێین شتێك نەبێت خوا پێی ڕازی بێت ، وە ئێمەش بە دابڕان و كۆچی تۆ ئەی (ئیبراهیم) دڵ تەنگ و خەمبارین!

٤- لە (عەمرە) ی كچی (عبـدالرحمن) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە كـەوا فەرموویەتی: (( وذكر لها أن عبد الله بن عمر ، يقول: إن الميت ليعذب ببكاء الحي ، فقالت عائشة: يغفر الله لأبي عبد الرحمن أما إنه لم يكذب ، ولكنـه نـسي أو أخطأ ، إنما مر رسول الله (ﷺ) على يهودية يبكى عليها ، فقـال: إنهـم ليبكـون عليهـا ، وإنهـا لتعذب في قبرها ))[٨٤]

واتە : كاتێ قسەكەی (عبدالله ی كوڕی عومەر) یـان گێڕایـەوە بـۆ دایكە (عائیـشە): گوایە مردوو سزا دەدرێ لەسەر ئـەو گریانـەی كە كـەس و كارەكـەی بـۆی دەكـەن ، (عائیـشە) فـەرمووی: ڕەحمــەتی خــوا لــە (ئــەبو عبـدالرحمن) بــێ ، بەڕاســتی (ئیبنوعومەر) پیاوی درۆ نەبوو ، بەڵام یا باش لە یادی نەماوە یا بە هەڵەدا چووە، چـونكە بـەخوا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وەهـای نەفـەرموو ، بـەڵكو شـتەكە خـۆی ئاوابوو جارێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لـەلای گـۆڕی ژنـە جوولەكەیەكـەوە ڕەت بـوو ، كەس و كارەكەی لەسەری دەگریان جا فەرمووی: ئـەوان لەسـەری دەگـرین ، كەچـی ئەویش لە گۆڕەكەیدا سزا دەدرێ.

---

[٨٤] صحيح – (موسليم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (الميت يعذب ببكاء أهله عليـه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٢١٥٠) ، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (مـا جاء في الرخـصة في البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٠٦).

٥- لـە (ئەنـەس) ی کـوڕی (مالیـك) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی : (( أخذ الراية زيد فأصيب ، ثـم أخـذها جعفـر فأصيب ، ثـم أخـذها عبد الله بن رواحة فأصيب - وإن عيني رسول الله (ﷺ) لتذرفان - ثم أخذها خالد بن الوليد من غير إمرة ففتح له ))[٨٥]

واتـە : لـە غـەزای (موئتـە) دا ، ئـەو ڕۆژەی کـە سـەرکردەکانی لەشـکری ئیـسلام شـەهیدبوون ، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـەواڵی شـەهید بـوونی ئـەوانی پـێ وتـین و فەرمووی: لە پێشا (زەید) ئاڵای لەشکری ئیسلامی هەڵگرت ، تا شەهید کـرا ، ئنجا (جەعفەر) هەڵی گـرت تـا ئـەویش شـەهید کرا ، ئنجا (عبـدالله ی کـوڕی ڕەواحـە) هـەڵی گـرت تـا ئـەویش پێکـراو شـەهید بـوو ، لـەکاتی گێڕانـەوەی داسـتانی شەهیدبوونی ئەم پاڵەوانانەدا چاوەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هۆن هۆن فرمێسکی لێ دەڕژاو ئەسـرینیان دەڕشـت ، لەپاشا (خالیـدی کوڕی وەلیـد) لـە خۆیـەوە بـەبێ فەرمانی کەس ئاڵاکەی هەڵگرت ، وە خوا سەری خـست و خـەڵاتی سـەرکەوتنی پـێ بەخشی.

**١١) پەلە بکرێت لە شۆردن و کفن کردنی و نوێژ لەسەرکردنی و ناشتنیدا:**

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کـەوا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( أسرعوا بالجنازة ، فإن تك صالحة فخير تقدمونها ، وإن يـك سـوى ذلك ، فشر تضعونه عن رقابكم ))[٨٦]

---

[٨٥] **صحیح** - (بوخـاری) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (الرجـل ينعـى إلى أهـل الميـت بنفـسه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٢٤٦) ، هـەروەها (ئەحمـەد) لـە (مـسند) ە کەیـدا ، لـە ژێـر ناونیـشانی: (مسند أنس بن مالك رضي الله تعالى عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٨٧٨).

[٨٦] **صحیح** - (بوخاری) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (السرعة بالجنـازة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٣١٥) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الإسراع بالجنازة) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٢١٨٣) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الإسراع بالجنازة) گێڕاویەتـەوە

واتە: پەلە بکەن لە ناشتنی جەنازەدا ، جا ئەگەر چاك بێت ئەوە چاکەیەکە پێشی دەخەن بۆی ، وە ئەگەر چاکیش نەبوو ئەوە شەرێکەو لە ملی خۆتانی دەکەنەوە .

**١٢) ئاگادارکردنی کەسوکار بە مردنی کەسەکەیان:**

زانایـان لایـان پەسـەندە کـە خـزم و کەسـی مردووەکـە و هاوڕێکـانی و پیاوچـاکان ئاگـادار بکـرێن لـە مردنـی کەسـەکەیان بـۆ ئـەوەی پاداشـتی هاوبەشـی بوونیـان لـە ئامادەکردن و نوێژ لەسەرکردنی و ناشتنی دەست بکەوێت ، ئەویش بە بەڵگەی:

١- لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنــەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) نعى النجاشي في اليوم الذي مات فيه ، خرج إلى المصلى ، فصف بهم وكبر أربعا ))[٨٧]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەی کە (نەجاشی) مرد خەڵکی ئاگادار کـردەوە، و دەرچوو بەرەو نوێژگە (موصەللا) و خەڵکی ڕیز کرد و چوار (الله أكبر) ی لەسەر کرد .

٢- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رجلا أسود أو امرأة سوداء كان يقم المسجد فمات ، فسأل النبي (ﷺ) عنه ، فقالوا: مات ، قال: أفلا كنتم آذنتموني به دلوني على قبره - أو قال قبرها - فأتى قبرها

---

بە ژمارە (١٠١٥) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (السرعة بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٠٩) ، هەروەها (ابن ماجە) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جاء في شهود الجنـائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٧٧).

[٨٧] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الرجل ينعى إلى أهل الميت بنفسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤٥)، هەروەها (مالیك) لە (موطأ) دا لە کتابی (الجنائز)، بابی: (التكبير على الجنـائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٢)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لـە ژێـر ناونیـشانی : (مـسند ابي هريرة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٦١٤).

فصلي عليها ))[88] واتە: پیاوێکی ڕەش یا ژنێکی ڕەش مزگەوتی دەماڵی ، کە دەمرێ پێغەمبەر (ﷺ) ئاگای لێ نابێ ، تا ڕۆژێ هەواڵی دەپرسێ، دەڵێن: مردووە ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ئەی بۆ هەواڵتان بە من نەدا ، گۆڕەکەیم پێ نیشان بدەن، جا کە گۆڕەکەیان پێ نیشان دا چوو نوێژی لەسەر کرد .

پێشەوا (بەیهەقی) فەرموویەتی: لە (مالیکی کوڕی ئەنەس) ە وە پێم گەیشتووە کەوا فەرموویەتی: (( لا أحب الصياح لموت الرجل على أبواب المساجد ، ولو وقف على حلق المساجد فأعلم الناس بموته لم يكن به بأس ))[89] ، قال:

واتە: حەز لە هاوار ناکەم لەبەردەم مزگەوتەکاندا بۆ مردنی کەسێك ، بەڵام فرغ کەسێك بوەستێت لەبەردەم دانیشتوانی مزگەوتدا و مردنی کەسێکی پێ ڕاگە ئەوە قەیناکە .

وە پێشەوا (ترمذی) دەفەرموێ: قەیناکە پیاو خزم و کەسی ئاگادار بکات لە مردنی کەسێکیان .

بەڵام (حوزەیفەی کوڕی یەمان) پێی باش نیە کەوا خەڵکی ئاگادار بکرێ لە مردنی کەسەکەیان ، چونکە ئەوە بە بانگەواز ئەژمار دەکات:

---

[88] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (الصلاة)، بابی: (كنس المسجد، والتقاط الخرق والقذى والعيدان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٥٨)، هەروەها لە هەمان کتابدا، بابی: (الخدم للمسجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٦٠)، هەروەها لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على القبر بعد ما يدفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٣٧)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢١٢)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٣)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في الصلاة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٢٧).

[89] **صحیح** - (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من كره النعي والإيذان والقدر الذي لا يكره منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٦٤).

لـه (حوزەیفـه) ی کـوڕی (یـەمان) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( إذا مـت فـلا تؤذنـوا بـي ، إنـي أخـاف أن يكون نعيـا ، فـإني سمعـت رسول الله (ﷺ) ينهى عن النعي )) [٩٠] واته : ئەگەر مردم بە کەس مەڵێن ، مـن لـەوە دەترسم کە ببێتە بانگەواز بۆی ، چونکە بەڕاستی خۆم گوێم لـه پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بووە کەوا ڕاگەیاندنی قەدەغە دەکرد .

ئەمەش حـەمل دەکرێتـە سـەر ئـەو شـێوە بانگـەوازەی کـە لەسـەردەمی نەزانیـدا ...مانە

١- لـه (ئـ... انـه ، چـونکە لەسـەردەمی نەزانیـدا عادەتیـان وابـووە ئەگـەر پیـاوێکی ... لات بمردایە سواریان بەملاو لادا بۆ ناو هۆزەکان دەنارد و هاواریان دەکرد و (( أن رسـ... وت: فلانەکەس مرد ، عەرەبیش مـرد بـه مردنـی فلانەکـەس ، ئـیتر لەگـەڵ ... ئەوەشدا هاوار هاواریان دەکردو دەشگریان .

**١٣) ناشتنی لەو ناوچەیەی کە تیایدا مردووە بە تایبەت ئەگەر شـەهید بـوو:** (( لأنـه (ﷺ) يـوم أحـد أمـر أن يـدفن القتلـى في مـضاجعهم - أي أمـاكنهم - )) [٩١]

---

[٩٠] **حسن** – (ترمذی) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في كراهية النعي) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٩٨٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لـه (جـامع الترمـذی/ ج ٢، ص ٣١٢، ح ٩٨٦) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٣، ح ٣٥٣١) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ١٠) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

[٩١] **صحیح** – (ئەبوداود) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الميت يحمل من أرض إلى أرض وكراهة ذلك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٦٥) ، هـەروەها (ترمـذی) لـه کـتابی (الجهاد) ، بـابی : (مـا جـاء في دفن القتيل في مقتله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧١٧) ، هەروەها (نەسائی) لـه کـتابی (الجنـائز) ، بـابی : (اين يدفن الشهيد) گێڕاویەتـەوە بـه ژمـارە (٢٠٠٤) ، هـەروەها (ابـن ماجـه) لـه کـتابی (الجنـائز) ، بابی : (مـا جـاء في الـصلاة علـى الـشهداء ودفـنهم) گێڕاویەتـەوە بـه ژمـارە (١٥١٦) ، هـەروەها شێخ (ئـەلبانی) لـه (جـامع الترمـذي / ج ٤ - ص ٢١٥ - ح ١٧١٧) ، و (مـشكاة المـصابيح / ج ١ - ح ١٧٠٤) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

واتە : لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی (ئوحود) دا فەرمانیدا کە شەهیدەکان هەر لە شوێنی خۆیاندا بنێژرێن و نەگوازرێنەوە .

## بابەتێکی تایبەت

## ئەوەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کراوە لەکاتی مردنی و ناشتنیدا

١- لە (عامیر) ی شەعبییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( غسل رسول الله (ﷺ) علي ، والفضل ، وأسامة بن زيد ، وهم أدخلوه قبره ، قال: حدثنا مرحب أو أبو مرحب ، أنهم أدخلوا معهم عبد الرحمن بن عوف ، فلما فرغ علي قال: إنما يلي الرجل أهله ))[٩٢]

واتە : (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و (فەزڵی کوڕی عەبباس) و (ئوسامەی کوڕی زەید) تەرمەکەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) شۆرد ، هەر ئەوانیش دایان خستیانە ناو گۆڕەکەیەوە ، جا (عەلی) کەلێ بووەوە فەرمووی: پیاو دەبێ کەس و کاری خۆی سەرەو کاری بکەن .

٢- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( لما أرادوا غسل النبي (ﷺ) قالوا: والله ما ندري أنجرد رسول الله (ﷺ) من ثيابه كما نجرد موتانا ، أم نغسله وعليه ثيابه ؟ فلما اختلفوا ألقى الله عليهم النوم حتى ما منهم رجل إلا وذقنه في صدره ، ثم كلمهم مكلم من ناحية البيت لا يدرون من هو: أن اغسلوا النبي (ﷺ) وعليه ثيابه ، فقاموا إلى رسول الله (ﷺ) فغسلوه وعليه قميصه ،

---

[٩٢] صحيح – (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كم يدخل القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٩) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الميت يدخله قبره الرجال ومن يكون منهم افقه وأقرب بالميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٢٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ٣، ص ٢١٣، ح ٣٢٠٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

يصبون الماء فوق القميص ، ويدلكونه بالقميص دون أيديهم ، وكانت عائشة تقول: لو استقبلت من أمري ما استدبرت ، ما غسله إلا نساؤه ))[٩٢]

واته : کاتێ ویستیان تەرمەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بشۆرن وتیان: نازانین ئایا پێغەمبەریش (ﷺ) ڕووت بکەینەوە وەك چۆن مردووی ترمان ڕووت دەکەینەوە یاخود ئەم هەر بە جلەکانیەوە بیشۆرین ، جا لەسەر ئەمە کە قسەیان یەکی نەگرت خوای گەورە خەوی لێ خستن ، خەوێکی وا قورس کە یەك بەیەك سەریان بەسەر سینگیانا شۆڕبۆوە ، ئنجا قسەکەرێ لە گۆشەیەکی ماڵەکەوە قسەی لەگەڵ کردن بەبێ ئەوەی کە بزانن کێ یە ، وتی: پێیان: تەرمی پێغەمبەر (ﷺ) هەر بە جلەکانی خۆیەوە بیشۆرن ، جا ئەوانیش هەڵسان و چوون بەلای تەرمەکەوەو هەر بە جلەکانیەوە شۆردیان ، ئاوەکەیان دەکرد بەسەر کراسەکەدا و لەسەر کراسەکەوە دەستیان لە لەشی دەخست ، (عائیشە) دەیفەرموو: تازە لە دەستم چوو ئەگەر ئەقڵی ئێستام ئەوسا بوایە دەبوو ژنەکانی بیان شۆردایە !

٣- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) كفن في ثلاثة أثواب يمانية بيض ، سحولية من كرسف ليس فيهن

---

[٩٢] **حسن** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في ستر الميت عند غسله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٤١) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (التاريخ) ، بابی: (ذكر البيان بأن المصطفى (ﷺ) لم ير منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٣٨) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتێبی (دلائل النبوة) دا ، بابی : (ما جاء في غسل رسول الله (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٨٧) ، هەروەها (ابن أبي الدنيا) لە کتێبی (هواتف الجنان) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧) ، هەروەها (ابن الجارود) لە کتێبی (المنتقى) دا ، لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٣، ص ١٩٦، ح ٣١٤١) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ٣، ح ٥٩٤٨) دا فەرموویەتی: (حسن) ە ، بەلام لە (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٢٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

قميص ولا عمامة ))[٩٤] واته : پێغەمبەری خوا (ﷺ) له سێ لۆ جلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکەدا کفن کرا ، نه کراس و ، نه مێزەریان تیا نەبوو !

٤- له دایکه (عائیشه) وه (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوه کەوا فەرموویەتی: (( لما قبض رسول الله (ﷺ) اختلفوا في دفنه ، فقال أبو بكر: سمعت من رسول الله (ﷺ) شيئا ما نسيته ، قال: ما قبض الله نبيا إلا في الموضع الذي يحب أن يدفن فيه ، ادفنوه في موضع فراشه ))[٩٥]

واته : کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد ، لەسەر جێگەی ناشتنەکەی قسەیان یەکی نەگرت ، تا (ئەبوبەکر) فەرمووی: لەم بارەیەوه شتێکم له پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستووه هەر له یادم ماوه ، فەرمووی: خوای گەورە گیانی هیچ پێغەمبەرێ ناکێشێ ، مەگەر لەو شوێنەدا کە خۆی حەزی لێ بێ کە لەوێ بنێژرێ ، کەوابوو له شوێنی نوێنەکەی خۆیدا بینێژن .

---

[٩٤] **صحيح** - (بوخاری) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (الثياب البيض للكفن) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٢٦٤) ، هەروەها (موسلیم) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (في كفن الميت) گێڕاویەتەوه به ژماره (٢١٧٧) ، هەروەها (ئەبوداود) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الكفن) گێڕاویەتەوه به ژماره (٣١٥٢)، هەروەها (ترمذی) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في كفن النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوه به ژماره (٩٩٦) ، هەروەها (نەسائی) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (كفن النبي (ﷺ)) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٨٩٨).

[٩٥] **صحيح** - (ترمذی) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في دفن النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٠١٨) ، هەروەها له کتێبی (الشمائل المحمدية) دا ، بابی : (ما جاء في وفاة رسول الله صلى الله عليه) گێڕاویەتەوه به ژماره (٣٧٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) له (جامع الترمذي/ ج ٢، ص ٣٣٨، ح ١٠١٨) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٦٤٩) ، و (مختصر الشمائل/ ح ٣٢٦) ، و (تلخيص احكام الجنائز/ ص ٥٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

٥- لە (جەعفەر) ی کوڕی (محمد) ی کوڕی (عەلی) کوڕی ئیمام (حوسەین) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە ، ئەویش لە باوکیەوە کەوا فەرموویەتی: (( الذي ألحد قبر رسول الله (ﷺ) أبو طلحة ، والذي ألقى القطيفة تحته شقران مولى رسول الله (ﷺ). قال جعفر: وأخبرني عبيد الله بن أبي رافع قال: سمعت شقران يقول: أنا والله طرحت القطيفة تحت رسول الله (ﷺ) في القبر ))[٩٦]

واتە : (ئەبوتەڵحە) ئەلحەدی گۆڕەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دروست کرد (جا کە لاشەی پێغەمبەریان (ﷺ) لەناوا دانا بە نۆ خشتی کاڵ لای پشتیان هەڵچنی) ، وە فەرمووی: ئەوکەسەی کە قەیفەکەی لە ژێر تەرمەکەی پێغەمبەرا (ﷺ) لەناو گۆڕەکەیدا ڕاخست (شەقران) ی نۆکەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو . وە (جەعفەری کوڕی محمد) دەفەرموێ: (عبیداللە ی کوڕی ئەبی ڕافیع) پێی ڕاگەیاندم و وتی: خۆم لە (شەقران) م بیست دەیوت: بەخوا خۆم پارچە قەیفەکەم لەناو گۆڕەکەدا لەژێر تەرمەکەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕاخست .

---

[٩٦] **صحیح** - (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الثوب الواحد يلقى تحت الميت في القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٧) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الكبير) دا ، بابی : (الصاد: صفوان بن المعطل السلمي - صالح شقران مولى رسول الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٢٣٦) ، هەروەها (ابن أبي عاصم) لە کتێبی (الآحاد والمثاني) دا ، بابی : (ومن ذكر شقران مولى رسول الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٣٧) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٢، ص ٣٦٥، ح ١٠٤٧) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

٦- لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی:

(( جعل في قبر رسول الله (ﷺ) قطيفة حمراء ))[٩٧]

واتە : لەكاتی ناشتنی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پارچە قەیفەیەكی سووریان لە ژێر تەرمەكەیدا ، لە گۆڕەكەیدا ڕاخست .

---

[٩٧] صحيح - (موسليم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (جعل القطيفة في القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٢٨) ، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الثوب الواحد يلقى تحت الميت في القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٨) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (وضع الثوب في اللحد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠١١).

# بەشی سێیەم
# ئەوانەی دروست نییە بۆ مردوو بکرێت

## یەکەم و دووەم: ڕۆڵە ڕۆکردن و پیاهەڵدان

شیوەن و وا وەیلا کردن بۆ مردوو حەرامە ، هەروەها پیاهەڵدانیش بۆ نموونە: بڵێ: (وای ڕۆڵە ڕۆ) ، (وای لەجێی گشت کەسم) ، (وای خۆزگە من بوومایە) ، لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە قسانە بەڵگەن لەسەر دژایەتی کردنی قەدەری خوایی.

١- لە (ئوم عەتیی) یەوە (خوای لێ ڕازی بێت) - کە ناوی (نوسەیبە) بوو - دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أخذ علينا النبي (ﷺ) عند البيعة أن لا ننوح ، فما وفت منا امرأة إلا خمس ، أم سليم ، أم العلاء، وابنة أبي سبرة امرأة معاذ ، أو ابنة أبي سبرة ، وامرأة معاذ ))[٩٨]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی پەیمان لێ وەرگرتندا پەیمانی ئەوەی لێ دەسەنین: کە شین و شەپۆڕ و گریە و زاریی نەکەین ، کەچی هیچ کەسێك لەو ئافرەتانەی کە پەیمانیاندا پەیمانەکەیان بەجێ نەهێنا ، تەنها پێنج ئافرەت نەبێ: دایکی سەلیم، و دایکی عەلاو، و کچەکەی باوکی سەبرە کە خێزانی (موعاز) بوو، یان کچی باوکی سەبرە، و خێزانی (موعاز).

---

[٩٨] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما ينهى من النوح والبكاء والزجر عن ذلك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٦)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (التشديد في النياحة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٦٠)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (البيعة)، بابی: (بيعة النساء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٩١).

٢- لە (ئەبو بوردە) ی کوڕی (ئەبو موسا) وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( وجع أبو موسى وجعا فغشي عليه ، ورأسه في حجر امرأة من أهله فصاحت امرأة من أهله ، فلم يستطع أن يرد عليها شيئا، فلما أفاق قال: أنا بريء مما برئ منه رسول الله (ﷺ)، فإن رسول الله (ﷺ) برئ من الصالقة، والحالقة، والشاقة ))[٩٩]

واتە: باوکم زۆر نەخۆش بوو، لەبەر شەکەتی و نارەحەتی بوورایەوە، لەو کاتەدا سەری لەسەر ڕانی ژنەکەی بوو، جا ژنەکەی قیژاندی و کردی بە هات و هاوار، (ئەبوموسا) نەیتوانی وەلامی بداتەوە، بەلام لە پاشان کە هۆشی هاتەوە فەرمووی: من لەو کەسە بەری و بێزارم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی بەری و بێزار بووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەری و بێزاربوو لەو ژنەی کە شین و شەپۆڕ دەکا و شیوەن دەگێڕێ و، سەری خۆی دەتاشێ و، یەخەی خۆی دادەدڕێ لە کاتی قەومانی کارەساتدا.

٣- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( اثنتان في الناس هما بهم كفر: الطعن في النسب ، والنياحة على الميت ))[١٠٠] واتە: دوو سیفات هەن لە نێو خەلکیدا کە بە کوفر دادەنرێن: یەکەم: تانە و تەشەردان لە ڕەچەلەك ، دووەم: شیوەن و زاریی لەسەر مردوو.

---

[٩٩] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما ينهى من الحلق عند المصيبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٣٤)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الإيمان)، بابی: (تحريم ضرب الخدود وشق الجيوب والدعاء بدعوى الجاهلية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٣).

[١٠٠] **صحيح** – (موسلیم) لە کتابی (الإيمان)، بابی: (إطلاق اسم الكفر على الطعن في النسب والنياحة على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٤)، هەروەها لە (تحفة لأشراف) دا بە ژمارە (١٢٤٥٨) هاتووە.

٤- لــە (ئــەبومالیك) ی ئەشــعەرییەوە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە کــەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( أربع في أمتي من أمر الجاهلية، لا يتركـونهن: الفخــر في الأحــساب ، والطعــن في الأنــساب ، والاستــسقاء بــالنجوم ، والنياحة. وقال: النائحة إذا لم تتب قبل موتها ، تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ، ودرع من جرب ))[١٠١]

واتە : چوار خووی ناشیرین ماون لەناو ئوممەتما لەگەڵ ئەوەشا کە ڕەفتارو پیشەی بەدی سەردەمی نەزانین کەچی هێشتا ئوممەتم هەر دەست بەرداریان نابن: یەکەم: نازین و شانازیکردن بە ڕەسەنی باوباپیرەوە ، دووەم: توانج و تانەدان لە ڕەچەڵەك و بنەچەی خەڵك ، سێیەم: بارانی باران دەدەنە پاڵ بورج و ئەستێرەکان ، چوارەم: شیوەن کـردن ، وە فەرمووشـی: سـەردولکەبێژ و ڕۆڵەڕۆڵەکـەر - ئەگـەر لـەپێش مردنیـا - تەوبـە نـەکاو پەشیمان نەبێتـەوە ، ئـەوە لـە ڕۆژی قیامـەتا کـە زینـدوو دەبێتەوە کراسی قەتران و دزداشەی گەڕیی لەبەردایە.

٥- لــە (ئەبوموســا) ی ئەشــعەرییەوە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە کــەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( مـا مـن ميـت يمـوت فيقـوم باكيه ، فيقول: واجبلاه واسيداه أو نحو ذلك ، إلا وكل به ملكان يلهزانه: أهكذا كنت

[١٠١] **صحیح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (التـشديد في النياحـة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢١٥٧) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ەکەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند الأنصار - حديث أبي مالك الأشعري) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٢٩٣) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی: (فصل في النياحة ونحوها - ذكر وصف عقوبـة النائحـة يـوم القيامـة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٣٢٠٠).

؟ ))[102] واته : کاتێ کەسێ دەمرێ ئەگەر یەکێ لەوە دوا هەڵسێتەوە و بە گریانەوە بیلاوێنێتەوە و بڵێ: کێوم ڕۆ ، پشتیوانم ڕۆ ، یا شتی وا بڵێ ، بێگومان کە ئەو مردووە دەدەنە دەست دوو مەلائیکە ، خۆش خۆش دەماڵن بەهەر دوو بنا گوێیداو بە تەوسەوە پێی دەڵێن: ئایا تۆ وەك ئەمە دەڵێ ، وا بووی !!

٦- لە (نوعمان) ی کوڕی (بەشیر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أغمي على عبد الله بن رواحة ، فجعلت أخته عمرة تبكي واجبلاه ، واكذا واكذا ، تعدد عليه ، فقال حين أفاق: ما قلت شيئا إلا قيل لي: آنت كذلك ))[103]

واته : کاتێ (عبدالله ی کوڕی ڕەواحە) بوورایەوە ، (عەمرە) ی خوشکی دەگریاو ئەیلاواندەوە: ئەی بۆ کێوەکەم ڕۆ ، ئەی بۆ ئەوەو ئەوەم ڕۆ ، جا کاتێ هۆشی هاتەوە فەرمووی: هەرچیت پێ دەوتم پێم دەوترا: ئایا تۆ وایت؟

٧- لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) أخذ على النساء حين بايعهن أن لا ينحن ، فقلن: يا رسول الله (ﷺ)، إن نساء أسعدننا في الجاهلية أفنسعدهن ؟ فقال رسول الله (ﷺ): لا

---

[102] **حسن** - (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في كراهية البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٠٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٢، ص ٣٢٦، ح ١٠٠٣) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٧٨٨) ، و (مشكاه المصابيح/ ج ١، ح ١٧٤٦) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

[103] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (المغازي) ، بابی : (غزوة مؤتة من أرض الشأم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٦٧) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (المغازي والسرايا) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٩٨) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الزهد) ، لە ژێر ناونیشانی : (ما ذكر في زهد الأنبياء وكلامهم عليهم السلام - كلام عبد الله بن رواحة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٤٠٥٧).

إسعاد في الإسلام ))[104] واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك پەیمانی لە ئافرەتان وەرگرت بەیعەتی لێ وەرگرتن کە شیوەن بۆ مردوو نەکەن ، ئەوانیش وتیان: دەی چەند ئافرەتێ لەسەردەمی نەفامی و جاهیلیدا شیوەنیان لەگەڵ گێڕاوین ، ئایا لە ئیسلامدا شوەنیان لەگەڵدا نەگێڕینەوە ؟ پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: لە ئیسلامدا یارمەتیدان نیە لە شیوەن کردندا .

## بابەتێکی تایبەت

### ئەوکەسەی وەسێت بکا شین و زاری لەسەر بکرێ ئەوە سزا دەدرێ

١- لە (موغیرە) ی کوڕی (شوعب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من نیح علیه ، فإنه یعذب بما نیح علیه یوم القیامة ))[105]

---

[104] **صحیح** – (نەسائی) لە (السنن الصغری) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النیاحة علی المیت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٥٢) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند أنس بن مالك رضي الله تعالی عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٧٧٨) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی: (فصل في النیاحة ونحوها - ذکر الخبر المصرح بحظر هذا الفعل علی الإطلاق) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٣) ، هەروەها (عبد الرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصبر والبکاء والنیاحة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٧٨) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الکبری) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النهي عن النیاحة علی المیت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٠١) ، هەروەها (عبد بن حمید) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند أنس بن مالك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥٧) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٤، ص ١٦، ح ١٨٥٢) ، (صحیح الجامع الصغیر/ ح ٧١٦٨) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

[105] **صحیح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما یکره من النیاحة علی المیت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٩١) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (المیت یعذب ببکاء أهله علیه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٥٤).

واتە : ئەوکەسەی شیوەنی لەسەر بکرێ ، ئەوە بێگومان لە ڕۆژی قیامەتا لەسەر ئەو شیوەنەی کە لەسەری دەکرێ ئازارو سزا دەدرێ !

٢- لە (ئەبوموسا) ی ئەشعەرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( فلما أصيب عمر دخل صهيب يبكي يقول: وا أخاه وا صاحباه ، فقال عمر رضي الله عنه: يا صهيب ، أتبكي علي ، وقد قال رسول الله (ﷺ): إن الميت يعذب ببعض بكاء أهله عليه ))[١٠٦]

واتە : کاتێ (عومەر) پێکرا ، (صوهەیب) هاتە ژوورەوە و دەگریا و هاواری لێ هەڵسا و دەیوت: ئای براڕۆ! ئای هاوەڵەکەم ڕۆ! ، جا (عومەر) یش پێی فەرموو: ئەی (صوهەیب) ! ئەوە دەگری بەسەرما ، ئەوە چۆن وا دەڵێیت ، ئەی نازانی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: بەڕاستی هەندێ مردوو سزا دەدرێ بەهۆی هەندێ لەو گریانەوە کە کەس و کارەکەی لەسەری دەگرین.

## سێیەم و چوارەم و پێنجەم: لەخۆدان و قژڕنین و یەخەدادڕین

هەروەها جل دڕین و قژڕنین و لەخۆدان حەرامە بۆ مردوو بکرێت:

١- لە (عبدالله) ی کوڕی (مەسعود) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( ليس منا من لطم الخدود ، وشق الجيوب ، ودعا بدعوى الجاهلية ))[١٠٧]

---

[١٠٦] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يكره من النياحة على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٩٠) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الميت يعذب ببكاء أهله عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٤٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النياحه على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٥٧).

[١٠٧] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ليس منا من شق الجيوب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٩٧)، هەروەها لە کتابی (المناقب)، بابی: (ما ينهى من دعوى الجاهلية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥١٩)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الإيمان)، بابی: (تحريم ضرب الخدود وشق الجيوب

واتە: لەسەر ڕێگەو ڕێبازی ئێمە نییە ئەوکەسەی کە لە ڕوومەتی خۆی بدا و، وە بەرۆکی خۆی دابدڕێ و، وە هاوار بکات بە هاواری سەردەمی نەفامی.

٢- لە (عبدالرحمن) ی کوڕی (یەزیدە) و (ئەبو بوردە) ی کوڕی (ئەبوموسا) وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویانە: (( أغمي على أبي موسى وأقبلت امرأته أم عبد الله تصيح برنة، قالا: ثم أفاق، قال: ألم تعلمي وكان يحدثها أن رسول الله (ﷺ) قال: أنا بريء ممن حلق وسلق وخرق ))[١٠٨]

واتە: لە نەخۆشینەکەیا (ئەبوموسا) لە هۆش خۆی چوو، جا ژنەکەی کە دایکی (عبدالله) یە ڕووی لێ بوو هاوارێکی لێ هەڵسا، (عبدالرحمن) و (ئەبوبوردە) دەڵێن: لە پاشان (ئەبوموسا) هاتەوە هۆش خۆی و فەرمووی: ئەرێ ئافرەت تۆ نازانی کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: من بەری و بێزارم لەو ئافرەتەی کە قژی خۆی بتاشێ و، شیوەن بگێڕێ و، جلی خۆی دادڕێ.

---

والدعاء بدعوى الجاهلية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨١)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (دعوى الجاهلية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٥٩)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في النهي عن ضرب الخدود وشق الجيوب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٨٤).

[١٠٨] صحيح - (موسلیم) لە کتابی (الإيمان)، بابی: (تحريم ضرب الخدود وشق الجيوب والدعاء بدعوى الجاهلية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٤)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الحلق) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٦٢)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في النهي عن ضرب الخدود وشق الجيوب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٨٦).

# بەشی چوارەم
# ئەوانەی پێویستە بۆ مردوو بکرێت

## یەکەم: شۆردنی مردوو

**١ ) حوکمەکەی:**

**جومهوری زانایان ڕایان وایە***: کە شتنی مردوو، وە کفن کردن و نوێژ لەسەرکردن و ناشتنی فەرزی کیفایەیە ، واتە: ئەگەر کۆمەڵێك موسوڵمان پێی هەڵسان ئەوانی تر لەسەریان دەکەوێ و گوناهبار نابن .

أ- لە (ئوم عەتییە) ی ئەنصاریەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( دخل علينا رسول الله (ﷺ) حين توفيت ابنته ، فقال: اغسلنها ثلاثا ، أو خمسا ، أو أكثر من ذلك إن رأيتن ذلك ، بماء وسدر ، واجعلن في الآخرة كافورا ))[١٠٩]

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە ژوورەوە کاتێك کە کچەکەی کۆچی دوایی کردبوو ، جا فەرمووی : بیشۆرنەوە سێ جار یان پێنج جار یان زیاتر لەوە ئەگەر

---

* (المجموع لإمام النووي/ ج ٥، ص ١٢٨) ، و (الأم لإمام الشافعي/ ج ١، ص ٢٤٣) ، و (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١١٣) ، و (فتح الباري لحافظ ابن حجر/ ج ٣، ص ١٢٥).

[١٠٩] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (غسل الميت ووضوئه بالماء والسدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥٣) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٦٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٤٢) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (غسل الميت بالماء والسدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٨٠).

بە باشتان بینی ، بە ئاوو (سیدر) ، وە دوایین جاریش (کافور) ی تێکەڵ کەن یان هەندێك لە (کافور).

ب- لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( أن رجلا وقصه بعيره ، ونحن مع النبي (ﷺ) ، وهو محرم ، فقال النبي (ﷺ): اغسلوه بماء وسدر ، وكفنوه في ثوبين ، ولا تمسوه طيبا ، ولا تخمروا رأسه ، فإن الله يبعثه يوم القيامة ملبيا )) [110]

واتە : پیاوێك وشترەکەی لەقەی لێدا ، وە ئێمەش لە گەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووین کەلە (ئیحرام) دا بوو ، جا فەرمووی: بیشۆنەوە بە ئاو و بە (سیدر) ، وە کفنی بکەن لە دوو بەرگدا ، وە بۆنی لێ مەدەن ، وە سەریشی دامەپۆشن ، چونکە لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە بە (لبيك اللهم لبيك ، لبيك لا شريك لك لبيك ، إن الحمد والنعمة لك الملك لا شريك لك).

**٢ ) ئەوانەی کەلە پێشترن بۆ شتنی مردووەکە :**

**أ- ئەگەر پیاو بوو:**

١- ئەوکەسەی کە مردووەکە وەسیەتی بۆ کردووە.

٢- باوکی مردووەکە ، چونکە زۆر بە سۆزە بۆی ، وە زیاتر شارەزایە بە کوڕەکەی.

---

[110] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (کیف یکفن المحرم؟) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٦٨) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الحج) ، بابی : (ما یفعل بالمحرم إذا مات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٨٣) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (المحرم یموت ، کیف یصنع بە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٣٨) ، هەروەها (ترمزی) لە کتابی (الحج) ، بابی : (ما جاء في المحرم یموت في إحرامة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٥١) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (کیف یکفن المحرم إذا مات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٠٢).

٣- پاشان نزیکتر و نزیکتر.

چونکە ئەوانەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) شۆردووە خزم و کەسەکانی خۆی بوون: لە پێشەوا (عەلی) یەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( غسلت رسول الله (ﷺ) فجعلت أنظر ما يكون من الميت فلم أر شيئا ، وكان طيبا حيا وميتا (ﷺ) ))[111]

واتە: پێغەمبەری خوام (ﷺ) شۆردەوە ، جا تەماشام کرد ئەوەی کەلە مردوودا دیارە ، هیچم نەبینی و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە زیندوویی و بە مردوویی و هەر بۆن خۆش و جوان بوو.

**ب- ئەگەر ئافرەت بوو:**

١- ئەوکەسەی کە مردووەکە وەسیەتی بۆ کردووە ، بە مەرجێ وەسێت بۆ کراو ئافرەت بێت.

٢- پاشان دایکی مردووەکە.

٣- پاشان کچی مردووەکە.

٤- پاش ئەوان نزیکتر و نزیکتر.

---

[111] **صحيح** - (حاکم) لە (مستدرك / ج ١ - ص ٣٦٢) دا لە کتابی (المغازي والسرايا) ، گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٣٤٥) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى / ج ٣ - ص ٢٨٨) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يؤمر به من تعاهد بطنه وغسل ما كان به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٣٧) ، هەروەها لە کتێبی (دلائل النبوة) دا لە کتابی (مرض رسول الله (ﷺ) ووفاته) ، بابی : (ما جاء في غسل رسول الله (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩١).

**ج- ژن و مێرد دروستە یەکتر بشۆرن[*] :**

١- لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کەوا بە (عائیشە) ی فەرموو: (( لو مت قبلي فغسلتك ... ))[112] واتە : ئەگەر هاتوو لەپێش منا مردی ئەوا خۆم دەتشۆرم .

**دایکە (عائیشە) دەفەرموێ:** ئەگەر وەکو ئێستا بمزانیایە ئەم دەهێشت جگە لە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کەسی تر پێغەمبەر (ﷺ) بشۆرێت .

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە دروستە ژن مێردی خۆی بشۆرێت ، بەڵام جیاوازن لەوەدا کە ئایا دروستە پیاو ژنی خۆی بشوات یان نا ؟

**جومهوری زانایان:** ڕێیان بەوە داوە ، بەپێی ئەوەی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) (فاتیمە) ی خێزانی شۆردووە .

وە بەپێی حەدیسەکەی (عائیشە) کە پێغەمبەر (ﷺ) بە (عائیشە) ی فەرمووە ، کەلە پێشدا ڕابورد .

**(حەنەفیەکان) دەفەرموون:** دروست نیە پیاو ژنی خۆی بشوات ، وە ئەگەر جگە لە مێردەکەی کەسی تری لا نەبوو ، ئەوە دەبێ تەیەمومی بۆ بکات .

---

[*] (المجموع/ ج ٥، ص ١٣٢) ، و (الأم / ج ١، ص ٢٤٢) ، و (المحلى/ ج ٥، ص ١٧٤).

[112] حسن - (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند الأنصار - الملحق المستدرك من مسند الأنصار - حديث السيدة عائشة رضي الله عنها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٩٠٨) ، هەروەها(نەسائی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (وفاة النبي) ، بابی : (بدء علة النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٠٧٩) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في غسل الرجل امرأته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٦٥) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (التاريخ) ، بابی : (مرض النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٨٦) ، هەروەها (دارەمی) لە پێشەکی سونەنەکەیدا، بابی : (في وفاة النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٠).

**د- دروستە باوك كچی خۆی بشۆرێ*:**

ئەگەر كەس نەبوو ئەو كچە بشۆرێت ئەوا دروستە باوكەكەی بیشۆرێت ، ئەمەش قسەی ئیمام (مالیك) و (شافیعی) و (ئەوزاعی) یە .

وە (ابن أبي شیبة) لە (ئەبی هاشم) ی ڕەممانی واسطییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە كەوا فەرموویەتی: (( أن أبا قلابة غسل ابنته ))[113] واتە : (ئەبوقیلابە)* كاتێ كچەكەی مرد خۆی شۆردی .

**ه- پیاوو ئافرەت هەردووكیان بۆیان هەیە منالێك بشۆرن*** : كەوا تەمەنی لە حەوت ساڵ كەمتر بێت ، جا جیاوازی نیە مردووەكە نێر بێ یا مێ ، لەبەر ئەوەی عەورەتی ئەو مردووە هیچ جۆرە حوكمێكی لە بارەوە نەهاتووە .

**(ابن المنذر) فەرموویەتی:** زانایان هەموو لەسەر ئەوەن كە دروستە ژن منالی نێرینەی بچووك بشۆرێت .

**و- ئەگەر پیاوێ لەناو كۆمەڵە ئافرەتێكدا مرد ، یاخود ئافرەتێ لەناو كۆمەڵە پیاوێكدا مرد:**

لەلای زانایان دوو ڕاوبۆچوون هەیە لەبارەی شۆردنیەوە:

**یەكەم:** دەبێ لەسەر جل و بەرگەكانیەوە بشۆردرێت . **دووەم:** نابێ بیشۆرن ، بەڵكو دەبێ تەیەمومی بۆ بكەن .

---

* (المجموع/ ج ٥، ص ١٥١) ، و (جامع أحكام النساء/ ج ١، ص ٤٧٥).

[113] **إسناده صحيح** - (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە كەیدا لە كتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (ما قالوا في الرجل يغسل ابنته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٩٩).

* **ناوی تەواوی:** (عبدالله) ی كوڕی (زەید) ی كوڕی (عەمر) جورمییە .

* (المجموع/ ج ٥، ص ١٤٩) ، و (المغني/ ج ٢، ص ٤٥٥).

لە (سەعید) ی کوڕی (موسەییب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( إذا ماتت المرأة مع الرجال ليس معهم امرأة ، قال: ييممونها بالصعيد ، ولا يغسلونها ، وإذا مات الرجل مع النساء فكذلك ))[114] واتە : ئەگەر ئافرەتێ لەگەڵ کۆمەڵە پیاوێکدا بوو مرد ، وە هیچ ئافرەتێکی تریان لەگەڵدا نەبوو ، ئەوە تەیەمومی بۆ دەکرێ بە گڵێکی پاك ، وە نابێ بشۆردرێت ، وە ئەگەر پیاوێکیش لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتێکدا بمرێ و هیچ پیاوێکی تریان لەگەڵا نەبێ ئەوە ئەویش بە هەمان شێوە تەیەمومی بۆ دەکرێت .

وە ئەمە قسەی (ئیبراهیمی نەخەعی)* و (حەممادی کوڕی ئەبی سولەیمان) ی ئەشعەریشە* .

**ز- دروست نیە موسوڵمان کافر بشۆرێت یاخود بینێژێ:**

لەبەر فەرموودەکەی خوای گەورە کەوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾ (التوبة: ٨٤)

واتە: ئەی پێغەمبەر هیچ کات لەسەر هیچ لەو دووڕووانە نوێژ نەکەی کە مرد ، هەروەها لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە ، چونکە بەڕاستی ئەوانە باوەڕیان بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی نەبوو، و کاتێ کە مردیشن لە ئایین دەرچوو بوون.

---

[114] أثر - (ابن ابي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (ما قالوا في الرجل يموت مع النساء وليس معهن رجل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٧٧).

* أثر - (ابي يوسف) لە کتێبی (الآثار) دا ، بابی : (في غسل الميت وكفنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٠٠) ، هەروەها (محمد بن الحسن) لە کتێبی (الآثار) دا ، بابی : (غسل المرأة وكفنها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٧).

* أثر - (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الرجل يموت مع النساء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٩٣٦).

جا ئەگەر نەهی کرابێت لەوەی کە نوێژی لەسەر بکرێت کەلە هەموو شتێك لە پێشترە ئەوا هیچ شتێکی تریش دروست نیە کە بۆی بکرێ و ئەنجام بدرێت.

**ئیمام (مالیك) و (حەنبەلیەکان) ڕایان وایە:** کە موسوڵمان بۆی نیە بێ باوەڕی خزمی خۆی بشوات و کفن و دفنی بکات ، مەگەر ترسی ون بوونی هەبێت ، ئەو کاتە پێویستە لەسەری بیشارێتەوە .

**بەڵام لای (شافیعیەکان):** دروستە موسوڵمان کەسی نزیکی خۆی لە هاوبەش پەیداکەران و ژنەکەی کە لە (ئەهلی کیتاب) بێ بیان شۆرێ و شوێن تەرمەکەیان بکەوێ و بیان نێژێ ، بەڵام نابێ نوێژیان لەسەر بکات* .

**ح- ئایا دروستە لەش گران و ئافرەتی حەیزدارو زەیستان مردوو بشۆرن؟**

**لە وەڵامدا دەڵێن:** بەڵێ دروستە ، چونکە لەو بارەیەوە هیچ بەڵگەیەك نیە کە ئەوە بسەلمێنێ کە دروست نیە* .

**خ- ئەگەر ئافرەتێ لەکاتی سووڕی مانگانەدا یا لە کاتی لەش گرانیدا مرد ئەوە تەنها یەك شۆردنی لەسەرە:**

چونکە کاتێ هەرکەسێ دەمرێ تەکلیفی شەرعی لەسەر نامێنێ ، بەڵکو تەنها ئەو شۆردنەی لەسەر پێویستە کە بۆ مردوو ئەنجام دەدرێ* .

**٣ ) پاراستنی عەیب و عاری مردوو:**

لە (ئەبو ڕافیع) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من غسل میتا فکتم علیە غفر لە أربعین

---

* (الأم / ج ١، ص ٢٣٥) ، و (المجموع/ ج ٥، ص ١٤٤).

* (المجموع/ ج ٥، ص ١٨٧).

* (المغني لإبن قدامة/ ج ٢، ص ٤٦٣).

مرة ، ومن كفن ميتا كساه الله من السندس ، وإستبرق الجنة ، ومـن حفـر لميـت قـبرا فأجنه فيه اجري له من الأجر كأجر مسكن أسكنه إلى يوم القيامة ))[115]

واتـە: ئەوكەسـەی مردوویـەك بـشوات ، وە عـەیب و عـاری بپۆشـێت ، ئـەوا خـوای پـەروەردگار چـل جـار لـە تاوانـەکانی خـۆش دەبێـت ، وە ئەوکەسـەش کـە کفنـی مردوویەك بكات ، ئەوا خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا لە ئاورێـشمی تـەنك و ئەسـتووری بەهەشـتی لەبـەر دەكـات ، وە ئەوكەسـەش كـە گۆڕێـك بـۆ مردوویـەك هەڵبكەنێ و، بیخاتە ناوی و دای بپۆشێت ، ئـەوا بـە بـەردەوامی خێـری ئـەوەی بـۆ دەنوسرێت کە ئەگەر خانوویەکی بۆ دروست کردبێـت و تێیـدا جێنـشینی کردبێـت تاکو ڕۆژی قیامەت .

**٤ ) چۆنێتی شۆردنی مردوو:**

یەکجار ئاو بکرێ بە هەموو لاشەیدا لە سەریەوە تـا پێیـەکانی ، یـا لەشیـشی گـران بووبێ یاخود بێ نوێژی بووبێت ، وە بخرێتە سەر شوێنێکی بەرز و جلەکانی لەبەر دابکەنرێ و شتێکی بدرێ بەسەریدا تـا شـەرمگای دەرنەکـەوێ ، وە نابـێ کـەس لای بمێنێتەوە جگە لەو کەسانەی کە پێویستە لەوێ بن .

**ئیمام (شافیعی) ڕای وایـە:** کـە لـە کراسـەکەی خۆیـدا بـشۆردرێ باشـترە بـە مـەرجێ ناسك بێت و ڕێگر نەبێ لەوەی کە ئاو بگات بە لەشی ، چونکە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە کراسەکەی خۆیدا شۆردرا .

---

[115] **صحيح** - (حاكم) له (مستدرك) دا له كتابى (الجنائز) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٣٤٠) و (١٣٧٣)، هەروەها (بەیهەقی) لە (شعب الإيمان) دا ، لە ژێر ناونیشانی : (الرابع والـستون مـن شـعب الإیمـان وهو باب في الصلاة على من) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٩٣٢)، هەروەها لە (معرفة الـسنن والآثـار) دا لە کتابی (الجنائز)، لة ذێر ناونیشانی (من غسل ميتا يستر عليه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢١٥٣)، هەروەها (تەبەڕانی) لە (معجم الكبير) دا، بابی: (من اسمه إبراهيم - أبورافع مـولى رسـول الله (ﷺ) إبراهيم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٢٥).

**٥ ) سوننەت و ئادابەکانی شۆردنی مردوو:**

**١- سوننەتە لە کاتی شتنی مردوودا عەورەتی دابپۆشرێ و جلەکانی لەبەر دابکەنرێ و ، لەبەر چاوی خەڵکیدا نەیشوات ، چونکە بینینی بە ڕووتی دروست نیە .**

**٢- پاشان سەری بەرز دەکرێتەوە لە نزیکی دانیشتنەکەیدا و ، وە سکی دەگوشێت بە هێواشی بۆ ئەوەی ئەگەر زیادەیەك لەپاشەڕۆ هەبێ بێتە دەرەوە ، وە ئاوێکی زۆری پێدا دەکات تا جوان پاك بێتەوە و پیسی پێوە نەمێنێت .**

**٣- ئنجا ئەوکەسە دەستکێشێك لە دەست دەکات تا بە جوانی پاش و پێشی ئەو مردووە بشوات ، بێ ئەوەی عەورەتی ببینێت ، یا دەستی بەر بکەوێت بە ڕووتی* ، جا ئەگەر مردووەکە حەوت ساڵان بوو ئەوە زیاتر دەستی پیا دەهێنێ و دەیشۆرێت.**

**٤- هەروەها (بسم الله) لێ دەکات و دەستنوێژێکی بۆ دەگرێ هەروەکو دەستنوێژی نوێژ: لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی بە شۆرەرەکانی کچەکەی: (( إبدأن بميامنها ، ومواضع الوضوء منها ))[١١٦] واتە: بە لا ڕاستەکانی دەست پێ بکەن و ، وە هەروەها بە شوێن دەست نوێژەکانی.**

---

*** (الأم/ ج ١، ص ٢٤٩) ، و (المغني/ ج ٢، ص ٤٥٧).**

**[١١٦] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (إبدؤوا في ميامن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥٥) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٧٢) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٤٥) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٩٠) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ميامن الميت ومواضع الوضوء منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٨٣).**

بەڵام با ئاو نەچێتە ناو لووت و دەمیەوە ، بەڵکو شۆرەرەکە شتێ بئاڵێنێ بە پەنجەیەوە و پاشان دەم و لووتی مردووەکەی پێ پاك بکاتەوە .

٥- هەروەها موستەحەببە بە کەفاوی (سیدر) سەر و ڕیشی مردووەکە بشۆرێ و ، وە باقیەکەشی بەکار بێنی بۆ لەشی.

پاشان لە ڕووی پێشەوە لای ڕاستی دەشوات، وە بە هەمان شێوە لای چەپیشی هەروا دەشوات ، لەبەر فەرموودەکەی پێشوو کەوا فەرمووی: (( إبدأن بميامنها ، ومواضع الوضوء منها ))[117]

٦- هەروەها ئەو شۆرینە بەو شێوەیە دووبارە و سێ بارە بکرێتەوە ، لەبەر فەرموودەکەی (ئوم عەتییە) (خوای لێ ڕازی بێت) کەوا فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێمان: (( اغسلنها ثلاثا ))[118] واتە: سێ جار بیشۆرن .

وە لە هەموو جارێکدا دەست بهێنێ بە سکی مردووەکەدا بۆ ئەوەی ئەگەر شتێ هاتە دەرەوە لە پاش و پێشی پاکی بکاتەوە و بیشۆرێت.

٧- هەروەها مردوو شۆر بۆی هەیە زیاتر لە سێ جاریش بیشۆرێت ، بە مەرجێ پێویست بکات .

٨- هەروەها موستەحەببە مردووەکە بە ئاوی سارد بشۆردرێت ، مەگەر کاتێ کە مردووەکە زۆر چڵکن بێت و پیسی پێوە دیار بێت ئەوە ئەوکاتە دەتوانێ ئاوی گەرم بەکار بهێنێت ، هەروەها دروستە سابوون بەکار بهێنێ بۆ لێکردنەوەی ئەو

---

[117] بڕوانە پەراوێزی پێش خۆی.

[118] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (غسل الميت ووضوئه بالماء والسدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥٣) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٦٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٤٢) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (غسل الميت بالماء والسدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٨٠).

چڵکە ، وە نابێ زۆر بە توونـدی بیـشۆرێ لەبـەر ئـەوەی نـەبادا پێـستەکەی لێ ببێتەوە، وە هەروەها دەتوانێ بە دان پاککەرەوە ددانەکانی پاك بکاتەوە.

٩- موستەحەببە سمێڵی مردووەکە کورت بکاتەوە و نینۆکەکانی بکات ئەگەرهاتوو زیاد لە سنوور نینۆکی هاتبوو ، بەڵام مووی بەر و بـن بـاخڵی دەسـتکاری نـاکرێ و کورت ناکرێتەوە.

١٠- هەروەها سونـنەتە دوا شۆردنی مردووەکە بە (کافور) بێت ، جا ئەگـەر (کـافور) نەبوو دروستە شتێکی تری تێ بکرێت کە جێی (کافور) بگرێتەوە:

لەبـەر فەرموودەکـەی (ئـوم عەتییـە) (خـوای لێ ڕازی بێـت) کـەوا فـەرمووی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی پێمـان: (( اجعلـن في الغسلة الأخـيرة كـافورا ))[١١٩] واتە: با کۆتا شتنی بە کافور بێت.

**حیکمەتی (کافور) تێکردنەکەش ئەوەیە کە زانایان باسیان کـردووە کـە:** بـۆنێکی زۆر خۆشە و ناسراوە ، وە بۆ ساردکرنەوەی لاشەکەیە و هەڵمژینیەتی ، وە بە بۆنەکەی جرِوجانەوەرو حەشەرات دوور دەکەوێتەوە ، وە ئەو کاتە کاتێکە مەلائیکە ئامـادە دەبێت لەلای.

١١- موستەحەببە دوای شۆردنەکە لاشەی وشك بکرێتەوە ، بـۆ ئـەوەی کفنەکە تـەڕ نەبێت[*] .

١٢- ئەگەر هاتوو دوای حەوت جار شۆردن پیسی لە پاش و پێشی مردووەکە - واتـە: میـز و پیـسایی و خـوێن - دەرچـوو ئـەوا لۆکـەی تـێ دەکـرێ و ، وە شـوێنە پـیس بووەکە دەشۆرێ و دەست نوێـژی تـازەی بـۆ دەگرێتـەوە ، بـەڵام ئەگـەر هـاتوو دوای

---

[١١٩] بڕوانە پەراوێزی پێش خۆی.

[*] (الأم/ ج ١، ص ٢٤٩) ، و (المجموع/ ج ٥، ص ١٦٨).

کفن کردنەکەی پیسی لێ هاتەدەر ئەوا جارێکی تر ناشۆرێتەوە ، چونکە ئەرکی گرانترە.

١٣- واچاکە لەسەر مردوو شۆر هەر شتێکی تری نائاسایی ببینێت لە مردووەکەدا ئەوە نابێ باسی بکات ، ئەویش وەك: ڕەش داگیرسانی دەم و چاوی ، یا نیشانەیەکی زۆر خراپ بە لاشەیەوە بێت ، یا هەر شتێکی تری لەو شێوەیە ، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ): (( من غسل مسلما فكتم عليه ، غفر الله له أربعين مرة ))[١٢٠] واتە: هەرکەسێ مردوویەکی موسوڵمان بشوات و نهێنی ئەو مردووە نەدرکێنێ ، ئەوە خوای گەورە چل جار لێی خۆش دەبێت.

**٦ ) ئەوەی دروست نیە لەکاتی شۆردنی مردوودا بکرێ:**

**یەکەم:** جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن: کە نینۆك کردن و بەر سمێڵ کردن و تووکی بن باڵ و نێوان هەردوو قاچی مردووەکە کەراهەتی هەیە ، بەڵام ئیمام (شافیعی) لە فتوای (جەدید) داو ، (ئیبنوحەزم) ڕێیان پێداوە ، لەبەر ئەوەی لە سوننەتە فیطریەکانن و پاك و خاوێنیشە بۆ مردووەکە*.

**دووەم:** باش نیە قژی مردوو شانە بکرێت ، چونکە لەوانەیە بوەرێت ، بەڵام سەبارەت بە قژی ئافرەت ئەگەر درێژبوو ئەوە دەکرێ بە سێ پرچەوە و بەردەدرێتەوە بە ناو شانیا ، چونکە لە گێڕانەوەکەی (أم عطية) دا هاتووە کە ئەوان قژی کچەکەی پێغەمبەریان (ﷺ) کرد بە سێ پرچ .

---

[١٢٠] **صحيح** - (حاكم) لە (مستدرك) دا لە كتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٧٣) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبری) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی: (من رأى شيئا من الميت فكتمه ولم يتحدث به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٧٠)، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٢ - ح ٣٤٩٢) ، و (أحكام الجنائز/ ج ١ - ص٥١) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

* (الأم/ ج ١، ص ٢٤٨) ، و (المجموع/ ج ٥، ص ١٧٨) ، و (الغسل والكفن/ ص ٩٧).

لــە زاراوەکــەی لای (موســلیم) دەفــەرموێ: (( مــشطناها ثلاثــة قــرون )) [131]

واتە: قژەکەیمان کرد بە سێ پرچ لە تەنیشتی سەریەوە و لە نێوچاوانیەوە .

سێیەم: ئەگەر کەسێك ئیحرامی بە (حەج) یا بە (عومرە) بەستبوو پاشان مرد ، ئەوە دەشۆرێت بە (ئاو) و (سیدر) ، بەلاَم نەبۆنی خۆشی پێوە دەکرێت ، وە نە سەری دادەپۆشرێت ، ئەگەر هاتوو لە ڕەگەزی نێر بوو:

لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کەلە بارەی ئەو پیاوەوە کە مرد بە ئیحرامەوە ، فەرمووی: (( اغسلوه بماء و سدر، و كفنوه في ثوبيه ، ولا تمسوه طيبا ، ولا تخمروا رأسه ، ولا تحنطوه ، فإن الله يبعثه يوم القيامة ملبيا )) [132]

واتە : بیشۆرن بە ئاوو سیدر و ، کفنی بکەن لە جل و بەرگەکەی خۆیدا و ، بۆنی خۆشی لێ مەدەن و سەری دامەپۆشن ، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا بە (لبيك اللهم لبيك) زیندوو دەکرێتەوە.

## چەند بابەتێکی تایبەت لەو بارەیەوە

### ١) سەبارەت بە شەهیدی جەنگ

شەهیدی جەنگ نەدەشۆرێ و نە نوێژی لەسەر دەکرێ ، ئەگەر چی لەشیشی گران بووبێت ، وە هەر بە جلەکانی خۆی کە لەبەریا بووە کفن دەکرێ و دەنێژرێت ، بەلاَم پاش ئەوەی کە چەك و تەقەمەنیەکەی لێ کرایەوە و هیچی پێوە نەما ئەوسا

---

[131] صحيح - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٦٥).

[132] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف يكفن المحرم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٦٧) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الحج) ، بابی : (ما يفعل بالمحرم إذا مات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٨٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (مناسك الحج) ، بابی : (تخمير المحرم وجهه ورأسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧١٢) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (المناسك) ، بابی : (المحرم يموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٨٤).

دەنێـژرێت ، وە ناتـەواوی کفنەکـەی بەشـتی تـر بـۆ تـەواو دەکرێـت ، وە هـەر بـە خوێنـەکەیەوە دەنێژرێ و هیچی لێ ناشۆردرێت .

أ- لـە (جـابیر) ی کـوڕی (عبـدالله) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) كان يجمع بـين الـرجلين مـن قتلـى أحـد في ثـوب واحد ، ثم يقـول: أيهـم أكثـر أخـذا للقـرآن ، فـإذا أشـير لـه إلى أحـد قدمـه في اللحد ، وقال: أنا شهيد على هؤلاء يوم القيامـة ، وأمـر بـدفنهم بـدمائهم ، ولم يـصل علـيهم ولم يغسلوا ))[١٣٢]

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەهیدەکانی غەزای (ئوحود) ی دوو پیاو ، دوو پیاو ، دەخستە ناو یەك لۆ جلەوە لەباتی کفن ، ئنجا دەیفەرموو: کامەیان زیاتر قورئـانی لەبەر بوو؟ جا کـە نیشانیان دەدا کامـەیان پـتر قورئـانی لەبـەر بـووە ئـەومیانی لـە ئەلحەکەدا دەخستە لای قیبلەوە ! وە فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا من خۆم ئاگاداری ئەمانە دەکەم و دەبم بـە شـایەت بۆیـان و شـایەتییان بـۆ دەدەم کـە گیـانی شـیرینی خۆیان بەخت کردووە لە پێناوی خوادا ، لـە پاشـا فـەرمانی کـرد هـەر بـە خـوێن و خۆڕەکەی خۆیانـەوە ناشتیانن ، نە شۆردران و نە نوێژیان لەسەر کرا .

---

[١٣٢] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (الصلاة على الـشهيد) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٢٩١) ، هەروەها لە کتـابی (المغـازي) ، بـابی: (مـن قتـل مـن المـسلمين يـوم أحـد) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٤٠٧٩) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (في الـشهيد يغـسل) گێڕاویەتـەوە بە ژمارە (٣١٣٨) ، هەروەها (ترمذی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في تـرك الـصلاة علـى الشهيد) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (١٠٣٦) ، هـەروەها (نـەسائی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (تـرك الصلاة عليهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٥) ، هەروەها (ابن ماجـه) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (ما جاء في الصلاة على الشهداء ودفنهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥١٤).

لە گێڕانەوەیەکی تـرات دەفـەرموێ: (( وأمـر بـدفنهم في دمـائهم ، ولم يغـسلوا ))[١٢٤]
واتــە: فــەرمانی کــرد کــەوا کوژراوەکــانی (ئوحــود) هــەر بــە جــل و بەرگــە خوێناویەکانیانەوە بنێژرێن و ، نە شۆردرێن.

ب- لــە (جـابر) ی کـوڕی (عبـدالله) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنــەوە کـەوا فەرموویــەتی: پێغەمبــەر (ﷺ) لــەبارەی کوژراوەکــانی غــەزای (ئوحــود) ە وە فەرمووی: (( لا تغسلوهم ، فإن كل جرح - أو كل دم - يفوح مسكا يوم القيامـة ، ولم يـصل علـيهم ))[١٢٥] واتــە : مـەيان شـۆرن ، چـونكە هـەر برينێـك يـان هـەر دڵۆپـە خوێنێك لە ڕۆژی قیامەتدا بۆنی میسك بڵاودەكەنـەوە. وە پێغەمبـەر (ﷺ) نوێـژی مـردووی لەسەر نەكردن .

ئیمام (شافیعی) فەرموویـەتی* : لەوانەیـە وازهێنـان لـە شـۆردن و نوێـژكردن لەسـەر شەهیدان ، لەبەر ئەوە بێت كە بە برینەكانیانەوە بگەن بە خوای خۆیـان ، چونكە

---

[١٢٤] صحيح - (بوخاری) لە كتابی (الجنائز) ، بـابی : (الصلاة علـى الـشهيد) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٣٤٣) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في الشهيد يغسل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٣٨) ، هەروەها (ترمذی) لـە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في تـرك الـصلاة علـى الـشهيد) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٠٣٦) ، هـەروەها (نەسـائی) لـە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (تـرك الـصلاة عليهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز) ، بـابی : (مـا جـاء في الصلاة على الشهداء ودفنهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥١٤).

[١٢٥] صحيح - (ئەحمەد) لە (مسند) ە كەیدا ، لە ژێرناونیشانی: (مسند جابر بن عبـد الله رضي الله عنــه) گێڕاویەتــەوە بــە ژمــارە (١٣٩٠٥) ، هــەروەها (ابــن الجعــد) لــە (مــسند) ە كەیـدا ، لـە ژێرناونیشانی: (عبد ربه بن سعيد) گێڕاویەتەوە بە ژمـارە (١٢٨٧) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـە (سلـسلة الأحاديــث الـصحيحة/ ج ٣، ص ٣٧٣، ح ١٢٢٩)، و(تلخـيص أحكـام الجنــائز/ ص ٣٢) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

* (الأم / ج ١، ص ٣٠٥).

فەرموودە هاتووە کە خوێنەکەیان بۆنی میسك دەدات ، وە ئەوان بەو ڕێزلێنانەی خوا بۆیان پێویستییان نیە نوێژیان لەسەر بکرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا کە بارسوکی یە بۆ ئەو موسوڵمانانەی ماون ، چونکە ئەوانە یا برینداڕن یا ترسی گەڕانەوەی دوژمنیان هەیە ، وە هەروەها ئومێدی ئەوەیان هەیە کە بگەڕێنەوە بۆ ناو کەسوکاریان و ، کەسوکاریشیان ئومێدیان پێیان هەیە .

**بەڵام فەرموودەی تر هەن کە نوێژیان لەسەر دەکرێت لەوانە:**

أ- لە (عوقبە) ی کوڕی (عامیر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) خرج يوما ، فصلى على أهل أحد ، صلاته على الميت))[١٣٦] واتە : ڕۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) (لەپاش هەشت ساڵ لە شەهیدبوونی شەهیدانی ئوحود) لە ماڵ دەرچوو ، ڕۆیشت نوێژی مردووی لەسەر شەهیدانی (ئوحود) کرد.

ب- لە (ئەبومالیك) ی غیفارییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان قتلى أحد يؤتى بتسعة وعاشرهم حمزة ، فيصلي عليهم رسول الله (ﷺ) ، ثم يحملون ، ثم يؤتى بتسعة فيصلي عليهم وحمزة مكانه حتى صلى عليهم رسول الله (ﷺ) ))[١٣٧]

---

[١٣٦] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الشهيد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٤٤) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الفضائل) ، بابی : (إثبات حوض نبينا (ﷺ) وصفاته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٩٣٢) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الميت يصلى على قبره بعد حين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٣) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الشهداء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٤).

[١٣٧] **مرسل** - (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من زعم أن النبي (ﷺ) صلى على) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤١٥) ، هەروەها (طەحاوی) لە کتێبی (شرح معاني الآثار) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الشهداء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٤٨).

واته : كوژراوەكانی (ئوحود) یان نۆ نۆ دەهێنـا و بـە (حـەمزە) وە دەبـوون بـە دە ، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) نوێـژی لەسـەر دەكـردن ، پاشـان لا دەبـران و نـۆی تریـان دەهێنا، (حەمزە) هەر دەمایەوە و لا دەبەنرا ، بەو شێوەیە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) نوێژی لەسەر هەموویان كرد .

جا ڕای زانایان بەپێی جیاوازی ئـەم فەرموودانـە جیاوازە ، هەنـدێكیان تـەرجیحی هەنـدێ لـەو فەرموودانـە دەدەن بەسـەر هەنـدێكی تریانـدا ، وە هەنـدێكیان بـە هـەردوو جـۆری فەرموودەكـە كـار دەكـەن ، بـۆ نموونـە: (ئیبنوحـەزم) كـردن و نەكردنی بە دروست داناوە ، وە فەرموویەتی: ئەگەر نوێژی لەسەر بكرێت چاكترە، وە ئەگـەر نەشـكرێت هـەر چـاكە ، وە لـە یـەكێ گێڕانەوەكانـدا ئەمـە ڕای ئیمـام (ئەحمەد) یشە .

هەروەها (ئیبنوقەییم) یش هەمان بۆچوونی هەیە ، وە فەرموویـەتی: ئـەوەی ڕاسـت بێـت لەم كێشەیەدا ئەوەیە: كە ئیمام ئارەزووی خۆیەتی نوێژی لەسەر بكات یان نـەیكا ، چـونكە ئەسـەر و ڕیوایـەت بەهـەردوو شـێوەكە هاتووە ، ئەمـەش یـەكێكی تـرە لـە ڕیواتەكانی (ئەحمەد) ، وە ئەوەش گونجاوترە بە بنەمای مەزهەبەكەیەوە .

وە فەرموویەتی: ئـەوەی دەردەكـەوێت دەربـارەی شـەهیدەكانی (ئوحـود) ئەوەیـە كـە پێغەمبەر (ﷺ) كاتی ناشتنیان نوێـژی لەسـەر نـەكردوون ، چـونكە حـەفتاكـەس لـە (ئوحود) شەهیدكران و نابێ شـتـی وا بـشارێتەوە و نـەزانرێ ئەگـەر نوێـژی لەسـەر كردبن .

وە حەدیسەكەی (جابیری كوڕی عبدالله) كە فەرموویەتی: (نوێـژیان لەسـەر نـەكرا) صەحیح و صەریحە ، لەكاتێكا (عبـدالله) ی باوكیشی یـەكێك بـوو لـە كوژراوەكـان ، كەواتە ئەو لەو بارەیەوە ئاگادارترە لە كەسێكی تر .

**ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (سوفیانی ثوری) و (حەسەنی بەصری) و (ئیبنوموسەیب) ئەو ڕیوایەتانە تەرجیح دەدەن کە دەفەرموون*** : نوێژیان لەسەر کراوە ، وە فەرموویانە: پێویستە نوێژ لەسەر شەهید بکرێت .

بەڵام ئیمام (مالیك) و (شافیعی) و (ئیسحاق) و ڕیوایەتێك لە ئیمام (ئەحمەد) ە وە پێچەوانەی ئەوانن ، وە فەرموویانە: شەهید نوێژی لەسەر ناکرێت* .

**وە ئیمام (شافیعی) لە (الأم) دا ڕای خۆی تەرجیح دەدا و دەفەرمویٚ*** : ڕیوایەتەکان بە ئاشکرا واهاتوون وەك ئەوەی بە چاو ببینرێن لە چەند ڕوویەکی موتەواتیرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر کوژراوەکانی (ئوحود) نەکردووە ، وە ئەوەی دەگێڕنەوە کە نوێژی لەسەر کردوون و لەسەر حەمزە حەفتا (الله أكبر) ی کردووە صەحیح نیە .

**٢ ) ئەو شەهیدانەی دەشۆرێن و نوێژیان لەسەر دەکریٚ**

ئەوانەی کە پلەی شەهادەتیان هەیە و لە جەنگی بیٚ باوەڕاندا نەکوژراون و پێغەمبەر (ﷺ) بە شەهید ناوی بردوون ، وەك: (ئەوکەسەی بە تاعوون بمریٚ) ، (خنکاو لەناو ئاودا) ، (ئەوکەسەی بە نەخۆشی سیل بمریٚ) ، (ئەوکەسەی بە سك ئێشە بمریٚ) ، (ئەوکەسەی بە سووتان بمریٚ) ، (ئەوکەسەی لەژێر شتی ڕووخاوا بمریٚ) ، (ئەو ژنەی بەسەر منداڵەوە بمریٚ) ، (ئەوکەسەی لە بەرگری سامان و ماڵەکەیدا بکوژریٚ) ، (ئەوکەسەی لە پێناو پاراستنی گیانی خۆیدا بکوژریٚ) ، (ئەوکەسەی لە پێناو ئایینەکەیدا بکوژریٚ) ، (ئەوکەسەی لە پێناو کەسوکارەکەیدا بکوژریٚ) ، ئەمانە هەموویان لەلای جومهوری زانایان دەشۆردرێن و نوێژیشیان

---

* (نيل الأوطار / ج ٤، ص ٥٤) ، و (الأفنان الندية / ج ٢، ص ٢٩٥).

* (نيل الأوطار / ج ٤، ص ٥٤) ، و (الأفنان الندية / ج ٢، ص ٢٩٥).

* (الأم / ج ١، ص ٣٠٥).

لەسەر دەکرێ*، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە ژیانی خۆیدا ئەگەر یەکێ لەوانە بمردایە دەیشۆری و نوێژیشی لەسەر دەکرد ، وە هەروەها موسوڵمانەکانی دەوری پێغەمبەر (ﷺ) (عومەر) و (عوسمان) و (عەلی) یان شۆردووە ، هەرچەندە هەمووشیان شەهید بوون ، ئەمەش ئەو فەرموودانەی کە باس لە جۆرەکانی شەهید دەکات:

١- لە (جابیر) ی کوڕی (عوتەیك) ی کوڕی (قەیسی کوڕی ئەسوەد) ی سولەمییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ... ، وما تعدون الشهادة ؟ قالوا: القتل في سبيل الله تعالى ، قال رسول الله (ﷺ): الشهادة سبع سوى القتل في سبيل الله: المطعون شهيد ، والغرق شهيد ، وصاحب ذات الجنب شهيد ، والمبطون شهيد ، وصاحب الحريق شهيد ، والذي يموت تحت الهدم شهيد ، والمرأة تموت بجمع شهيد ))[١٢٨]

واتە : ئێوە کێ لە خۆتان بە شەهید دادەنێن؟ وتیان: هەرکەس لە ڕێگای خوادا بکوژرێ ئەوە شەهیدە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: شەهید حەوت جۆرە جگە لە شەهیدی ڕێگای خوا: یەکەم: ئەوکەسەی بە تاعوون بمرێت شەهیدە ، وە

---

* (المغني/ ج ٢، ص ٥٣٦).

[١٢٨] صحيح - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في فضل من مات في الطاعون) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١١) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النهي عن البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٤٦) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێرناونیشانی: (مسند الأنصار - حديث جابر بن عتيك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣١١٥) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێرناونیشانی: (فصل في الشهيد - ذكر البيان بأن المصطفى لم يرد بقوله : الشهداء خمسة نفيا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٤٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ٣، ص ١٨٨، ح ٣١١١) ، و (سنن النسائي/ ج ٤، ص ١٣، ح ١٨٤٦) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٣٧٣٩) ، و (مشكاة المصابيح / ج ١، ح ١٥٦١) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

خنکاو لەناو ئاودا شەهیدە ، وە ئەوەی بە نەخۆشی سیل مردووە شەهیدە ، وە ئەوەی بە سك ئێشە مردووە شەهیدە ، وە ئەوەی بەهۆی سووتانەوە مردووە شەهیدە ، وە ئەوکەسەی لە ژێر شتی ڕووخاودا بمرێ شەهیدە ، وە ئەو ژنەی بەسەر منداڵەوە بمرێ شەهیدە .

٢- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ما تعدون الشهيد فيكم؟ قالوا: يا رسول الله (ﷺ)، من قتل في سبيل الله فهو شهيد ، قال: إن شهداء أمتي إذا لقليل ، قالوا: فمن هم يا رسول الله (ﷺ)؟ قال: من قتل في سبيل الله فهو شهيد ، ومن مات في سبيل الله فهو شهيد ، ومن مات في الطاعون فهو شهيد ، ومن مات في البطن فهو شهيد ))[١٢٩]

واتە : ئێوە کێ لە خۆتان بە شەهید دادەنێن؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! هەرکەس لە ڕێگای خوادا بکوژرێ ئەوە شەهیدە ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: کەواتە شەهیدی ئوممەتەکەی من کەمن ، وتیان: ئەی شەهید کامانەن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی: هەرکەس بکوژرێت لە ڕێگای خوادا ئەوە شەهیدە ، وە هەرکەس بمرێت لە ڕێگای خوادا (واتە: لە فەرمانبەری و گوێڕایەڵی خوادا) ئەوە شەهیدە ، وە هەرکەس بە تاعوون بمرێت شەهیدە ، وە هەرکەس بە سك ئێشە بمرێت شەهیدە ، وە هەرکەس بە خنکان لەناو ئاودا بمرێت شەهیدە .

٣- لە (سەعید) ی کوڕی (زەید) ی قوڕەشییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (( من قتل دون ماله

---

[١٢٩] صحيح - (موسليم) لە کتابی (الإمارة) ، بابی : (بيان الشهداء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩١٨) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجهاد) ، بابی : (ما يرجى فيه الشهادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٠٤) ، هەروەها (تەیالیسی) لە (مسند) ەکەیدا ، لە ژێرناونیشانی: (ما أسند أبو هريرة - وأبو صالح) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥١٨).

فهو شهيد ، ومن قتل دون دينه فهو شهيد ، ومن قتل دون دمه فهو شهيد ، ومن قتل دون أهله فهو شهيد ))[130] واتە : هەرکەس لە پێناوی سامانەکەیدا بکوژرێت شەهیدە ، وە هەرکەس لە پێناوی گیانی خۆیدا بکوژرێت شەهیدە ، وە هەرکەس لە پێناوی ئایینەکەیدا بکوژرێت شەهیدە ، وە هەرکەس لە پێناوی کەسوکاریا بکوژرێت شەهیدە .

**٣ ) سەبارەت بە کەسێ کە لە جەنگا بریندار بکرێ و پاشان بمرێ**

ئەگەر کەسێك لە جەنگی بێ باوەڕاندا بریندار کراو پاشان بۆ ماوەیە ژیاو دواتر مرد ، ئەوە هەر چەندە بە شەهید دادنرێت بەڵام دەبێ بشۆرێت و نوێژی لەسەر بکرێت .

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) (سەعدی کوڕی موعاز) ی شۆری و نوێژی لەسەر کرد ، دوای ئەوەی کە مرد بەهۆی تیرێك کە درا لە دەماری قۆڵی و بڕی . جا بردیان بۆ مزگەت و چەند ڕۆژێك مایەوە ، پاشان برینەکەی دەمی کردەوە و بە شەهیدی مرد (خوای لێ ڕازی بێت).

---

[130] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (السنة) ، بابی : (في قتال اللصوص) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٧٧٢) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الديات) ، بابی : (ما جاء فيمن قتل دون ماله فهو شهيد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٢١) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (تحريم الدم) ، بابی : (من قاتل دون دينه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٠٩٥) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێرناونیشانی: (مسند باقي العشرة المبشرين بالجنة - مسند سعيد بن زيد بن عمرو بن نفيل رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٩٠) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبى داود/ ج ٤، ص ٢٤٦، ح ٤٧٧٢)، و (جامع الترمذی/ ج ٤، ص ٣٠، ح ١٤٢١) ، و (سنن النسائي/ ج ٧، ص ١١٦، ح ٤٠٩٥) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٦٤٤٥) ، و (مشكاة المصابيح / ج ٢، ح ٣٥٢٩) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٢، ح ١٤١١) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٢٣) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

بەڵام ئەگەر بە برینداری بۆ ماوەیەکی کەم مایەوە و پاشان مـرد ، ئـەوە ئەوکەسە ناشۆردرێ و نوێژی لەسەر ناکرێت .

## ٤ ) سەبارەت بە شۆردنی کەسێ کەلە ئیحرامدا بووبێ

ئەگەر کەسێك ئیحرامی بەست و مرد ئەوە دەبێ وەك مـردووی تـر بـشۆرێت و بـە کراسی ئیحرامەکەی کفن بکرێت ، بەڵام سەری داناپۆشرێت و بـۆنی لێ نادرێت بـۆ ئەوەی حوکمی ئیحرامی پێوە بمێنێت .

لـە (ئیبنوعـەبباس) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی:

(( أن رجلا وقصه بعيره ، ونحن مع النبي (ﷺ) ، وهو محرم ، فقال النبي (ﷺ): اغسلوه بماء وسدر ، وكفنوه في ثوبين ، ولا تمسوه طيبا ، ولا تخمروا رأسه ، فإن الله يبعثه يوم القيامة ملبيا )) [131]

واته : پیاوێك وشترەکەی لەقەی لێدا ، وە ئێمەش لە گەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) بـووین کەلە (ئیحرام) دا بوو ، جا فـەرمووی: بیشۆنەوە بـە ئـاو و بـە (سیدر) ، وە کفنـی بکـەن لـە دوو بەرگـدا ، وە بـۆنی لێ مـەدەن ، وە سەریـشی دامەپۆشـن ، چـونکە لـە ڕۆژی دواییـدا خـوای گـەورە زینـدووی دەکاتـەوە بـە (لبيـك اللهم لبيـك ، لبيـك لا شريك لك لبيك ، إن الحمد والنعمة لك الملك لا شريك لك).

---

[131] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف يكفن المحرم ؟) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (١٢٦٨) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الحج) ، بابی : (ما يفعل بالمحرم إذا مات) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٢٨٨٣) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (المحرم يموت ، كيف يصنع بـه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٣٨) ، هەروەها (ترمـزی) لـە کتـابی (الحـج) ، بـابی : (مـا جاء في المحرم يموت في إحرامة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٥١) ، هـەروەها (نەسائی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (كيف يكفن المحرم إذا مات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٠٣).

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە:**

**(حەنەفیـــەکان) و (مالیکیـــەکان) بـــۆ ئـــەوە چـــوون:** ئەگـــەر مـــوحریم مـــرد ئـــەوە ئیحرامەکـەی دەشـکێت ، وە بـە پـچڕاندنی ئیحرامەکـەی وەك کەسـێکی تـر کفـن دەکرێت و کفنەکەی دەدورێت و سەری دادەپۆشرێت و بۆنی لێ دەدرێت .

**وە فەرموویانە:** بەسەر هاتی ئەو پیاوە شتێکی تایبەت بووە بۆ گشت کەس نیە ، بەڵام ئەوەی کە زیندوو دەکرێتەوە ڕۆژی دوایی ئەو هەر (لبيك اللهم لبيك) دەڵێت وا دەردەکەوێت ئەوە بۆ هەموو موحریمێکە .

## ٥ ) سەبارەت بە شۆردنی منداڵی لەبارچوو

منداڵی لەبارچوو ئەگەر تەمەنی گەیشتە (٤) مانگان ئـەوە دەشـۆردرێ و نوێژیـشی لەسەر دەکرێ و ناویشی لێ دەنرێت:

لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کەوا فەرموویـەتی: (( إن أحـدكم يجمع خلقـه في بطن أمه أربعين يوما ، ثم يكون في ذلك علقة مثل ذلك ، ثم يكون في ذلك مضغة مثل ذلك ، ثم يرسل الملك فينفخ فيه الروح ))[١٣٢]

واتە: هەر یەکێ لە ئێوە کە خـودا دروسـتی دەکـا ، چـل ڕۆژ بـە نوتفـەیی لـە سکی دایکیا کۆ دەکرێتەوە و دەمێنێتەوە ، پاشـان بـە چـل ڕۆژی تـر دەبـێ بـە خـوێنێکی

---

[١٣٢] **صحيح** - (بوخاری) لە کتـابی (احاديث الأنبياء) ، بـابی : (خلق آدم وذريتـه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٣٣٣٢) ، هەروەها (موسلیم) لـە کتـابی (القـدر) ، بـابی : (كيفيـة خلق الآدمي في بطـن أمـه وكتابـة رزقـه واجلـه وعملـه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٦٦٦٥) ، هـەروەها (ئـەبوداود) لـە کتـابی (السنة)، بابی : (في القدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٧٠٨) ، هەروەها (ترمـذی) لـە کتـابی (القـدر) ، بابی : (ما جاء أن الأعمـال بـالخواتيم) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢١٣٧) ، هـەروەها (ابـن ماجـە) لـە (المقدمة) دا ، بابی : (في القدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٦).

مەیبو ، پاش ئەوەش بە چل ڕۆژی تریش دەبێ بە پارچە گۆشتێکی جووراو ، پاشان خوای پەروەردگار مەلائیکەتێکی بۆ دەنێرێ و ڕۆح دەکات بە بەریدا.
واتە ئەمە دوای تەمەنی چوار مانگی یە ، بەڵام ئەگەر هاتوو پێش تەمەنی چوار مانگی بوو ئەوە پارچە گۆشتێکە و لە هەر شوێنێ بتەوێ دەینێژی و ، وە ناشۆردرێ و نوێژیشی لەسەر ناکرێت .

*

### ٦ ) سەبارەت بە ئافرەتێ کە منداڵی زیندووی لە سکابێ و بمرێ

ئەگەر هاتوو ئافرەتێکی سك پڕ مردوو منداڵەکەش لەناو سکیا زیندوو بوو ، ئەوە دەبێ سکی هەڵبدرێ و منداڵەکەی تێدا دەربکرێ بۆ ئەوەی نەمرێ ، ئەمەش مەزهەبی (حەنەفیەکان) و (شافیعیەکان) ە ، وە لە وەجهێکدا ڕای (حەنبەلیەکان) و هەندێ لە (مالیکیەکان) یشە* .

### ٧ ) سەبارەت بە شۆردنی پارچەی مردوو

زانایان جیاوازییان هەیە لە شۆردنی پارچەی موسوڵمانی مردوو ، ئیمام (شافیعی) و (ئەحمەد) و (ئیبنوحەزم) بۆ ئەوە چوون: ئەو پارچەیەی لە موسوڵمانی مردوو دەبێتەوە دەبێ بشۆردرێت و کفن بکرێت و نوێژیشی لەسەر بکرێت .
وە ئیمام (شافیعی) فەرموویەتی: پێم گەیشتووە ، لە مەککە دەستی مرۆڤێك لە دەمی باڵندەیەك بەر بۆتەوە لە کاتی شەڕی (جەمەل) دا ، بە ئەنگوستیلەکەیدا ناسیویانەتەوە دەستی کێ بووە ، شۆردوویانە و نوێژیان لەسەر کردووە ، ئەم کارەش بە ئامادەبووی صەحابە کراوە .

---

* (الفتاوى الهندية/ ج ١، ص ١٥٧) ، و (غاية المنتهى/ ج ١، ص ٢٥٤) ، و (بلغة السالك/ ج ١، ص٢٣٢).

**ئیمام (ئەحمەد) فەرموویەتی:** (ئەبوئەییوب) نوێژی لەسەر لاقێکی پەڕیو کردووە ، وە (عومەر) لەسەر ئێسکی ئادەمیزاد نوێژی کردووە .

وە **(ئیبنوحەزم) فەرموویەتی:** نوێژ دەکرێت لەسەر هەموو پارچەی لەشی موسوڵمانی مردوو ، وە دەشۆردرێت و کفن دەکرێت ، بەڵام پارچەی شەهید پێویست ناکات ، وە فەرموویەتی: کاتێ کەسێك نوێژ لەسەر پارچەکە دەکات دەبێ نییەتی وابێت لەسەر هەموو لاشەکە دەیکات .

**ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) فەرموویانە:** ئەگەر لە نیوەی لەش زیاتر دۆزرایەوە دەشۆرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت ، ئەگینا لەوە کەمتر نە دەشۆردرێت و نە نوێژی لەسەر دەکرێت .

## ٨ ) تەیەمموم لەکاتی نەبوونی ئاودا*

ئەگەر مردوویەك نەتوانرا بشۆردرێ لەبەر بێ ئاوی یا لەبەر سووتاوی یا لەبەر پارچە پارچە بوون یا لەبەر داڕزانی لاشەکەی ، ئەوە بێگومان تەیەمموی بۆ دەکرێت بەپێی فەرموودەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَآءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ﴾ (المائدة / ٦)

واتە : جا ئاوتان دەست نەکەوت ، ئەوە تەیەمموم بکەن بە سەر زەویەکی پاك و مەسحی ڕوومەت و هەردوو دەستانی پێ بکەن .

هەروەها ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو وە ئەوانەی لەوێ بوون پیاوانی بێگانە بوون یاخود بە پێچەوانەوە ، ئەوە لەم حاڵەتەشدا هەر تەیەمموی بۆ دەکرێ و نابێ ڕووت بکرێتەوە و بشۆردرێت .

---

* (المجموع / ج ٥، ص ١٧٨) ، و (المحلى / ج ٥، ص ١٢٢).

**لە کتێبی (المسوی) دا هاتووە لە ئیمام (مالیك) ە وە کەوا فەرموویەتی:** خۆی گوێی لە زانایان بووە کەوا فەرموویانە: ئەگەر ئافرەتێك لەناو کۆمەڵێك پیاودا مردو ئافرەتی تری لەگەڵدا نەبوو بیشۆرێت ، یا کەسێکی مەحرەمی لەگەڵدا نەبوو سەرپەرشتی شتنی بکات ، یا مێردی لەگەڵدا نەبوو بۆ سەرپەرشتی کردنی ، ئەوە دەبێ تەیەمومی پێ بکرێت و دەست و دەموچاوی بە گڵ مەسح بکرێت .

وە فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك مردو لە ئافرەت زیاتر کەسی تری لەگەڵدا نەبوو ، ئەوە دەبێ ئەو ئافرەتانە تەیەممومەکەی بۆ بکەن .

وە پێویستە مەحرەمی ئافرەتی مردوو بەدەستی خۆی تەیەممومەکەی بۆ بکات ، جا ئەگەر ئەو مەحرەمە دەست نەکەوت ئەوە بێگانەیەك بۆی بکات ، وە دەبێ پارچەیەك لە قوماش بئاڵێنێ لە دەستی تا بە دەستی ڕووتی دەستی بەرنەکەوێت ، ئەمەش مەزهەبی ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (ئەحمەد) ە .

**وە لای ئیمام (مالیك) و (شافیعی):** ئەگەر ئەو ئافرەتە کۆمەڵێك پیاوی مەحرەم بەخۆی لەگەڵدا بوو ئەوە یەکێ لەو مەحرەمانە دەیشۆرێت ، چونکە ئەو ئافرەتە بە گوێرەی ئەوەوە وەك پیاو وایە لە تەنیایی و عەورەتدا .

**بەڵام (ئیبنوحەزم) ڕای وایە:** ئەگەر پیاو مردو لە ئافرەت بەولاوە پیاوی لەگەڵ نەبوو ، یا ئافرەت مردو لە پیاو بەولاوە ئافرەتی لەگەڵدا نەبوو ، ئەوە دەبێ ئافرەتەکان پیاوەکە بشۆرن ، و پیاوەکان ئافرەتەکە بشۆرن ، بەڵام پۆشاکێکی ئەستووری بۆ لەبەر بکەن و لەسەر ئەو پۆشاکەوە ئاوی بکەن بەسەردا ، وە لە مردوو شۆردندا تەیەمموم دروست نیە مەگەر ئاو نەبێت .

**تەیەممومەکەش بەم جۆرە دەکرێ:**

دەست دەکێشێ بە زەویدا و پاشان دەست دەهێنێ بە دەم و چاوو هەردوو دەستی مردووەکەدا.

## ٩) سەبارەت بە خۆشۆردنی ئەوکەسەی مردوو دەشۆرێ

لـە لای زۆرێ لـە زانایـان موسـتەحەببە ئەگـەر کەسـێك مردوویـەکی شـۆری خـۆی بشوات:

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من غسل الميت فليغتسل ، ومـن حمله فليتوضأ ))[١٣٣] واتـە : هەر کەسێك مردووی شۆرد ، با خۆی بشوات ، وە هەر کەسێکیش هەڵی گرت ، با دەست نوێژ بگرێتەوە .

بەڵام هەنـدێ لـە زانایـان تانـەیان لـە سـەنەدی ئـەم حەدیـسە داوە ، (عـەلی کوڕی مەداینی) و (ئەحمەد) و (ابن المنذر) و (ڕافیعی) و چـەند کەسـی تـر فەرموویانـە: زانایانی (حديث) لەم بەشەدا هیچ حەدیسێکیان بە (صحيح) دانەناوە .

بەڵام حافظ (ئیبنوحەجەر) دەربارەی ئەم (حديث) ە دەفەرموێ: (ترمذی) بـە (حسن) ی داناوە ، وە (ابن حبان) یش بـە (صحيح) ، کەواتـە نکوڵی کردنـی (نـەوەوی) لـە تەحسین کردنەکەی (ترمذی) بەرپەرچ دراوەتەوە .

پێـشەوا (ذهـبي) یـش دەفـەرموێ: ڕێگاکـانی ئـەم حەدیـسە بـەهێزترە لـە چـەند حەدیـسێك کـە زانایـان بەڵگـەیان پـێ هێناوەتـەوە ، وە ئـەو فەرمانـەی کـە لـەم حەدیسەدایە لەسەر (ندب) پەسەندی دادەنرێت نەك (وجوب).

---

[١٣٣] صحيح - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (في الغسل مـن غـسل الميت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٣١٦١) ، هـەروەها (ابـن حبان) لـە کتـابی (الطهارة) ، بـابی : (نـواقض الوضـوء - ذكـر الأمـر بالوضـوء مـن حمـل الميـت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١١٧٧) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـە (سنن أبي داود / ج ٣ - ص ٢٠١ - ح ٣١٦١) ، و (جامع الترمذي / ج ٣ - ص ٣١٨ - ح ٩٩٣) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٦٤٠٢) دا فەرموویەتی : (صحيح) ە.

شێخ (ئـەلبانی) یـش لـە (تمـام المنـة/ ص ١٢١) دا لەسـەر ئـەم حەدیـسە دەفـەرموێ: بێگومان کە ئیسنادەکەی (صحیح) ە ، بەڵام هێنـانی حەدیـسەکە بـە وشـەی (روي) ناگونجێت لەگەڵ ئەوەی کـە زانایـانی حـەدیس لەسـەری ڕێـك کـەوتوون کـە وشـەی (روي) و وێنەی ئەو تەنها حەدیسی (ضعیف) ی پێ دەهێنرێت .

**وە ئەم فەرمانە لە (واجب) ەوە لا دەدرێت بۆ سوننەت:**

أ- لـە (ئیبنوعـەبباس) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( لـیس علـیکم في غـسل میـتکم غـسل إذا غـسلتموه ، فـإن میـتكم لـیس بـنجس فحـسبكم أن تغـسلوا أیـدیكم ))[١٣٤]

واتـە : خـۆ شـۆردنتان لـە سـەر نییـە لـە شـۆردنەوەی مردووەکەتانـدا ، چـونکە مردووەکەتان پیس نییە ، بەستانە تەنها دەستتان بشۆن .

ب- لـە (ئیبنوعومـەر) ە وە (خوایـان لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( كنا نغسل المیت فمنا من یغتسل ومنا من لا یغتسل ))[*]

واتە : ئێمە کاتێ مردوومان دەشۆری هەمان بوو دوایی خۆی دەشۆری و هەمان بوو خۆی نە دەشۆری .

---

[١٣٤] **حسن** – (حـاکم) لـە (مـستدرك) دا لـە کتـابی (الجنـائز) دا گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٣٦٣) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لـە کتـابی (الطهارة) ، بـابی : (الغسل مـن غـسل المیت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٣٥٢) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـە (أحكـام الجنـائز / ص ٥٣) دا بـە (حسن) ی داناوە .

[*] **صحیح** – (دارەقوتنی) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (التـسلیم في الجنـازة واحـدا) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٥٨٧) ، هـەروەها (بەیهـەقی) لـە (الـسنن الكـبرى) دا لـە کتـابی (الطهـارة) ، بـابی : (الغـسل مـن غـسل المیـت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٣٥٨) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـە (تلخیص أحكام الجنائز / ص ٣٢) ، و (تمام المنة / ص ١٢١) دا فەرموویەتی : (صحیح) ە.

**جومهوری ئەهلی عیلم لە هاوەڵان و تابیعین و دوای ئەوانیش ڕایان وایە: کە ئەوکەسەی** مردوو دەشۆرێ خۆشۆردنی لەسەر واجب نیە ، بەڵکو موستەحەببە بۆی*.

وە ئەم قسەیە لە هاوەڵان (ئیبنوعەبباس) و (ئیبنومەسعود) و (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) و (ئیبنوعومەر) و دایکە (عائیشە) وە بە سەنەدێکی صەحیح سابت بووە*.

**١٠) ئەگەر کەسێ نێژراو نەشۆرابوو***

**جومهوری زانایان لەوانە: ئیمام (مالیك) و (شافیعی) و (ئەحمەد) و (داودی ظاهری) و (ابن حزم) بۆ ئەوە چوون:** کەوا پێویستە مردووەکە لە گۆڕەکەی دەربکرێتەوە و بشۆرێ و پاشان بنێژرێتەوە .

**بەڵام ئیمام (ئەبوحەنیفە) دەفەرموێ:** پێویست ناکا ئەو مردووە لە دوای ئەوەی نێژرا و بە گڵ داپۆشرا دەربهێرێتەوە لە گۆڕەکەی .

---

* (الأم / ج ١، ص ٢٣٥) ، و (المجموع / ج ٥، ص ١٨٥) ، و (معالم السنن / ج ٢، ص ٥١٢).

* (الغسل والكفن / ص ١٢٠ - ١٢٥).

* (المجموع / ج ٥، ص ٣٠٠).

## دووەم: كفن كردنی مردوو

**١) حوكمەكەی:**

**جومهوری زانایان ڕایان وایە***: كە شتنی مردوو، وە كفن كردن و نوێژ لەسەركردن و ناشتنی فەرزی كیفایەیە ، واتە: ئەگەر كۆمەڵێك موسوڵمان پێی هەڵسان ئەوانی تر لەسەریان دەكەوێ و گوناهبار نابن .

**٢) ئەوەی پێویستە لە كفن كردنا بكرێ:**

**یەكەم: پێویستە ئەوكەسەی كفنی مردوو دەكا بەجوانترین شێوە كفنی بكات:**

لە (جابیر) ی كوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا كفن أحدكم أخاه ، فليحسن كفنه ))[١٣٥] واتە : كاتێ یەكێكتان برای موسوڵمانی خۆی كفن دەكا با بەجوانی كفنی بكا

* (المجموع لإمام النووي/ ج ٥، ص ١٢٨) ، و (الأم لإمام الشافعي/ ج ١، ص ٢٤٢) ، و (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١١٣) ، و (فتح الباري لحافظ ابن حجر/ ج ٣، ص ١٢٥).

[١٣٥] **صحيح** - (موسلیم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في تحسين كفن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨٢) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في الكفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٤٨)، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (الأمر بتحسين الكفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٩٤).

**دووەم: پێویستە ئەو کفن کردنە بە جۆرێ بێت کە هەموو لاشەی مردووەکە داپۆشێت:**

لە (خەبباب) ی کوڕی (ئەرەت) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( هاجرنا مع النبي (ﷺ) نلتمس وجه الله ، فوقع أجرنا على الله ، فمنا من مات لم يأكل من أجره شيئا ، منهم مصعب بن عمير ومنا من أينعت له ثمرته ، فهو يهدبها ، قتل يوم أحد ، فلم نجد ما نكفنه إلا بردة إذا غطينا بها رأسه خرجت رجلاه ، وإذا غطينا رجليه خرج رأسه ، فأمرنا النبي (ﷺ) أن نغطي رأسه ، وأن نجعل على رجليه من الإذخر ))[١٣٦]

واتە : کاتێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کۆچمان کرد ، مەبەستمان بەس ڕەزای خوا بوو ، ئیتر ئەجرو پاداشی باشمان کەوتە سەر خوا ، جا گەلێ کەسمان لێ مردو هیچی لە ئەجرو پاداشی خۆی لە دونیادا نەخواردوو ، گشتی برد بۆ قیامەتی ، یەکێ لەم خوا پێداوانەی کە ئەمە حاڵیان بوو ، کە مردووە (موصعەبی کوڕی عومەیر) بوو ، وە گەلێك کەسیشمان ماون و لە خوای گەورە بەزیاد بێت ، باخەکەیان خەملێوە و پەیتا پەیتا دەیڕنن ! (موصعەبی کوڕی عومەیر) کە لە غەزای (ئوحود) دا شەهید کرا ، یەك لۆ بەرگی لەپاش بەجێمابوو کە بریتی بوو لە عەبایەك ، ئەو عەبایەیان بۆ کرد بە کفن ، بەڵام ئەویش ئەوەندە نەبوو کە هەموو لەشی داپۆشێ ، ئەگەر دەیاندا بەسەر سەریدا قاچەکانی دەردەکەوتن ، وە ئەگەر دەیاندا بەسەر قاچەکانیدا سەری دەردەکەوت ! لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ)

---

[١٣٦] صحيح – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (إذا لم يجد كفنا إلا ما يواري رأسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٧٦) ، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی: (القميص في الكفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٠٧).

فەرمووی: سەری بە جلەکانی داپۆشن و پوشە سوورناتك (واتە: گیای ئیـذخـر) یـش بدەن بەسەر قاچەکانیدا .

**٣ ) ئەوەی سوننەتە لەکاتی کفن کردنا بکرێ:**

**یەکەم: سوننەتە کە لە سێ پارچەدا کفن بکرێت:**

لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویـەتی: (( کفـن رسول الله (ﷺ) في ثلاثة أثواب بيض سحولية ، من كرسـف ، لـيس فيها قميص ، ولا عمامة))[١٢٧] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سێ پارچە قوماشی لۆکەی سپی تـەنکی ناسك - کە لە ناوچەی (سحول) ی یەمەنیدا دروستکراوە - کفن کرا ، نە قەمیـسیان تێدا بوو ، نە مێزەر.

**پێشەوا (ترمذی) فەرموویەتی:** بەو پێیە کار کراوە لای بەشی زۆری زانایان و هـاوەڵان و کەسـانی تـریش ، وە فەرموویـەتی: **(سـوفیانی ثـوری) فەرموویـەتی:** پیـاو لـە سـێ کراسی ئاودامانـدا کفن دەکرێت ، جا ئەگەر حەز دەکەیت با کراسێك و دوو پارچـە قوماش بێت بۆ تێوە ئاڵاندن ، وە ئەگەر حەز دەکەیت هەر با سێ پارچە بێت .

**وە ئیمام (شافیعی) و (ئەحمـەد) و (ئیـسحاق) و کۆمـەڵێ لـە زانایـانی تـر فەرموویانـە:** موستەحەببە ئەگەر کەسێك دەسەڵاتدار بوو سێ کراسی بـۆ بکرێـت بـە کفـن ، وە فەرموویانە: کفنی ئافرەت دەبێ پێنج کراس بێت .

**بەڵام ئافرەت بە پێنج پارچە کفن دەکرێ:**

١- پشتە ماڵێ تا خوارەوە .

٢- سەرپۆشێك بۆ سەری .

٣- کراسێك بۆ بەشی سەرەوەی .

---

[١٢٧] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في كفن الميت) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٢١٧٦) ، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (١٧٢١٠).

٤ ، ٥- دوو پارچەکەی تریش بەکار دەهێنرێ بۆ کفن کردنی هەموو لاشەی .

(ئیبنومونذیر) فەرموویەتی*: زۆربەی ئەوکەسانەی کە زانیاریمان لێ وەرگرتوون لە زانایان ڕایان وابووە کە ئافرەت لە پێنج کراسدا کفن دەکرێت .

**دووەم: سوننەتە ڕەنگی کفنەکە سپی بێت:**

لە (ئیبنوعەبباس) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( البسوا من ثيابكم البياض فإنها من خير ثيابكم ، وكفنوا فيها موتاكم ))[١٣٨]

واتە : پۆشاکی سپی لەبەر بکەن ، چونکە باشترینی پۆشاکەکانتانە و ، مردووەکانیشتانی تێدا کفن بکەن.

**سێیەم: سوننەتە کفنەکە بۆن خۆش بکرێت بە بۆنی (میسك) یا (بوخورد):**

ئنجا هەندێکی بڵاودەکرێتەوە بەسەر هەندێکی تریدا ، پاشان لەسەر یەك ڕادەخرێت ، وە ئەگەر (حەنوط) هەبوو کە بۆنێکی تایبەتە بە مردوو ئەوە باشترە و دەخرێتە ناو بەینەکانیەوە.

---

* (المغني/ ج ٢، ص ٤٧٠) ، و (المجموع / ج ٥، ص ٢٠٥).

[١٣٨] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (اللباس) ، بابی : (في البياض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٠٦١) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يستحب من الأكفان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٤٤) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء فيما يستحب من الكفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٧٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابي داود / ج ٤ - ص ١٥١ - ح ٤٠٦١) ، و (مشكاة المصابيح / ج ١ - ح ١٦٣٨) ، و (صحيح الترغيب والترهيب / ج ٢ - ح ٢٠٢٦) دا فەرموویەتی : سەنەدەکەی (صحيح) ە.

لــە (ئەبوســەعید) ی خودرییــەوە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە کــەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( أطيـب طيـبكم المسك ))[139] واتە: باشترین بۆنی خۆشتان میسکە .

دەگێڕنــەوە کـەوا: (ئەبوسـەعیدی خـودری) و (ئیبنوعومـەر) و (ئیبنوعـەبباس) وەسێتیان کردووە کەوا کاتێ مـردن ، کفنـەکانیان بـە (عـود) بـۆن خـۆش بکرێـت .

وە ئەمە قسەی کۆمەڵێ لە زانایانی ئەهلی عیلمە* .

**چوارەم: پاشان مردووەکە لەسەر پشت ڕا دەکێشرێت:**

پاشان هەندێ لۆکەی بۆن خۆش دەخرێتە نێوان پاش و پێشیەوە تا بۆنی ناخۆشی لێوە دەرنەچێت.

**پێنجەم: موستەحەبە پـشتە ماڵێـك بـدا بەسـەر جەنازەکـەدا** ، بـۆ ئـەوەی عـەورەتی مردووەکە بشارێتەوە و دیار نەبێت .

**شەشەم: موستەحەبە کە (حەنوط) ە کە بکرێتە ئاستی دەم و چاوو لـووت و گـوێی و، هەروەها شوێنی سوجدەکەی** ، وە ئەگەر سەرجەم لاشەی مردووەکـە بـۆن خـۆش بکرێ هیچ زیانی نیە ، لەبەر ئەوەی هەندێ لە هاوەڵان کردوویانە .

---

[139] **صحيح** - (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (في المسك للميـت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣١٥٨) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (المسك) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٩٠٦) ، هەروەها (ابن خزيمـة) لـە کتـابی (المناسـك) ، بـابی : (الرخصة في التطيب عنـد الإحرام بالمسك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤٠٧) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە کتێبی (الأدب) دا ، بابی : (ما جاء في الطيب والمسك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٩) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـە (سـنن أبـی داود/ ج ٢، ص ٢٠٠، ح ٣١٥٨) ، و (سنن النسائی/ ج ٤، ص ٤٠، ح ١٩٠٦) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٩١٤) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

* (المغني/ ج ٢، ص ٤٦٤) ، و (المجموع / ج ٥، ص ١٩٧).

**حەوتەم: پاشان پارچەی یەکەم دەدرێت بەسەر لای ڕاستیدا ، پاشان لاکەی تری دەدرێ بەسەرلای چەپیدا.**

هەروەها بەو شێوە پارچەی دووەم و سێ یەم دەدرێ بەسەریا ، پاشان ئەو پشتە ماڵە کە درابوو بەسەر عەورەتیدا لادەبرێ ، پاشان لە حەوت شوێنەوە دەبەسرێت بۆ ئەوەی لە یەك جیا نەبێتەوە و جەنازەکەش گورج بێت ، پاشان زیادەی کفنەکە دەهێنیتەوە بەسەر سەر و قاچیا و بە جوانی دەیبەستیت.

پاشان لە ناو گۆڕەکەدا گرێی سەر و قاچی دەکەیتەوە ، جا ئەگەر هاتوو گرێکان لە حەوت گرێ کەمتر بوون ئەوە قەیناکا ، چونکە مەبەست لەو جۆرە بەستنە توونـد و تۆڵی جەنازەکەیە.

دروستە مردوو بە دوو پارچەش کفن بکرێت ، بەڵام ئەوەی کەلە پێشەوە باسمان کرد باشترە.

**دوو بابەتی تایبەت**

**یەکەم: دروستە شەهیدیش کفن بکرێت**

لە (جابیر) ی کوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) كفن حمزة بن عبد المطلب في نمرة في ثوب واحد ))[140] واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) (حەمزەی کوڕی عبدالمطلب) ی لەیەك لۆ شاڵی میلدارا کفن کرد .

---

[140] **حسن** – (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في كفن النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٩٧) ، هەروەها (ابن ابي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما قالوا في كم يكفن الميت ؟) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٨٧٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٣، ص ٣٢٢، ح ٩٩٧) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

**دووەم: دروستێتی ئامادەکردنی کفن لە پێش مردنا**

لە (سەهل) ی کوڕی (سەعد) ی ئەنصارییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( جاءت امرأة إلى النبي (ﷺ) ببردة ، فقال سهل للقوم: أتدرون ما البردة ؟ فقال القوم: هي الشملة ، فقال سهل: هي شملة منسوجة فيها حاشيتها ، فقالت: يا رسول الله (ﷺ)، أكسوك هذه ، فأخذها النبي (ﷺ) محتاجا إليها فلبسها ، فرآها عليه رجل من الصحابة ، فقال: يا رسول الله (ﷺ)، ما أحسن هذه ، فاكسنيها ، فقال: نعم ، فلما قام النبي (ﷺ) لامه أصحابه ، قالوا: ما أحسنت حين رأيت النبي (ﷺ) أخذها محتاجا إليها ، ثم سألته إياها ، وقد عرفت أنه لا يسأل شيئا فيمنعه ، فقال: رجوت بركتها حين لبسها النبي (ﷺ)، لعلي أكفن فيها ))[141]

واتە : ئافرەتێك بوردێكی چنراوی هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) چواردەوری چنرابوو ، (سەهل) دەفەرموێ: دەزانن (بوردە) چییە؟ وتیان: كەوایە ، فەرمووی: بەڵێ. پاشان دەفەرموێ: ئافرەتەكە وتی: بەدەستی خۆم چنیومە هێناومە لەبەری بكەیت، پێغەمبەر (ﷺ) لێی وەرگرت چونكە پێویستی پێی هەبوو ، هاتە دەرەوە كردبووی بە بەرگۆشی ، فلانەكەس بە جوانی زانی و وتی: بیدە بەمن ، چەند جوانە ، خەڵكەكە وتیان: چاكت نەكرد ، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی پێویستی پێی هەبوو ، بۆیە لەبەری كرد ، ئنجا تۆ داوات لێ كردو ئەشت زانی كە دەست نانێت بەڕوتەوە ، ئەویش وتی: سوێند بەخوا بۆ ئەوە داوام لێ نەكرد كە لەبەری

---

[141] **صحيح** – (بوخاری) لە كتابی (الأدب) ، بابی : (حسن الخلق والسخاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٠٣٦) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (من استعد الكفن في حال الحياة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣١٧) ، هەروەها (عبد بن حميد) لە (مسند) ە كەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (سهل بن سعد الساعدي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٦٣).

بکەم ، بەڵکو بۆ ئەوەی دایبنێم بیکەم بە کفن ، (سەهل) دەفەرموێ: کاتێ (ئەم پیاوە) مرد کردیان بە کفنی.

**(ابن حجر) ی عەسقەلانی فەرموویەتی:** ئەم (فەرموودەیە) سوودی ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە دروستە بەجێ هێنانی ئەو شتانەی کە پێویستە بۆ مردوو ، وەکو: کفن و شتر تر ، لەکاتی ژیانی ئەوکەسەدا ، وە ئایا ئامادەکردنی گۆڕیش دەبەسترێ بەوەوە ؟

**پاشان دەفەرموێ: (ابن بطال) فەرموویەتی:** ئەوە دروستی ئەوەشی تێدایە کە شت پێش کاتی پێویستی ئامادە بکرێت ، وە فەرموویەتی: کۆمەڵێك لە پیاوچاکان گۆڕیان بۆ خۆیان ئامادە کردووە پێش مردن .

**(زەینی کوڕی مونیر) بە شوێن ئەمەدا وتوویەتی:** ئەو کارە لەلایەن هیچ کەسێك لە هاوەڵانەوە نەکراوە کە گۆڕ بۆ خۆیان ئامادە بکەن ، وە ئەگەر ئەوە پەسەند بوایە، زۆر دەبوو لەناویاندا

**(عەینی) وتوویەتی:** بەوەی صەحابە نەیکردووە نابێتە هۆی نادروستی بە تایبەتی ئەگەر کۆمەڵێك لە زانایان کردبێتیان ، چونکە ئەوەی موسوڵمان بەچاکی بزانن ئەوە لای خواش چاکە

**ئیمام (ئەحمەد) فەرموویەتی:** خراپ نیە پیاو شوێنی گۆڕەکەی بکڕێت و وەسێتیان پێ بکات کاتێ مرد لەو شوێنەدا بنێژرێت ، وە دەگێڕنەوە کە (عوسمان) و (عائیشە) و (عومەری کوڕی عبدالعزیز) (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەوەیان کردووە.

٤) چەند حوكمێكی شەرعی لەبارەی كفنەوە:

**یەكەم: زیادەڕەوی كردن لە كفندا:**

كەراهەتی هەیە زیادەڕەوی بكرێت لە كڕینی كفن و هەڵبـژاردنی قوماشـی تایبـەت بۆ مـردووەكە .

أ- **(شەعبی) وتوویەتی:** (عەلی كوڕی ئەبی تاڵیب) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویـەتی: كفنـی گران بەهام بـۆ مەكـەن ، چونكە خـۆم گـوێم لـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـووە كـەوا فەرموویەتی: (( لا تغال لي في كفن ، فإني سمعت رسـول الله (ﷺ) يقـول: لا تغـالوا في الكفن ، فإنه يسلبه سلبا سريعا ))[142] واتە: كفنـی گـران بـەها مەكـەن ، چـونكە زوو لەبەریان دادەماڵرێ و دەڕزێ .

ب- لـە (صـیلە) ی كـوڕی (زوفــەر) ی عەبەسـییەوە (ڕەحمــەتی خــوای لێ بــێ) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( أرسلني حذيفة بن اليمـان ورجـلا آخـر نـشتري لـه كفنا ، فاشتريت له حلة حمراء جيدة بثلاث مائة درهم ، فلما أتيناه قـال: أرونـي مـا اشـتريتم؟ فأرينـاه ، فقـال: ردوهـا ، ولا تغـالوا في الكفـن ، اشـتروا لـي ثـوبين أبيـضين نقيين ))[143] واتە: (حوزەیفەی كوڕی یـەمان) مـن و پیـاوێكی تـری نـارد تـا قوماشـی كفنی بۆ بكڕین ، جا پۆشاكێكی سووری چاكم بـۆ بكـڕی بـە نرخـی (٣٠٠) درهـەم ، جا كاتێ هاتینەوە بۆلای فـەرمووی: ئـادەی پێمـی نیـشانبەن بـزانم چیتـان كڕیـوە؟

---

[142] **ضعیف** – (ئەبوداود) لە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (كراهيـة المغـالاة في الكفـن) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٣١٥٤) ، هەروەها (بەیهەقی) لـە (الـسنن الـصغیر) دا لـە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (التـكفين والتحنيط) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨١٩) ، هـەروەها شێخ (ئـەلبانی) لـە (سـنن أبـی داود/ ج ٣، ص ١٩٩، ح ٣١٥٤) ، و (ضـــعيف الجـــامع الـــصغير/ ح ٦٢٤٧) ، و (مـــشكاة المـــصابيح/ ج ١، ح ١٦٣٩) دا فەرموویەتی: (ضعیف) ە.

[143] (عبـدالرزاق) لـە (مـصنف) ە كەیـدا لـە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (ذكـر الكفـن والفساطيط) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٠٠٨).

ئێمەش پیشانمان دا ، ئەوجا فەرمووی: برۆن بیبەرنەوە ، وە زیادەڕەوی لە کفندا مەکەن ، بەڵکو دوو کراسی سپی پاکم بۆ بکرن .

ج- هەروەها بڕوانە حەدیسەکەی دایکە (عائیشە) کە لە باسی وەسێتی مردوو لە بارەی کفن کردن و نوێژلەسەرکردنی هێناومانە .

**دووەم: ئایا قوماشی ئاوریشم دەکرێ بە کفن؟**

دروست نیە پیاو لە قوماشی ئاوریشم کفنی بۆ بکرێت ، بەڵام بۆ ئافرەت دروستە.

بەڵام زۆر لە زانایان بە خراپی دەزانن بۆ ئافرەتیش ، چونکە دەست بڵاوی و بە فیڕۆدانە ، وە ئەو زیادەڕەوییەیە کە قەدەغەیە لە ئیسلاما ، وە ئەومیان جیا کردۆتەوە کە ئاوریشم لە ژیاندا بۆ خۆڕازاندنەوە و جوانی بێت بۆ ئافرەت ، لەگەڵ ئەوەی کاتێ مرد بکرێت بە کفنی* .

**ئیمام (ئەحمەد) فەرموویەتی:** پێم خۆش نیە ئافرەت کفنی لە ئاوریشم بۆ بکرێت ، هەتا حەزناکەم پارچەیەکی کەمیش بە کفنەکەیەوە بێت ، هەروەها (حەسەنی بەصری) و (ئیبنوموبارەك) و (ئیسحاق) یش بە خراپیان داناوە .

**(ئیبنومونذیر ) فەرموویەتی:** پێچەوانەی ئەو قسەی ئەوانم لە کەسەوە لەبەر نیە .

**سێیەم: واباشە لە پارەی مردووەکە کفنەکە بکڕدرێت:**

ئەویش لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی لە بارەی ئەو پیاوەی کە بە موحریمی مرد: (( وکفنوه في ثوبيه ))[144] واتە: بە بەرگ و جلەکانی خۆی کفنی

---

* (المجموع / ج ٥، ص ١٩٧).

[144] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (کیف یکفن المحرم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٦٧) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الحج) ، بابی : (ما یفعل بالمحرم إذا مات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٨٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (مناسك الحج) ، بابی: (تخمير المحرم وجهه ورأسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧١٢) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (المناسك) ، بابی : (المحرم يموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٨٤).

بکەن . کەواتە پارەی کفنەکەی پێش قەرز و وەسیەت و میراتەکەی دەکەوێت ، ئەمەش ڕاو بۆچوونی زۆربەی ئەهلی عیلمە*.

جا ئەگەر پارەی کفنی نەبوو ئەوە ئەوکەسە بۆی دەدات کە نەفەقەی لەسەریەتی، ئەمانیش بە (ئەصڵ) و (فەرع) ە وە ، وەکو باوك و باپیر و کوڕ و کوڕەزا ، ئەگەر هەر نەبوو ئەوە لە (بیت المال) پێویستە بۆی بکرِدرێت ، ئەگەر لە (بیت المال) یشدا پارە نەبوو ئەوە لە ناو موسوڵمانانندا لەسەر شانی ئەوکەسە پێویستە کە بە حاڵی بزانێت.

**بێگومان ئافرەتیش لەمەدا وەکو پیاو ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرێت:**

**(ئیبنوحەزم) فەرموویەتی***: کفن و هەڵکەندنی گۆڕی ئافرەت دەبێ لەو ماڵە بێت کە بەجێی هێشتووە و لەسەر پیاوەکەی پێویست نیە ، چونکە سامان و ماڵی موسوڵمانان پارێزراوە بە دەقی ئایەت و فەرموودە نەبێت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: (( إن دماؤكم وأموالم حرام عليكم ، كحرمة يومكم هذا ، في شهركم هذا، في بلدكم هذا، ..))[145] واتە: بەڕاستی خوێنتان و ماڵتان لەسەر یەکتری حەرامە، وەکو حەرام بوونی ئەم ڕۆژە ، لەم مانگەدا ، لەم وڵاتەدا .

---

* (الأم / ج ١، ص ٢٣٦) ، و (المجموع/ ج ٥، ص ٣٠٠) ، و (المحلى/ ج ٥ ، ص ١٢١) ، و (الغسل والكفن/ ص ١٥٠).

* (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١٢٢).

[145] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی : (الحج) ، بابي : (حجة النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٤١) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی : (المناسك) ، بابي : (صفة حجة النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٠٥) و (١٩٠٩) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی : (المناسك) ، بابي : (حجة رسول الله (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٧٤).

**بەڵام هەندێ لە زانایان دەفەرموون: مێردەکەی بەرپرسە لە دابین کردنی کفن و ئامادەکردنی تەرمەکەی هەتا دەنێژرێت***

## بابەتێکی تایبەت

## باسکردنی چاکەی مردوو ،وە دوورکەوتنەوە لە قسەوتن پێی

لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( ذكر عند النبي (ﷺ) هالك بسوء فقال: لا تذكروا هلكاكم إلا بخير ))[١٤٦] واتە : لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بە خراپ ناوی مردوویەکیان هێنا ، فەرمووی: بەچاکە نەبێ باسی مردووی خۆتان مەکەن .

---

* (المجموع / ج ٥، ص ١٨٨) ، و (فقه السنة للنساء / ص ١٨٩).

[١٤٦] **صحيح** – (نەسائی) لە (السنن الصغرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النهي عن ذكر الهلكى إلا بخير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٣٥) ، هەروەها (هناد بن السري) لە کتێبی (الزهد) دا ، بابی : (من كره سب الموتى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٥٧) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٤، ص ٥٣، ح ١٩٣٥) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٧٢٧١) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

## سێیەم: نوێژکردن لەسەر مردوو

**١) حوکمەکەی:**

**جومهوری زانایان ڕایان وایە*** : کە شتنی مردوو، وە کفن کردن و نوێژ لەسەرکردن و ناشتنی فەرزی کیفایەیە ، واتە: ئەگەر کۆمەڵێك موسوڵمان پێی هەڵسان ئەوانی تر لەسەریان دەکەوێ و گوناهبار نابن .

**٢) فەزڵ و گەورەیی نوێژ لەسەر مردوو:**

أ- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من شهد الجنازة حتى يصلي ، فله قيراط ، ومن شهد حتى تدفن كان له قيراطان ، قيل: وما القيراطان ؟ قال: مثل الجبلين العظيمين ))[١٤٧] واتە : هەرکەسێ لەگەڵ تەرمێکا بێ تا نوێژی لەسەر دەکا (قیراط) ێکی بۆ هەیە ، وە هەرکەسێ لەگەڵیا بێ هەتا دەنێژرێ ئەوە دوو (قیراط) ی بۆ هەیە ، وترا: ئەوە دوو (قیراط) ە چەند دەبن؟ فەرمووی: بە قەد دوو کێوی گەورە دەبن .

---

* (المجموع لإمام النووي/ ج ٥، ص ١٢٨) ، و (الأم لإمام الشافعي/ ج ١، ص ٢٤٣) ، و (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١١٣) ، و (فتح الباري لحافظ ابن حجر/ ج ٣، ص ١٢٥).

[١٤٧] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من انتظر حتى تدفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٢٥) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ثواب من صلى على جنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٩٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في ثواب من صلى على جنازة ومن انتظر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٣٩).

ب- لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من صلى على جنازة ولم يتبعها فله قيراط ، فإن تبعها فله قيراطان ، قيل: وما القيراطان ؟ قال: أصغرهما مثل أحد ))[١٢٨]

واتە: هەر کەسێك نوێژ لەسەر جەنازە بکات و شوێنی نەکەوێت ئەوە (قـیراط) ێـك چاکەی بـۆ دەنووسـرێت ، جا ئەگـەر شوێنیـشی بکـەوێت ئـەوە دوو (قـیراط) ی بـۆ هەیە ، جا وتیان : دوو (قـیراط) چـی یـە؟ فـەرمووی: بـچووك ترینیـان وەك کێـوی (ئوحود) ە .

**٣ ) مەرجەکانی نوێژی مردوو:**

**یەکەم:** پاك و خاوێنی تەواو لە لەشگرانی و بێ دەستنوێژی .

**دووەم:** داپۆشینی شەرمگا (عەورەت).

**سێیەم:** ڕووکردنە قیبلە .

**٤ ) پایەکانی نوێژی مردوو:**

**یەکەم: نییەت هێنان:**

بێگومان نوێژیش وەکو تەواوی عیبادەتەکانی تر بـەبێ نییـەت هێنـان دانامـەزرێ ، حەقیقـەتی نییـەتیش ئـەو ویـستەیە کـە بـەرەو کارێـك ناڕاسـتە دەکـرێ ، لەبـەر ڕەزامەندی خوا و مل کەچ بوون بۆ فەرمانەکانی ، کەواتە نییەت کارێکە تەنها هـی دڵە و پەیوەنـدی بـە زمانـەوە نییـە ، لـەم بـارەوە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ (البينة / ٥)

---

[١٢٨] **صحیح** - (موسلیم) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (فـضل الـصلاة علـى الجنـازة واتباعهـا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨٩).

واته : بێگومـان ئەوانـه - واتـه نامـەدارەکان - فـەرمانیان پێ نـەدراوه لـه نامـەکانی خۆیاندا تەنها بۆ ئەمە نەبێت کە تەنیا خوای پەروەردگار بپەرستن - و جگـە لـەو کەسـی تـر نـه پەرسـتن ، وه لـه هـەموو بـاروو ڕوویەکـەوە پـاك و خـاوێن گـەری ئایینەکەیان بن بۆ خواو، بە دڵسۆزیەوە بیپەرستن .

وه لـه (عومـەر) ی کـوڕی (خـەتاب) ه وه (خـوای لێ ڕازی بێـت ) دەگێڕنـەوە کـەوا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: (( إنما الأعمـال بالنيـات ..)) [149] واتـه : بەڕاسـتی هەموو کارو کردەوەکان بە نییەتە .

**وه شوێنی نییەت دڵه :**

**شێخی ئیسلام (ابن تيمية) دەفەرموێ**[*] : شوێنی نییـەت دڵـه بـەبێ بـەکارهێنانی زمان بە یەکڕایی هەموو پێشەوایانی موسوڵمانان لە سەرجەم پەرستش و عیبادەتەکاندا، وەك: دەستنوێژگرتن و خۆشۆردن و نوێـژکردن و زەکاتـدان و ڕۆژووگـرتن و حـەج کردن و بەندە ئازاد کردن و جیهاد و غەیری ئەمانه ...

---

[149] **صحيح** - (بوخاری) له کتابی : (في بدء الوحي) ، بابی : (كيف كان بـدء الـوحي إلى رسـول الله) ، گێڕاویەتـەوە بـه ژمـاره (١) ، هـەروەها لـه کتـابی : (الإيمـان) ، بـابی : (مـا جـاء إن الأعمـال بالنيـة والحسبة ولكـل امـرئ مـا نـوى) گێڕاویەتـەوە بـه ژمـاره (٥٤) ، هـەروەها (موسـليم) لـه کتـابی : (الإمارة) ، بابی : قوله (ﷺ) (إنما الأعمال بالنية) گێڕاویەتەوە بـه ژمـاره (٤٩٠٤) ، هـەروەها (ئـەبو داود) له کتابی : (الطلاق) ، بابی : (فيما عني به الطلاق والنيات) گێڕاویەتەوە بە ژمـاره (٢٢٠١) ، هەروەها (ترمذی) له کتابی : (فضائل الجهاد) ، بابی : (فـيمن يقاتـل ريـاء وللـدنيا) گێڕاویەتـەوە بـه ژمـاره (١٦٤٧) ، هـەروەها (نەسـائی) لـه کتـابی : (الطهـارة) ، بـابی : (النيـة في الوضـوء) گێڕاویەتـەوە بـه ژمـاره (٧٥) ، هـەروەها (ابـن ماجـه) لـه کتـابی : (الزهـد) ، بـابی : (النيـة) گێڕاویەتەوە بە ژماره (٤٢٢٧).

[*] (مجموعة الرسائل الكبرى / ج ١ - ص ٢٤٣).

**دووەم: وەستان بەپێوە:**

لەلای جومهوری زانایـان وەسـتان بـەپێوە بـۆ کەسـێك کـە توانـای وەسـتانی هـەبێت پایەیەکـە لـە پایـەکانی نوێـژی مـردوو ، جا هەرکـەس بـە سـەر شـتێکەوە بێـت یا دانیشتبێت بەبێ بەهانە و نوێژ لەسەر مردوو بکات ئەوە نوێژەکەی دروست نیە .

**لە کتێبی (المغنی) دا هاتووە:** نوێژکردن لەسەر مردوو لەکاتی سواریدا دروست نیە ، چـونکە بـەپێوە وەسـتان کـە واجبـە لـە دەسـت دەچـێت ، ئەمـەش قـسەی ئیمـام (ئەبوحەنیفە) و (شافیعی) و (أبي ثور) ە، وە نازانم لەم بارەیەوە جیاوازی هـەبێت لە نێوان زانایاندا.

## بابەتێکی تایبەت

### ئایا دروستە دوعای ( إستفتاح ) بخوێنرێ*

**جومهوری زانایان لە ئەهلی عیلم بۆ ئەوە چوون:** کە دروست نیە دوعای (إستفتاح) لە نوێژی جەنازەدا بخوێنرێت .

**وە (شافیعیەکان ) و (حەنبەلیەکان) فەرموویانە:** (الله أكبر) ی نوێژدابەستن دەکا ، پاشان (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) دەکاو، پاشان سورەتی (فاتیحە) دەخوێنێت .

**بەڵام (سوفیانی ثوری) فەرموویەتی:** دەتوانێ دوعای (إستفتاح) بخوێنێ ، وە ئەم قسەیە بە هەمان شێوە لە ئیمام (ئەحمەد) یشەوە گێڕدراوەتەوە .

**سێیەم: کردنی چوار (الله أکبر):**

لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) نعى النجاشي في اليوم الذي مات فيـه خـرج إلى المصلى ، فصف

---

* (المجموع / ج ٥، ص ١٩٣) ، و (المغني/ ج ٢، ص ٤١٠).

بهـم وكـبر أربعـا ))[150] واتــه: پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) هــەواڵی مردنــی (نەجاشـی) بڵاوكـردەوە لـەو ڕۆژەدا كـە تێیـدا وەفـاتی كـرد ، جـا دەرچـوو بـۆ (موصەڵلا) و خەڵكەكەی ڕیز كرد و چوار (الله أكبر) ی لەسەر كرد.

پێشەوا (ترمذی) فەرموویەتی: كار لەسەر ئەوە كراوە لەلایەن بەشی زۆری زانایان لـە هاوەڵەكانی پێغەمبەرو (ﷺ) دوای ئەوانیش ، وە ڕایان وا بووە كـە (الله أكبر) كـردن لەسەر مردوو چوار (الله أكبر) ە ، ئەمەش قسەی ئیمام (مالیك) و (سوفیانی ثـوری) و (ئیبنوموبارەك) و (شافیعی) و (ئەحمەد) ە .

**چوارەم: خوێندنی سورەتی فاتیحە:**

لەبارەی حوكمی خوێـندنی سـورەتی (فاتیحـە) وە لـە نوێـژی جـەنازەدا زانایـان دوو ڕای جیاوازیان هەیە* :

**١) خوێندنی فاتیحە پێویستە:**

ئەمەش مەزهەبی ئیمام (شافیعی) و (ئەحمەد) و (ئیـسحاق) و (داودی ظاهری) و (ابــن حــزم) ە ، وە هــەروەها قــسەی (ئیبنوعــەبباس) و (ئــەبی ئومامــە) یــە ، بەڵگەشیان:

أ- گشتێتی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) كە دەفەرموێ: (( لا صلاة لمـن لم يقـرأ بفاتحة الكتاب ))[151] واته : نوێژ نییە بۆ كەسێك كە سورەتی (فاتیحە) نەخوێنێت .

---

[150] صـحیح - (بوخـاری) لـە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (الرجـل ينعـى إلى أهـل الميـت بنفـسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤٥) ، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في التكبير على الجنـازة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٢٠١) ، هـەروەها (ئـەبوداود) لـە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (في الصلاة على المسلم يموت في بلاد الشرك) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣٢٠٤) ، هـەروەها (نەسائی) لـە كتابی (الجنائز) ، بابی : (الصفوف على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٧٠).

* (المجموع / ج ٥، ص ١٩١) ، و (المغني/ ج ٣، ص ٤١١) ، و (المحلى/ ج ٥، ص ١٣١) ، و (ابن عابدين/ ج ١، ص ٦١١) ، و (زاد المعاد/ ج ١، ص ١٩٢) ، و (بداية المجتهد/ ج ١، ص ١٨٨).

ب- لە (تەڵحە) ی کوڕی (عبدالله) ی کوڕی (عەوف) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( صليت خلف ابن عباس رضي الله عنهما على جنازة ، فقرأ بفاتحة الكتاب . قال: ليعلموا أنها سنة ))[152]

واتە: لەسەر تەرمێ لە پشتی (ئیبنوعەبباس) ە وە نوێژم کرد ، جا سورەتی (فاتیحە) ی تیا خوێند ، وە (ئیبنوعەبباس) فەرمووی: بۆیە وام کرد تا موسوڵمانان بزانن کە خوێندنی (فاتیحە) لە نوێژی مردوودا سوننەت و ڕەفتاری پێغەمبەرە (ﷺ).

لە گێڕانەوەیەکی ترا دەفەرموێ: (( صليت خلف ابن عباس على جنازة ، فقرأ بفاتحة الكتاب ، وسورة وجهر حتى أسمعنا ، فلما فرغ أخذت بيده ، فسألته فقال: سنة وحق ))[153] واتە : لە پشتی (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) نوێژم

---

[151] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الأذان)، بابی: (وجوب القراءة للإمام والمأموم في الصلوات كلها في الحضر والسفر، وما يجهر منها وما يخافت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٥٦)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الصلاة)، بابی: (وجوب قراءة الفاتحة في كل ركعة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٧٢)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الصلاة)، بابی: (من ترك القراءة في صلاته بفاتحة الكتاب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٢٢)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الصلاة)، بابی: (ما جاء أنه لا صلاة إلا بفاتحة الكتاب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤٧)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الإفتتاح)، بابی: (إيجاب قراءة فاتحة الكتاب في الصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩١٠)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (إقامة الصلاة والسنة فيها)، بابی: (القراءة خلف الإمام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٣٧).

[152] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (قراءة فاتحة الكتاب على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٣٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يقرأ على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩٨) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الدعاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٨٧).

[153] **صحيح** - (نەسائی) لە (السنن الصغرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الدعاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٨٧) ، هەروەها لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الدعاء) گێڕاویەتەوە

کرد لە سەر جەنازەیەك ، جا سورەتی (فاتیحە) و سورەتێکی تری خوێندەوە ، وە دەنگیشی بەرزکردەوە تاوەکو بیستمان ، جا فەرمووی: من دەنگم بەرز کردەوە بۆ ئەوەی بزانن کەوا ئەمەی کردم سوننەتە و حەققە .

ج- لە (ئەبی ئومامە) ی باهیلییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( السنة في الصلاة على الجنازة أن يقرأ في التكبيرة الأولى بأم القرآن مخافتة ، ثم يكبر ثلاثا ، والتسليم عند الآخرة ))[154]

واتە : لە نوێژکردن لەسەر جەنازەدا سوننەتە لە دوای (الله أكبر) ی یەکەم بە نهێنی سورەتی (فاتیحە) بخوێنیت ، پاشان سێ (الله أكبر) ی تر دەکەیت ، وە لەدوا (الله أكبر) یشدا سەلام دەدەیتەوە .

**٢) خوێندنی پێویست نیە و هیچ سورەتێکی تری قورئانی تێدا ناخوێندرێ:**

**(ابن المنذر)** فەرموویەتی: (( ... ، وقالت طائفة: ليس في الصلاة على الجنائز قراءة ، هذا قول ابن سيرين ، وطاوس ، وعطاء ، وسعيد بن جبير ، وسعيد بن المسيب ،

---

بە ژمارە (٢٠٩٠) ، هەروەها (ئەبی یەعلا) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (أول مسند ابن عباس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٠٠) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٤، ص ٧٤، ح ١٩٨٧) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٥٣) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[154] **صحيح** – (نەسائی) لە (السنن الصغری) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الدعاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٨٩) ، هەروەها (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القراءة والدعاء في الصلاة على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٢٠) ، هەروەها (ابن ابي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (ما يبدأ به بالتكبيرة الأولى في الصلاة عليه والثانية والثالثة والرابعة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١١٨٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الصغری) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٥٠) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٤، ص ٧٥، ح ١٩٨٩) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٥٣) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

والشعبي، ومجاهد ، والحكم ، وحماد ، ومالك بن أنس ، وسفيان الثوري ، وأصحاب الرأي ))* واتە : كۆمەڵێ لە زانایانی تریش فەرموویانە: لە نوێژكردن لەسەر تەرمی مردوودا هیچ جۆرە قورئان خوێندنێكی تێدا نیە ، ئەمەش قسەی (ابن سیرین) و (طاوس) و (عەطا) و (سەعیدی كوڕی جوبەیر) و (سەعیدی كوڕی موسەییب) و (شەعبی) و (موجاهید) و (حەكەم) و (حەمماد) و (مالیكی كوڕی ئەنەس) و (سوفیانی ثوری) (ئەهلی ڕەئی) یە .

هەروەها ئەمە مەزهەبی (ئەوزاعی) و (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) ە ، وە لە هاوەڵانیشا ئەمە قسەی (ئیبنوعومەر) و (عوبادەی كوڕی صامیت) ە ، بەڵگەشیان:

أ- لەلای ئیمام (مالیك): خەڵكی مەدینە لە نوێژی جەنازەدا قورئانیان نەخوێندووە.

ب- لە (نافیع) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( أن عبد الله بن عمر كان لا يقرأ في الصلاة على الجنازة ))[155] واتە: (ئیبنوعومەر) لە نوێژكردن لەسەر تەرمی مردوودا قورئانی نەدەخوێند .

---

* (ابن المنذر) لە كتێبی (الأوسط) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ذكر اختلاف أهل العلم في قراءة فاتحة الكتاب في الصلاة على) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٧٩).

[155] صحيح - (مالیك) لە كتێبی (موطا) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يقول المصلي على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٧) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە كەیدا لە كتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (من قال ليس على الجنازة قراءة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٤٠٤) ، هەروەها (ابن المنذر) لە كتێبی (الأوسط) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ذكر اختلاف أهل العلم في قراءة فاتحة الكتاب في الصلاة على) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٧٩).

**پێنجەم: صلاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ):**

لە (سەعید) ی کوڕی (ئەبوسەعید) ی مەقبەرییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( سأل أبا هريرة كيف تصلي على الجنازة ؟ فقال أبو هريرة: أنا ، لعمر الله أخبرك . أتبعها من أهلها . فإذا وضعت كبرت ، وحمدت الله . وصليت على نبيه . ثم أقول: اللهم إنه عبدك وابن عبدك وابن أمتك ، كان يشهد أن لا إله إلا أنت . وأن محمدا عبدك ورسولك . وأنت أعلم به. اللهم إن كان محسنا ، فزد في إحسانه . وإن كان مسيئا ، فتجاوز عن سيئاته . اللهم لا تحرمنا اجره ، ولا تفتنا بعده ))[١٥٦]

واتە: پرسیارم کرد لە (ئەبوهورەیرە) لەسەر تەرمی مردوو چۆن نوێژ دەکەی؟ (ئەبوهورەیرە) فەرمووی: بەخوا بەچاکی پێت دەڵێم: لەلای کەسوکاری مردووەکە شوێنی تەرمەکەی دەکەوم هەتا دایدەنێن لەسەر زەوی، ئەوجا (الله أكبر) ی نوێژ دابەستن دەکەم و ، سوپاس و ستایشی خوا دەکەم بە خوێندنی سورەتی (فاتیحە) و، صلاوات دەدەم لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ، ئنجا دەڵێم: ئەی خوایە ! ئەمە بەندەی خۆتە و ، کوڕی بەندە و کەنیزەکی خۆتە ، ئەمە شایەتی دەدا کە جگە لە تۆ خوایەکی تر نیە، وە (محمد) بەندە و پێغەمبەری تۆیە ، وە خۆت لە هەموو کەسێ باشتر ئاگات لە حاڵیەتی ، ئەی خوایە! ئەم مردووە ئەگەر خۆی باشە ئەوا باشتری

---

[١٥٦] **صحیح** - (مالیک) لە کتێبی (موطأ) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يقول المصلي على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٥) ، هەروەها (عبدالرزاق) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القراءة والدعاء في الصلاة على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢١٧) ، هەروەها (تەبەرانی) لە کتێبی (الدعاء) دا ، بابی : (القول في الصلاة على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٠٢) ، هەروەها (إسماعيل بن إسحاق) لە کتێبی (فضل الصلاة على النبي (ﷺ) ) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (فضل الصلاة على النبي (ﷺ)/ ص ٧٨ ، ح ٩٣) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

بۆ بکە، وە ئەگەر خۆی خراپە ئەوا چاو پۆشی لێ بکە و چاو بپۆشە لە خراپەکانی، خوایە ! لە پاداشی ئەو بێ بەشمان مەکە و، لە پاش ئەویش گیرۆدەمان مەکە و بە تاقی کردنەوەی سەخت تاقیمان مەکەرەوە !

**پێشەوا (ترمذی) فەرموویەتی:** هەندێ لە زانایانی صەحابە بەوە کاریان کردووە و ، جگە لەوانیش زانایانی تریش هەر لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون ، وە ئەوەیان هەڵبژاردوە کە سورەتی فاتیحە دوای تەکبیرەی یەکەم بخوێنرێت ، ئەمەش قسەی ئیمام (شافیعی) و (ئەحمەد) و (ئیسحاق) ە.

**وە هەندێکیان فەرموویانە:** سورەتی فاتیحە لە نوێژی مردوودا ناخوێنرێت ، بەڵکو نوێژی مردوو بریتیە لە ستایش کردنی خوا و صلاواتدان لەسەر پێغەمبەرو (ﷺ) پاڕانەوەیە بۆ مردووەکە ، ئەمەش قسەی (سوفیانی ثوری) و چەند کەسێکی ترە لە (کوفیەکان).

**شێوازی صلاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ):**

بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی صلاوات ، صلاوات بدرێت لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دروستە ، تەنانەت بشڵێی: (اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد) هەر دروستە، بەڵام شوێن کەوتنی ئەوەی کەلە خودی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان ماوەتەوە چاکترە، ئەویش بریتیە لە صلاواتی ئیبراهیمی: (( اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد، کما صلیت علی إبراهیم وعلی آل إبراهیم إنك حمید مجید ، اللهم بارك علی محمد وعلی آل محمد کما بارکت علی إبراهیم وعلی آل إبراهیم إنك حمید مجید )).

**شەشەم: پاڕانەوە بۆ مردووەکە:**

بە (إتفاق) ی زانایان پاڕانەوەش یەکێکە لە پایەکانی نوێژی مردوو، ئەویش بە بەڵگەی: لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (( إذا صلیتم علی المیت ، فأخلصوا لە

الدعاء ))[157] واتە: ئەگەر نوێژتان لەسەر مردوو كرد ، ئەوا بە دڵ و بە گیان بۆی بپاڕێنەوە.

جا نزاو پاڕانەوە بۆ مردووەكە هەر چەند كەمیش بێت دێتە دی و بەجێ دێت ، بەڵام وا چاكە بەیەكێ لەو نزاو پاڕانەوەوانە بێت كەلە فەرموودەكاندا هاتوون ، لەوانە:

١- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( صلى رسول الله (ﷺ) على جنازة ، فقال: اللهم اغفر لحينا ، وميتنا ، وصغيرنا ، وكبيرنا ، وذكرنا وأنثانا ، وشاهدنا وغائبنا ، اللهم من أحييته منا فأحيه على الإيمان ، ومن توفيته منا فتوفه على الإسلام ، اللهم لا تحرمنا أجره ، ولا تضلنا بعده ))[158] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر تەرمێ كرد و فەرمووی: خوایە لە زیندوو مردوو ، گەورە و بچووك و، نێر و مێ و، ئامادە بوو ئامادە نەبوومان خۆشببە ، خوایە ئەوەمان كە بە زیندوویی هێڵاوتەتەوە لەسەر باوەڕ بیهێڵێتەوە، وە ئەوەشمان كە دەمرێنی لەسەر ئیسلام بیمرێنە، خوایە لە پاداشتی ئەم مردووە بێ بەشمان مەكە، و لە دوای ئەوەش گومڕامان مەكە.

٢- لە (عەوف) ی كوڕی (مالیك) ی ئەشجەعیەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( سمعت النبي (ﷺ) على جنازة يقول: اللهم ، اغفر له وارحمه،

---

[157] حسن - (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (الدعاء للميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩٩)، هەروەها (ابن ماجە) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في الدعاء في الصلاة على لجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٩٧).

[158] صحيح - (ئەبوداود) لە كتابی (الجنازة) ، بابی : (الدعاء للميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٢)، هەروەها (ابن ماجە) لە كتابی (الجنازة) ، بابی : (ما جاء في الدعاء في الصلاة على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٩٨) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود / ج ٢ - ص ٢١١ - ح ٣٢٠١) ، و (سنن ابن ماجە / ج ١ - ص ٤٨٠ - ح ١٤٩٨) دا فەرموویەتی : (صحيح) ە.

واعف عنه وعافه ، وأكرم نزله ، ووسع مدخله ، واغسله بماء وثلج وبرد ، ونقه من الخطايا كما ينقى الثوب الأبيض من الدنس ، وأبدله دارا خيرا من داره ، وأهلا خيرا من أهله ، وزوجا خيرا من زوجه ، وقه فتنة القبر وعذاب النار ، قال عوف: فتمنيت أن لو كنت أنا الميت ، لدعاء رسول الله (ﷺ) على ذلك الميت ))[159]

واته: بیستم پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر تەرمێ نوێژی دەکرد و دەیفەرموو : خوایە لێی خۆشبە و بەزەییت پێیدا بێتەوە و ، لێی ببورە و بیپارێزە ، وە ڕێزی لێ بگرە و شوێنی چاك بکە ، وە بیشۆرەوە لە گوناهەکانی بە ئاوو بەفر و تەرزە، وە پاکی بکەرەوە وەك چۆن جل و بەرگی سپی لە چڵك پاك دەکرێتەوە، وە ماڵێکی بدەرێ لە ماڵەکەی دونیای باشتر بێت ، وە کەس و کارێك لەکەس و کاری خۆی باشتر ، وە ژنێك لە ژنەکەی خۆی باشتر، وە بیپارێزە لە فیتنەی گۆڕ و سزای دۆزەخ. (عەوف) دەفەرموێ: جا ئاواتە خواز بووم کە ئەو مردووە من بوومایە ، بۆ ئەو نزایەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی کرد.

٣- لە (عەلی) کوڕی (شەمماخ) ەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (مەڕوان) پرسیاری کرد لە (ئەبوهورەیرە) (خوای لێ ڕازی بێت) کە چیت بیستووە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەی نوێژی جەنازەوە کەوا فەرموبێتی؟ (ئەبوهورەیرە) ش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: فەرموویەتی:

---

[159] صحيح - (موسليم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الدعاء للميت في الصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٣١) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنازة) ، بابی : (ما يقول في الصلاة على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٢٥) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الطهارة) ، بابی : (الوضوء بماء البرد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢).

(( اللهم أنت ربها، وأنت خلقتها ، وأنت هديتها للإسلام ، وأنت قبضت روحها ، وأنت أعلم بسرها وعلانيتها ، جئناك شفعاء فاغفر له ))[١٦٠]

واتە: خوایە تۆ پەروەردگاری ئەوی، وە تۆش دروستت کردووە، و ڕێنموونیت کردووە بۆ ئیسلام ، وە هەر تۆش گیانیت کێشاوە، و زانا و ئاگاداری بە نهێنی و ئاشکرای ، جا لەبەر ئەوە ئێمەش هاتووینەتە خزمەتی تۆ و تکا و ڕجای بۆ دەکەین، دەسا تۆش بە میهرەبانی خۆت لێی خۆشببە .

٤- لە (واثیلە) ی کوڕی (ئەسقەع) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( صلى رسول الله (ﷺ) على رجل من المسلمين ، فأسمعه يقول: اللهم إن فلان بن فلان في ذمتك ، وحبل جوارك ، فقه من فتنة القبر، وعذاب النار، وأنت أهل الوفاء والحق ، فاغفر له وارحمه ، إنك أنت الغفور الرحيم ))[١٦١]

واتە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر پیاوێکی موسوڵمان کرد، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: خوایە فلانی کوڕی فلان لە سایەی تۆدایە، سا لە ئاشوبەی ناو گۆڕ و سزای ئاگر بیپارێزە، وە تۆ خاوەنی وەفا و حەق و ڕەواییت ، خوایە لێی خۆشببە و بەزەییت پێیدا بێتەوە ، چونکە بەڕاستی تۆ لێخۆشبوو میهرەبانیت.

---

[١٦٠] **حسن لغیره** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الدعاء للمیت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٠)، هەروەها (نەسائی) لە (عمل الیوم واللیلة) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٨)، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الدعاء في صلاة الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٧٥)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند أبي هريرة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٣٣٦)، هەروەها (تەبەڕانی) لە (الدعاء)، بابی: (القول في الصلاة على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٨٩).

[١٦١] **صحیح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الدعاء للمیت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٢)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في الدعاء في الصلاة على لجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٩٩).

**حەوتەم: سەلامدانەوە:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێكن كە سەلامدانەوە پایەیەكە لە نوێژی مردوودا جگە لە ئیمام (ئەبوحەنیفە) كە دەفەرموێ: هەردوو سەلامدانەوە بەلای ڕاست و چەپدا واجبە ، بەڵام ڕوكن نین لە نوێژەكە ، وە ئەوانەی بە ڕوكنیان داناوە بەڵگەیان ئەوەیە كە نوێژی مردوو نوێژە و نوێژیش بە سەلامدانەوە كۆتایی دێ و لێی دێیتە دەرەوە.

لە (عبدالله) ی كوڕی (مەسعود) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( ثلاث خلال كان رسول الله (ﷺ) يفعلهن ، تركهن الناس ، إحداهن: التسليم على الجنازة مثل التسليم في الصلاة ))[١٦٢]

واتە : سێ خیصاڵ و سیفات هەن كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) كردوونی و خەڵكی وازی لێ هێناون ، كە یەكێكیان بریتیە لە: سەلامدانەوە لە نوێژی مردوودا وەك سەلامدانەوەی ناو نوێژی تر .

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە:**

لەبارەی سەلامدانەوە بەلای ڕاست و چەپدا زانایان جیاوازییان هەیە ، هەر بۆیە لەو بارەیەوە دوو ڕای جیاوازیان هەیە:

**١) تەنها سەلامدانەوەی لای ڕاست بەسە:**

لە (ئیبنوعومەر) و (واثلەی كوڕی ئەسقەع) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) گێڕدراوەتەوە كەوا: لە نوێژی جەنازەدا یەك سەلامیان داوەتەوە .

---

[١٦٢] **حسن** - (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (من قال يسلم عن يمينه وعن شماله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٨٦) ، هەروەها لە كتێبی (معرفة السنن والآثار) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (التكبير على الجنائز وغير ذلك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٨٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (تلخيص احكام الجنائز/ ص ٥٦) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

وە هەروەها بە هەمان شێوە لە (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) و (ئیبنوعەبباس) و (جابیری کوڕی عبدالله) و (ئەبوهورەیرە) و (ئەنەسی کوڕی مالیك) و (ئیبنوئەبی ئەوفا) وە گێڕدراوەتەوە .

وە ئەمە قسەی (سەعیدی کوڕی جوبەیر) و (حەسەنی بەصری) و (ئیبنوسیرین) و (ئەبوئومامەی کوڕی سەهل) و (قاسمی کوڕی محمد) و (حارث) و (ئیبراهیمی نەخەعی) و (سوفیانی ثوری) و (ابن عیینة) و (ابن المبارك) و (عبدالرحمن ی کوڕی مەهدی) و (مالیك) و (ئەحمەد) و (ئیسحاق) ە[*]، وە لە گێڕانەوەیەکدا قسەی ئیمام (شافیعی) شە[*].

**وە ئیمام (ئەحمەد) فەرموویەتی:** یەك سەلامدانەوە سوننەتە ، جا ئەوکەسە بەلای ڕاستدا سەلام دەداتەوە ، وە قەیناکە ئەگەر بە بەردەم خۆیدا سەلام بداتەوە، ئەویش بە بەڵگەی کردەوەی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی کە یەك سەلامیان دەدایەوە ، وە نەزانراوە کەسێك پێچەوانەیان بوبێت لەو سەردەمەدا .

**٢) وا باشە بەلای ڕاست و چەپدا سەلام بدرێتەوە:**

**ئیمام (شافیعی) بە پەسندی داناوە:** کەوا دوو سەلامدانەوە بوترێت یەکەمجار بەلای ڕاستدا سەلام دەداتەوە ، وە دووەمجار بەلای چەپدا .

**وە (ئیبنوحەزم) فەرموویەتی:** سەلامدانەوەی دووەم زیکرە و کارێکی چاکە .

---

[*] (المغني لإبن قدامة / ج ٣، ص ٤١٨) ، و (المدونة الكبرى/ ج ١، ص ١٧٠).

[*] (المجموع لإمام النووي / ج ٥، ص ١٩٨ - ٢٠٠).

**٥ ) سوننەتەکانی نوێژی مردوو:**

**یەکەم: ئەگەر پیاو بوو سوننەتە لە ئاستی سەری بوەستی:**

لـە (ئـەبوغالیب) وە (ڕەحمــەتی خـوای لێ بـێ) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( رأيت أنس بن مالـك صلى على جنـازة رجـل ، فقـام حيـال رأسـه ، فجيء بجنـازة أخرى ، بامرأة ، فقالوا: يا أبا حمزة صل عليها ، فقام حيال وسط السرير ، فقال لـه العلاء بن زياد: يا أبا حمزة هكذا رأيت رسول الله (ﷺ) صلى قام من الجنازة مقامـك من الرجـل ، وقـام مـن المرأة مقامـك مـن المرأة ؟ قـال: نعـم ، فأقبـل علينـا ، فقـال: احفظوا ))[١٦٢]

واتە : لەگەڵ (ئەنەسی کوڕی مالیك) دا (خوای لێ ڕازی بێت) نوێژم لەسـەر تـەرمی پیاوێـك کـرد ، جـا لـە لای سـەریەوە ڕاوەسـتا ، پاشـان تـەرمی ئافرەتێکیـان هێنـا و وتیـان : ئـەی (ئەبوحـەمزە) نوێـژی لەسـەر بکـە ، جـا لای ناوەڕاسـتی جێگاکـەوە ڕاوەستا ، جا (عەلای کـوڕی زیـاد) - کاتێـك بینـی ڕاوەسـتانەکەی بـۆ پیـاوو ئـافرەت جیاواز بوو - وتی: ئەی (ئەبوحەمزە) بەم شێوەیە پێغەمبەری خـوات (ﷺ) بینیـوە ڕاوەستا بێ لەسەر تەرمی پیاو هەروەکو تۆ چۆن ڕاوەسـتای ، وە ڕاوەسـتابێ لەسـەر تەرمی ئافرەت هەروەکو تۆ چۆن ڕاوەستای ، (ئەنەس) فەرمووی: بەڵێ ، جا (عەلا) بەری کردە لامانەوە و فەرمووی: ئەمە لەبەر بکەن .

---

[١٦٢] صحيح - (ئەبوداود) لە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (أين يقـوم الإمـام مـن الميـت إذا صـلى عليـه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩٤) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء أين يقـوم الإمام من الرجل والمرأة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٣٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنـائز)، بابی : (ما جاء في أين يقوم الإمام إذا صلى على جنـازة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٤٩٤) ، هـەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (احكام الجنائز / ص ١٠٩) دا فەرموویەتی : سەنەدەکەی (صحيح) ە .

**وە بۆ ئافرەت سوننەتە لە ئاستی ناوەڕاستیدا بوەستی:**

لـە (سـەمورە) ی کـوڕی (جونـدەب) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( أن رسـول الله (ﷺ) صـلى علـى امـرأة ماتـت في نفاسـها ، فقـام وسطها))[١٦٤] واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر تەرمی ئافرەتێك كرد كە مردبـوو بـە هـۆی منـداڵ بوونـەوە ، جا لەوكاتـەی كـە نوێـژی لەسـەر دەكـرد لـە ناوەڕاستیدا وەستابوو.

وە ئەمەش مەزهەبی ئیمام (شافیعی) و (ئەحمەد) و (ئیسحاق) ە ، وە هەڵبـژاردەی هەندێ لە (حەنەفیەكان) ە ، وە ڕاو بۆچوونی (شەوكانی) شە*.

**دووەم: سوننەتە پێشەوا بچێتە پێشەوە، پاشان ئـەوانی تـر لـە دوایـەوە، بـەڵام كاتـێ** موسوڵمانان جێیان نەبۆوە ئەوا لەلای ڕاست و چەپی پێشەواوە دەوەستن .

**سێیەم: سوننەتە كەوا قورئان خوێندنەكەی بە دەنگی نزم بێت:**

لە (ئەبونومامە) ی باهیلییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنـەوە كەوا یـەكێك لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـەواڵی پـێ داوە و فەرموویـەتی: (( أن السـنة في الصلاة على الجنازة أن يكبر الإمام ، ثم يقرأ بفاتحة الكتاب بعد التكبيرة الأولى سـرا

---

[١٦٤] **صحيح** – (بوخاری) لە كتابی (الحيض) ، بابی : (الصلاة على النفساء وسننها) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٣٣٢) ، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (أين يقوم الإمام من الميت للصلاة عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٣٢) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (أين يقوم الإمام من الميت إذا صلى عليه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣١٩٥) ، هـەروەها (ترمـذی) لـە كتـابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في أين يقوم الإمام من الرجل والمرأة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٠٣٥) ، هـەروەها (نەسائی) لـە كتـابی (الحيض) ، بـابی : (الصلاة على النفساء) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣٩١).

* (الهداية / ج ١، ص ٤٦٢) ، و (شرح المعاني/ ج ١، ص ٢٨٤).

في نفسه ، ثم يصلي على النبي (ﷺ) ، ويخلص الدعاء للجنازة، في التكبيرات لا يقرأ في شيء منهن ، ثم يسلم سرا في نفسه ))[165]

واتە: کەوا سوننەت وایە لە نوێژی جەنازەدا پێشەوا (الله أكبر) بکات ، پاشان (فاتحە الكتاب) پاش (الله أكبر) ی یەکەم بخوێنێت بە بێ دەنگی لەبەر خۆیەوە ، پاشان سڵاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدات ، وە نزا بە ئیخلاصەوە بۆ مردووەکە بکات لە پاش سێ (الله أكبر) ە کەی تر ، وە لە (الله أكبر) ە کانی تردا هیچ قورئانی تێدا ناخوێنێت ، پاشان بە دەنگێکی نزم لەبەر خۆیەوە (سەلام) دەداتەوە - بە لای ڕاستیدا - .

**چوارەم و پێنجەم: سوننەتە کەوا لە (الله أکبر) ی یەکەم دەست بەرز بکاتەوە، و دەستی ڕاستیشی بخاتە سەر دەستی چەپی:**

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ): كبر على جنازة ، فرفع يديه في أول تكبيرة ، ووضع اليمنى على اليسرى ))[166] واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) (الله أكبر) ی لەسەر جەنازە دەکرد ، و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە لە (الله أكبر) ی یەکەمدا ، و دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دادەنا .

---

[165] **صحیح** - (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القراءة في صلاة الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٦٤) ، هەروەها (شافیعی) لە موسنەدەکەیدا لە کتابی (الجنائز والحدود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٢٧) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (إرواء الغليل / ج ٣ - ح ٧٣٤) ، و (تلخیص أحکام الجنائز / ص ٥٥) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

[166] **حسن** - (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في رفع اليدين على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٧) ، هەروەها (دارەقوتنی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (وضع اليمنى على اليسرى ورفع الأيدي عند التكبير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٩٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي / ج ٢ - ص ٢٨٨ - ١٠٧٧) دا فەرموویەتی : (حسن) ە.

**شەشەم: سوننەتە ئەوكەسەی كە نوێژ لەسەر جەنازە دەكات لەگەڵ هەموو (الله أكبر) ێكدا هەردوو دەستی بەرز بكاتەوە** ، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەیەی كردووە*.

هەروەها لە (عومەر) ی كوڕی (ئەبی زائیدە) وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( رأيت قيس بن أبي حازم كبر على جنازة فرفع يديه في كل تكبيرة ))[١٦٧] واتە: (قەیسی كوڕی ئەبوحازم) م بینی كاتێ (الله أكبر) ی بكردایە لەسەر جەنازە بۆ هەموو (الله أكبر) ێ هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە .

زانایانی ئەهلی عیلم لەم بارەیەوە دوو ڕای جیاوازیان هەیە*:

**١) تەنها لە (الله أكبر) ی یەكەمدا دەست بەرز دەكرێتەوە:** ئەمەش مەزهەبی (سوفیانی ثوری) و ، لە گێڕانەوەیەكا (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) و (ئیبنوحەزم) یشە ، وە هەڵبژاردەی (شەوكانی) و (ئەلبانی) شە ، بەڵگەشیان:

أ- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) كبر على جنازة ، فرفع يديه في أول تكبيرة ، ووضع اليمنى على اليسرى ))[١٦٨] واتە : جارێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر تەرمێ (الله أكبر) ی

---

* (الفتاوى لشيخ ابن باز / ج ١٣ - ص ١٤٨).

[١٦٧] **صحيح** – (بوخاری) لە كتێبی (رفع اليدين في الصلاة) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٨).

* (المبسوط/ ج ٢، ص ٤٦) ، و (المدونة/ ج ١، ص ١٦٠) ، و (المجموع/ ج ٥، ص ٢٣٢) ، و (كشاف القناع/ ج ٢، ص ٧٢) ، و (الأوسط/ ج ٥، ص ٤٢٦) ، و (رفع اليدين لإمام البخاري/ ص ١٧٥) ، و (المحلى/ ج ٥، ص ١٢٨) ، و (أحكام الجنائز / ص ١٤٨).

[١٦٨] **ضعيف جدا** – (ترمذی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في رفع اليدين على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٧) ، هەروەها (دارەقوتنی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (وضع اليمنى على اليسرى ورفع الأيدي عند التكبير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٩٦) ، بەڵام شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٣، ص ٣٨٨، ح ١٠٧٧) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

کرد ، جا تـەنها لـه یەکـەم (الله أکبر) کردنـا دەستـەکانی بـەرز کـردەوە ، وە دەسـتی ڕاستی خسته سەر دەستی چەپی .

ب- لە (ئیبنوعـەبباس) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی:

(( أن رسول الله (ﷺ) کـان یرفـع یدیـه علـی الجنـازة في أول تکبیرة ثـم لا یعـود ))[169]

واته : جارێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەسـەر تـەرمێ نوێـژی کـرد ، تـەنها لـه یەکـەم (الله أکبر) دا دەستـەکانی بەرز کردەوە ، ئیتر دوای ئەوە دەستی بەرز نەکردەوە .

**جا پێشەوا (شەوکانی) لەپاش باس کردنی جیاوازیەکانی نێوان زانایان و لێکۆڵینەوەیان فەرموویەتی:** کورتـەی قـسان جگـه لـه (الله أکبر) ی یەکـەم شتێك سابت نـەبووە لـه پێغەمبەرەوە (ﷺ) که بەکاری بەڵگه بێت.

وە قـسەی هـاوەڵان و کردەوەیـان نابێتـه بەڵگـه ، کەواتـه پێویـسته کـه تـەنها لـه تەکبیرەی یەکەمدا دەست بەرز بکرێتەوە ، چونکه لـه تـەکبیرەکانی تـردا مەشـروع نیه ، مەگەر لە کاتێکدا نەبێت لە شێوەیەکی نوێژەوە بچێتە شێوەیەکی تـر ، وەکـو لە نوێژەکانی تردا هەیه ، بەڵام خۆ نوێژی مردوو ئەو گواستنەوە و گۆڕینـەی تیـا نیه .

**٢) لەگەڵ هەموو (الله أکبر) ێکدا دەستەکان بەرز دەکرێتەوە:** ئەمـەش قـسەی زۆربـەی ئـــەهلی عیلمـــه وەك: ئیمـــام (شـــافیعی) و (ئەحمـــەد) و (ئیـــسحاق) ، وە لـــە گێڕانەوەیەکی ترا قسەی ئیمام (ئەبوحەنیفه) و (مالیك) یشه ، بەڵگەشیان:

---

[169] **ضعیف** – (دارەقوتنی) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (وضع الیمنی علی الیسری ورفع الأیدي عند التکبیر) گێڕاویەتەوە به ژمارە (١٥٩٧) ، هەروەها (عوقەیلی) له کتێبی (الضعفاء الکبیر) دا ، بابی : (الفاء: الفضل بن السکن الکوفي) گێڕاویەتەوە به ژمارە (١٦٤٨).

أ- لە (نافیع) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: ((عن ابن عمر: كان يرفع يديه في كل تكبيرة على الجنازة ))[170] واتە: (ئیبنوعومەر) لە نوێژی جەنازەدا دەستووری وابوو لەگەڵ هەموو (الله أكبر) یێکدا دەستەکانی بەرز دەکردنەوە .

ب- لە (غەیلان) ی کوڕی (ئەنەس) ی کەلەبییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن عمر بن عبد العزيز كان يرفع يديه في كل تكبيرة على الجنازة ))[171] واتە: (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لە نوێژکردنی لەسەر جەنازەدا لەگەڵ هەموو (الله اكبر) یێکدا دەستەکانی بەرز دەکردنەوە .

ج- لە (عومەر) ی کوڕی (ئەبی زائیدە) ی هەمەدانییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( صليت خلف قيس بن أبي حازم على جنازة ، فكبر أربعا يرفع يديه في كل تكبيرة ))[172] واتە: لە دوای (قەیسی کوڕی ئەبی حازمی) بەجەلییەوە لەسەر تەرمێ نوێژم کرد ، جا چوار (الله أكبر) ی لەسەر کرد ، وە لەگەڵ هەموو (الله أكبر) یێکدا دەستەکانی بەرز دەکردنەوە .

---

[170] **إسناده صحيح** - (بوخاری) لە کتێبی (رفع اليدين) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٠) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (في الرجل يرفع يديه في التكبير على الجنازة من قال يرفع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١١٨٨).

[171] (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (في الرجل يرفع يديه في التكبير على الجنازة من قال يرفع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١١٨٩).

[172] **إسناده صحيح** - (بوخاری) لە کتێبی (رفع اليدين) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٨) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (في الرجل يرفع يديه في التكبير على الجنازة من قال يرفع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١١٩٣).

**حەوتەم: نزاو پاڕانەوەی دوای تەکبیرەی چوارەم:**

**پەسەندە دوای وتنی (الله أكبر) ی چوارەم ئەوکەسە بپاڕێتەوە بۆ مردووەکە هەرچەندە دوای (الله أكبر) ی سێیەم پاڕابێتەوە ، بەپێی ئەوەی ئیمام (ئەحمەد) لە لە (ئیبراهیم) ی هیجرییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گێڕاویەتەوە کەوا فەرموویەتی: (( عن عبد الله بن أبي أوفى ، وكان من أصحاب الشجرة ، فماتت ابنة له ، وكان يتبع جنازتها على بغلة خلفها ، فجعل النساء يبكين فقال: لا ترثين ، فإن رسول الله (ﷺ) نهى عن المراثي ، فتفيض إحداكن من عبرتها ما شاءت ، ثم كبر عليها أربعا ، ثم قام بعد الرابعة قدر ما بين التكبيرتين يدعو ، ثم قال: كان رسول الله (ﷺ) يصنع في الجنازة هكذا ))[١٧٣]**

**واتە : لە (عبدالله ی کوڕی ئەبی ئەوفا) وە دەگێڕێتەوە کەوا یەکێك بوو لە هاوەڵانی درەخت[*]، کچێکی دەمرێت ، وە ئەویش بە سواری ماینێ شوێن تەرمی کچەکەی دەکەوێ ، جا بینی ئافرەتان دەگریان و واوەیلایان دەکرد ، ئەویش فەرمووی پێیان: وا وەیلا مەکەن ، چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی لە وا وەیلاو لەم جۆرە کارانە کردووە ، جا هەر کامێکتان بە ئارەزووی خۆی لەجێی خۆیەوە چەندێ بگری و فرمێسکی خەمباری هەڵڕێژێ قەیدی نیە ، جا کاتێ تەرمەکەیان دانا نوێژی دابەست و چوار (الله أكبر) ی لەسەر کرد ، پاشان**

---

**[١٧٣] (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێرناونیشانی: (أول مسند الكوفيين - بقية حديث عبد الله بن أبي أوفى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٧٢٩).**

**[*] (هاوەڵانی درەخت): بریتی بوون لەو صەحابانەی کەلە ژێر درەختەکەدا لە نزیکی مەککە بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە هەواڵیان بیست کە (عوسمانی کوڕی عەففان) شەهید کراوە تا هێرش بکەنە سەر بێ بڕواکانی مەککە و تۆڵەی (عوسمان) بکەنەوە ، بەڵام دوایی بۆیان دەرکەوت کە هەواڵەکە درۆ بووە ، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) هێرشەکەی ئەنجام نەداو گەڕایەوە بۆ شاری مەدینەی منەوەرە.**

لەدوای (الله أكبر) ی چوارەم بـە ئەنـدازەی نێـوان دوو تەكبیرەكە پاڕایـەوە ، لەپاشا فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نوێژی مردووودا ئەو شێوەیەی كردووە .

**ئیمام (شافیعی) دوای تـەكبیرەی چـوارەم فەرموویـەتی:** (اللهم لا تحرمنـا أجـره ، ولا تفتنـا بعـده) واتـە: خوایـە لـە پاداشـتی بـێ بـەشمان مەكـە ، وە دوای ئـەو تووشـی فیتنـەمان مەكە .

**(ابن أبـي هريـرة) فەرموویـەتی:** پێـشینان دوای تـەكبیرەی چـوارەم دەیـان فـەرموو: (اللهم آتنـا في الـدنيا حـسنة وفي الآخـرة حـسنة وقنـا عـذاب النـار) واتـە: خوایـە لـە دونیاو دوارۆژدا چاكەمان پێ ببەخشە و لە سزای ئاگر بمانپارێزە .

**هەشتەم: سوننەتە پێشەوا خەڵكەكە بكاتە سێ ڕیزەوە:**

لە (ئەبوئومامە) ی باهیلییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( صلى النبي (ﷺ) على جنازة ، ومعه سبعة نفر ، فجعل ثلاثة صفا ، واثنين صفا، واثنين صفا ))[١٧٤] واتـە: پێغەمبـەر (ﷺ) نوێـژی لەسەر جەنازەیـەك كـرد و حـەوت كەسی لەگەڵدا بوو، جا سیانی كـردە ڕیزێـك و دوانیـشی كـرد بـە ڕیزێكـی تـر و وە دووی تریشی كردە ڕیزێك.

**ئیمام (ئەحمەد) فەرموویەتی:** مـن پـێم خۆشـە بكـرێن بـە سـێ ڕیـزەوە ، هەرچـەندە كەمیش بن ، وتیان: ئەگەر چوار كەس لە دواوەی بوون چۆن بیكات بـە سـێ ڕیـز؟ فەرمووی: با بیكات بە دوو ڕیز هەر ڕیـزەی دوو كـەس ، وە لای خـراپ بـوو بیكات بە سێ ڕیز هەر ڕیزەی پیاوێك .

---

[١٧٤] (تەبەرانی) لە (معجم الكبير) دا ، بابی : (الصاد - ما أسند أبو أمامة - سليمان بن عبـد الـرحمن الدمشقي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٦٤٢).

**نۆیەم: ڕیزەکان تا زۆرترین هیوای گیرابوون زۆرترە:**

١- لـە دایکـە (عائیـشە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ما من میت تصلي علیه أمة من المسلمین یبلغون مائة ، کلهم یشفعون له ، إلا شفعوا فیه ))[١٧٥]

واتـە: هـەر مردوویـێ کـە کۆمـەڵێ موسوڵمان ژمارەیـان بگاتـە صـەد کـەس نوێـژی لەسەر بکەن ، وە هەموویان تکای بۆ بکەن ، ئیللا تکاکەیان گیرا دەبێ .

٢- لـە (ئیبنوعـەبباس) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( مـا مـن مـسلم یموت فیقوم علی جنازتـه أربعون رجلا ، لا یشرکون بالله شیئا إلا شفعوا فیه ))[١٧٦]

واتە : هەر پیاوێ لە موسوڵمانان کە دەمرێ ، چل پیاو کە هیچ شەریك و هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکەن ، نوێژ لەسەر تەرمەکەی بکەن ، ئیللا خوای گەورە تکایـان لێ گیرا دەکا بۆی .

---

[١٧٥] **صحیح** – (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من صلی علیه مائة شفعوا فیـه) گێڕاویەتـەوە بە ژمارە (٢١٩٥) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الصلاة علی الجنازة والشفاعة للمیت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٢٩) ، هەروەها (نەسائی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (فضل من صلی علیه مائة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٩٠).

[١٧٦] **صحیح** – (موسـلیم) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـن صـلی علیـه أربعـون شـفعوا فیـه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٩٦) ، هـەروەها (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (فضل الصلاة علی الجنائز وتشییعها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٧٠).

**٦ ) چۆنێتی نوێژی مردوو:**

**یەكەم: پێشنوێژ چوار (الله أكبر) دەكات بە (الله أكبر) ی نوێژدابەستنیشەوە:**

لەبەر فەرموودەكەی (ئەبوهورەیرە) ی پێشوو (خوای لێ ڕازی بێت).

**دووەم: لە دوای (الله أكبر) ی یەكەم سورەتی (فاتیحە) و سورەتێكی كورت دەخوێنرێ:** لەبەر فەرموودەكەی (تەڵحە) ی كوڕی (عبدالله) ی كوڕی (عەوف) ی پێشوو (خوای لێ ڕازی بێت).

**سێیەم: ئنجا پاش (الله أكبر) ی دووەم صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەدات، هەروەكو چۆن لە (تەحییات) دا دەیخوێنی**، ئەویش بەم جۆرە: ( اللهم صل على محمد وعلى آل محمد ، كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد ، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد ).

**چوارەم: لە پاش (الله أكبر) ی سێیەم دەپاڕێتەوە بۆ مردووەكە:** ئەویش لەبەر ئەو فەرموودانەی كەلە پێشوودا ئاماژەمان پێ كرد .

**بابەتێكی تایبەت**

**سەبارەت بە منداڵی لەبارچوو**

ئەو منداڵەی كە لەبارچووە ئەگەر تەمەنی لە چوار مانگ و بەرەوژوورتر بێت ، ئەوە نوێژی لەسەر دەكرێ و لە نزاو پاڕانەوەی ناو نوێژەكەدا داوای لێ خۆشبوون و ڕەحمەت بۆ دایك و باوكی دەكرێ .

١- لە (موغیرە) ی كوڕی (شوعب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ... ، والسقط يصلى عليه ،

ویــدعی لوالدیــه بــالمغفرة والرحمــة ))[177] واتــه : ... ، وه منــاڵی لەبارچـووی نەبەکامیش نوێژی لەسەر دەکرێ ، بەڵام منـاڵ لـەباتی خـۆی داوای لێخۆشـبوون و میهرەبانی خوا بۆ دایك و باوکی دەکرێ .

٢- له گێڕانەوەی (نەسائی) دا دەفـەرموێ: (( الراكب خلف الجنازة ، والماشي حيث شاء منها، والطفل يصلي عليه ))[178] واته : سوار له پشتی تەرمەوه دەڕوات و ، پیـاده بـه ئـارەزووی خۆیـەتی لـه کوێـوه دەڕوات بـا بـڕوات ، وه منـاڵیش نوێـژی لەسـەر دەکرێ.

٣- لــه (حەســەن) ی بەصــرییەوه (ڕەحمــەتی خــوای لێ بــێ) دەگێڕنــەوه کــەوا فەرموویەتی: (( يقرأ على الطفل بفاتحة الكتاب ويقول: اللهم اجعله لنا فرطا وسلفا وأجرا ))[179] واته : (نوێژخوێن) سورەتی (فاتیحه) لەسەر منـاڵ دەخوێنـێ و له نـزای

---

[177] **صحیح** - (ئەبوداود) له کتابی (الجنائز) ، بـابی : (المشي أمام الجنازة) گێڕاویەتـەوه بـه ژمـاره (٣١٨٠) ، هـەروەها (ترمـذی) لـه کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في الـصلاة علـى الأطفـال) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٠٣١) ، هەروەها (نەسائی) له کتابی (الجنائز) ، بـابی : (مكان الراكب مـن الجنائز) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٩٤١) ، هەروەها (ابن ماجه) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في شهود الجنائز) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٤٨١) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) له (سنن أبی داود/ ج ٣، ص ٢٠٥، ح ٣١٨٠) ، و (صــحيح الجــامع الــصغير/ ح ٣٥٢٥) ، و (مــشكاة المــصابيح/ ج ١، ١٦٦٧) دا فەرموویەتی: (صحیح) ه.

[178] **صحیح** - (نەسائی) له کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (مكان الراكب مـن الجنـائز) گێڕاویەتـەوه بـه ژمـاره (١٩٤٢) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـه (سـنن النـسائی/ ج ٤، ص ٥٥، ح ١٩٤٢) ، و (صـحيح الجامع الصغير/ ح ٣٥٣٣) دا فەرموویەتی: (صحیح) ه.

[179] **صــحیح** - (بوخـاری) لـه کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (قـراءة فاتحـة الكتـاب علـى الجنـازة) گێڕاویەتــەوه ، هــەروەها (عبــد الــرزاق) لــه کتــابی (الجنــائز) ، بــابی : (الــدعاء علــى الطفــل) گێڕاویەتەوه به ژماره (٦٣٧٦) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) له کتـابی (الـدعاء) ، بـابی : (في الـسقط)

نوێژەکەدا دەڵێ: خوایە ! بیکە بە پێشڕەو و پێشەنگ و مایەی پاداشی گەورە بۆمان .

**(ابن المنذر) دەفەرموێ**[*] : زانایان هەموویان لەسەر ئەوەن کە کۆرپەلە ئەگەر گیانی بە بەردا کرابێت و جووڵەیەك بکات کە بزاندرێ ژیانی تێدایە ، ئەوە نوێژی لەسەر دەکرێت .

زانایان لە بارەی نە جووڵان و نە پژمینی منداڵی لەبارچووەوە ، کە ئایا نوێژی لەسەر دەکرێ یان نا ، دوو ڕای جیاوازیان هەیە:

**یەکەم: دەفەرموون:** منداڵی لەبارچوو (سقط) دەشۆرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت بەپێی حەدیسەکەی پێشووی (موغیرەی کوڕی شوعبە) کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((والسقط يصلى عليه )).

وە ئەم قسەیە لە (ئیبنوعومەر) و (ئەبوهورەیرە) و (سەعیدی کوڕی جوبەیر) و (ئیبنوسیرین) ەوە گێڕدراوەتەوە ، وە ئەمە قسەی ئیمام (ئەحمەد) و (ئیسحاق) یشە[*] .

**دووەم: دەفەرموون:** ئەگەر دەنگی لێوە نەهاتبوو ، نە جوڵاو ، نە پژمی ، ئەوە نوێژی لەسەر ناکرێت ، وە ئەم قسەیە لە (جابیری کوڕی عبدالله) و (ئیبنوعەبباس) ەوە گێڕدراوەتەوە ، وە هەروەها قسەی (زوهری) شە ، وە ئەمە بۆچوون و قسەی (حەنەفیەکان) و ئیمام (مالیك) و (شافیعی) و (ئەوزاعی) و

---

گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٢٣٣) ، هەروەها (تەبەرانی) لە کتێبی (الدعاء) ، بابی : (في الدعاء في الصلاة على الصغير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٠٥).

[*] (الإجماع / ص ٣٠).

[*] (شرح السنة للبغوي/ ج ٥، ص ٣٧٣).

(سوفیانی ثوری) و (حەسەن) و (هاوەڵانی ڕەئی) یە*، وە بەڵگەشیان بەم یەك دوو حەدیسە هێناوەتەوە:

١- لە (جابیر) ی کوڕی (عبداللە) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا استهل الصبي صلي عليه ، وورث ))[١٨٠] واتە : ئەگەر منداڵێ دەنگی لێوە هات و جووڵایەوە نوێژی لەسەر دەکرێ و ، میراتیش دەگرێت .

٢- لە (جابیری کوڕی عبداللە) و (میسوەر) ی کوڕی (مەخرەمە) وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویانە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا یرث الصبي حتى یستهل صارخا ))[١٨١] واتە : هیچ منداڵێکی تازە ساوا میرات نابا هەتا دەنگی لێوە نەیە یا نەجووڵێ (یا نە پژمێ).

---

* (شرح السنة للبغوي/ ج ٥، ص ٣٧٣).

[١٨٠] **ضعیف** – (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الصلاة على الطفل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧٥٠) ، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الکبری) دا لە کتابی (الفرائض) ، لە ژێر ناونیشانی: (توریث المولود إذا استهل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٦٨) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الفرائض) ، بابی : (ذکر الإخبار بأن من استهل من الصبیان عند الولادة ورثوا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٢٤) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الفرائض) ، لە ژێر ناونیشانی: (وأما حدیث ابن عیینة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٠٩٦) ، هەروەها (ابن أبي شیبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الفرائض) ، لە ژێر ناونیشانی : (في المولود یموت وقد مات لە بعض من یرثه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٨٤٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجە/ ج ٢، ص ٩١٩، ح ٢٧٥٠) ، و (ضعیف الجامع الصغیر/ ح ٣٦٣) دا فەرموویەتی: (ضعیف) ە.

[١٨١] **صحیح** – (ابن ماجە) لە کتابی (الفرائض) ، بابی : (إذا استهل المولود ورث) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧٥١) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الأوسط) دا ، بابی : (العین: من اسمه: عبدان)

**پێنجەم: پاش (الله أكبر) ی چوارەم واباشە پێشەوا کەمێك بێ دەنگ بێت، پاشان یەك سەلام بداتەوە بە لای ڕاستدا:**

١- لە (ئەبوهورەیرە) (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( أن رسول الله (ﷺ) صلى على جنازة فكبر عليها أربعا ، وسلم تسليمة واحدة ))[١٨٢]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر تەرمێ کرد ، جا چوار (الله أكبر) ی کرد و یەك سەلامی دایەوە.

٢- لە (عبدالله) ی کوڕی (ئەبو ئەوفا) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( ماتت ابنة له فخرج في جنازتها على بغلة خلف الجنازة ، ...، قال: ثم صلى عليها فكبر أربعا ، فقام بعد التكبيرة الرابعة بقدر ما بين التكبيرتين يستغفر لها ويدعو، ثم قال: كان رسول الله (ﷺ) يصنع هكذا ))[١٨٣]

واتە: کچێکی (عبدالله) ی کوڕی (ئەبی ئەوفا) مرد جا کەوتە شوێن جەنازەکەی بە سواری وڵاغێك ، ... ، ڕاوی دەڵێ: پاشان نوێژی لەسەر کرد و چوار (الله أكبر) ی

---

گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٦٩٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجە/ ج ٢، ص ٩١٩، ح ٢٧٥١) ، و (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ١، ج ٢٨٤، ح ١٥٢) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[١٨٢] **حسن** - (دارەقوتنی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (التسليم في الجنازة واحدا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٨٤) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٦٥) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما روي في التحلل من صلاة الجنازة بتسليمة واحدة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٧٩) ، شێخ (ئەلبانی) لە (أحكام الجنائز / ص ١٢٨) دا سەنەدەکەی بە (حسن) داناوە.

[١٨٣] **صحيح** - (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في التكبير على الجنازة أربعا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٠٣) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما روي في الاستغفار للميت والدعاء له ما بين التكبيرة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٧٨)، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٦٣).

لەسەر کرد، جا لە نێوان تەکبیرەی چوارەم و - سەلامدانەوەدا - بە ئەندازەی نێوانی دوو (الله أكبر) ی ناو نوێژەکە، هەڵوێستەیەکی کرد و داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد و بۆی پاڕایەوە ، پاشان فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوای دەکرد.

**هەروەها دروستە سەلامی دووەمیش بە لای چەپدا بداتەوە:**

لە (ئیبنومەسعود) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( ثلاث خلال كان رسول الله (ﷺ) يفعلهن ، تركهن الناس إحداهن: التسليم على الجنازة مثل التسليم في الصلاة ))[184]

واتە: سێ شت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیکرد ، ئێستا خەڵکی وازیان لێ هێناوە ، یەکێکیان (سەلام) دانەوەی جەنازەی وەك (سەلام) دانەوەی نوێژ دەدایەوە .

**٧ ) چەند حوکمێکی شەرعی لە بارەی نوێژی مردووەوە:**

**یەکەم: دروستە پێنج (الله أكبر) و شەش (الله أكبر) و حەوت (الله أكبر) و زیاتریش لەسەر تەرم بکرێ*:**

١- لە (عبدالرحمن) ی کوڕی (ئەبی لەیلا) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان زيد يكبر على جنائزنا أربعا ، وإنه كبر على جنازة خمسا، فسألته فقال: كان رسول الله (ﷺ) يكبرها ))[185]

---

[184] **حسن** - (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من قال يسلم عن يمينه وعن شماله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٨٦) ، هەروەها لە کتێبی (معرفة السنن والآثار) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (التكبير على الجنائز وغير ذلك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٨٦) ، شێخ (ئەلبانی) لە (احكام الجنائز / ص ١٢٧) دا سەنەدەکەی بە (حسن) داناوە .

* (الأوسط/ ج ٥، ص ٤٢٩) ، و (ابن أبي شيبة/ ج ١، ص ٤٩٧) ، و (شرح المعاني/ ج ١، ص ٤٩٧) ، و (المحلى/ ج ٥، ص ١٢٨).

واته : دەستووری (زەیدی کوڕی ئەرقەم) وابوو ، لە نوێـژی جەنازەدا ، کە نوێـژی دەکرد لەسەر تەرمەکانمان ، چوارجار (الله أكبر) ی دەکرد ، جارێ کە نوێژی لەسـەر تـەرمێ کـرد ، پێـنج (الله أكبر) ی کـرد ، کـە بـۆ ئەمـە لێـیم پرسـی ؟ فـەرمووی: پێغەمبەری خوایش (ﷺ) جاروبار ئاوای دەکرد .

٢- لە (عبدالله) ی کوڕی (مەعقیل) ی موزەننیەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنـەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن عليا رضي الله عنه صلى على سهل بن حنيف ، فكبر عليـه ستا ، ثم التفت إلينا ، فقال: إنه من أهل بدر ))[186]

واتـە : عـەلی کـوڕی ئـەبی تاڵیـب (خـوای لێ ڕازی بێـت) لـە سـەر (سـەهلی کـوڕی حەنیف) شەش (الله أكبر) ی کرد ، پاشان ڕووی تێکردین و فەرمووی: ئەمە لەوانەن کە لە (غەزای بەدر) دا بەشدارییان کردووە .

---

[185] صحيح – (موسلیم) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (الصلاة على القبر) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٢١٣) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (التكبير على الجنـازة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٣١٩٧) ، هەروەها (ترمذی) لە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في التكبير على الجنـازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٢٣) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء فيمن كبر خمسا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٨١).

[186] إسناده صحيح – (حاکم) لە (مـستدرك) دا لـە کتـابی (معرفـة الـصحابة) ، بـابی : (ذكـر مناقـب سـهل بـن حنيـف الأنـصاري) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٥٧٢٤) ، هـەروەها (عبـدالرزاق) لـە کتـابی (الجنائز) ، بابی : (التكبير على الجنازة) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٦١٩٦) ، هـەروەها (بەیهـەقی) لـە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من ذهب في زيادة التكبير على الأربـع إلى تخـصيص أهل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٤٧) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الكبير) دا ، بابی : (من اسمـه سهل - سهل بن حنيف بـن واهـب بـن حكـيم ويقـال : عكـيم بـن) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٥٤١٠) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیـدا لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـن كـان يكـبر علـى الجنازة سبعا وتسعا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٢٦٩) ، بڕوانە (أحكام الجنائز/ ص ١١٣).

٣- لە (عبدالله) ی کوڕی (یەزید) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( ان عليا رضي الله عنه صلى على أبي قتادة فكبر عليه سبعا ، وكان بدريا ))[١٨٧]

واتە : عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوای لێ ڕازی بێت) نوێژی جەنازەی لەسەر (ئەبوقەتادە) کرد ، حا حەوت (الله أكبر) ی لەسەر کرد ، وە (ئەبوقەتادە) یەکێ بوو لەوانەی کە لە غەزای (بەدر) دا بەشداری کردبوو.

٤- لە (عەبدی خەیر) ی کوڕی (یەزید) ی هەمەدانییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: ((كان علي يكبر على أهل بدر ستا ، وعلى أصحاب رسول الله (ﷺ) خمسا ، وعلى سائر الناس أربعا ))[١٨٨]

---

[١٨٧] **إسناده صحيح** - (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من ذهب في زيادة التكبير على الأربع إلى تخصيص أهل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٤٨) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من كان يكبر على الجنازة سبعا وتسعا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٢٦٥) ، هەروەها (ابن المنذر) لە کتێبی (الأوسط) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ذكر اختلاف أهل العلم في هذا الباب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٦٧) ، هەروەها بڕوانە (احكام الجنائز لشيخ الألباني/ ص ١١٤).

[١٨٨] **إسناده صحيح** - (دارەقوتنی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (التسليم في الجنازة واحدا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٩٠) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من ذهب في زيادة التكبير على الأربع إلى تخصيص أهل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٤٩) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من كان يكبر على الجنازة خمسا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٢٦٠) ، هەروەها (طەحاوی) لە کتێبی (شرح معاني الآثار) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (التكبير على الجنائز كم هو؟) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨١٧)، هەروەها (ابن المنذر) لە کتێبی (الأوسط) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ذكر اختلاف أهل العلم في هذا الباب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٦٨) ، هەروەها بڕوانە (احكام الجنائز لشيخ الألباني/ ص١١٣).

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشەوا عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) لە سەر ئەوانەی لە غەزای (بەدر)دا بەشداریان كردووە شەش (الله أكبر) ی دەكرد ، وە لە سەر هاوەڵانی تری پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێنج (الله أكبر) ی دەكرد ، وە لە سەر خەڵكی تر چوار (الله أكبر) ی دەكرد .

٥- لە (عبدالله) ی كوڕی (زوبەیری كوڕی عەوام) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) أمر يوم أحد بحمزة فسجي ببرده ثم صلى عليه ، فكبر تسع تكبيرات ، ثم أتي بالقتلى يصفون ، ويصلي عليهم وعليه معهم ))[١٨٩]

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی غەزای (ئوحود) دا كاتێ چووە سەر تەرمی (حەمزە) ی مامی فەرمانی كرد بە پۆشاكەكەی دایپۆشن ، پاشان نوێژی جەنازەی لەسەر كرد ، وە حەوت (الله أكبر) ی لەسەر كرد ، لەپاشا كوژراوەكانی تریشیان بۆ هێنا و لەبەردەمیا ڕیزیان كرد ، وە نوێژی جەنازەی لەسەر ئەوانیش كرد .

**دووەم: ئەگەر یەكێك یەك دوو (تەكبیر) فریا نەكەوت لەگەڵ ئیمامدا ئەوە دەچێتە پاڵ تەكبیرەكانی ئیمام** ، بۆ نموونە: ئەگەر ئیمام گەیشتە (الله أكبر) ی سێ یەم ئەوا دوعا بۆ مردووەكە دەكات ، ئنجا دوای (الله أكبر) ی چوارەم سورەتی (فاتیحە) دەخوێنێ ، پاشان (الله أكبر) یكی تر دەكات و (صەڵاوات) دەدات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و ، پاشان (سەلام) دەداتەوە ، جا ئەگەر بەرلەوەی جەنازەكە هەڵبگیرێ بۆی كرا ئەوە باشە ، ئەگەرنا لەگەڵ ئیمامدا (سەلام) بداتەوە باشترە و هیچیشی لەسەر نیە.

---

[١٨٩] **إسناده حسن** – (طەحاوی) لە كتێبی (شرح معاني الآثار) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الشهداء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٤٧) ، هەروەها بڕوانە (أحكام الجنائز لشيخ الألباني / ص ١٠٤).

**(ئیبنوعومـەر) و (حەسـەن) و (ئـەیوبی سـەختیانی) و (ئـەوزاعی) فەرموویانـە*** : هـەر تەکبیرەیەك فریانەکەوت نەیکاتەوە و لەگەڵ ئیمامدا سەلام بداتەوە .

ئیمام (ئەحمەد) فەرموویەتی*: ئەگەر قەزاشی نەکاتەوە گوێی نەداتێ .

**بەڵام کۆمەڵێکی تر لە زانایان ڕایان وایە:** ئـەوەی مـەئموم فریـای نەکـەوتبوو لەگـەڵ ئیمـام ئـەنجامی بـدا ، دەبـێ دوایـی خـۆی قـەزای بکاتـەوە ، ئـەوانیش بـریتین لـە: (سەعیدی کوڕی موسەییب) و (عەطا) و (نەخەعی) و (زوهـری) و (ابـن سـیرین) و (قەتادە) و (مالیك) و (سوفیانی ثوری) و (شافیعی) و (ئیسحاق) و (ئیبنوحـەزم) و (ئەصحابی ڕەئی)* .

**سێیەم: ئەگەر یەکێك فریای نوێژی جەنازە نەکەوت ئەوە دەتوانێ لەسەر گۆڕەکـەی ئەو نوێژە ئەنجام بدات، هەروەك چۆن لەسەر تەرمەکە دەیکات:**

١- لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( أن أسود رجلا - أو امرأة - كان يكون في المسجد يقم المسجد ، فمات ولم يعلم النبي (ﷺ) بموته ، فذكره ذات يوم فقال: ما فعل ذلك الإنسان ؟ قالوا: مات يا رسول الله (ﷺ)، قال: أفلا آذنتموني؟ فقالوا: إنه كان كذا وكذا - قصته - قال: فحقروا شأنه ، قال : فدلوني على قبره ، فأتى قبره فصلى عليه ))[١٩٠]

واتە: (ئەسوەد) پیاوێك بوو یان ئافرەتێك بوو خزمەتی مزگەوتی دەکرد مـرد ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگادار نەبوو بە مردنی ، جا ڕۆژێك باسی کـرد ، فـەرمووی:

---

* (المغني لإبن قدامة/ ج ٣، ص ٤٢٣).

* (المغني لإبن قدامة/ ج ٣، ص ٤٢٣).

* (المغني لإبن قدامة/ ج ٣، ص ٤٢٣) ، و (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١٧٩).

[١٩٠] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على القبر بعد ما يدفن) گێڕاویەتـەوە بە ژمارە (١٣٢٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على القبر بعدما يدفن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٠٧).

ئەوە چی بەسەرهات ؟ وتیان: مرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، فەرمووی: ئەی بۆ منتان ئاگادار نەکردەوە؟ ئەوانیش وتیان: ئەو وابوو ، وابوو - باسی بەسەرهاتیان کرد - (ئەبوهورەیرە) فەرمووی: لە پلە و پایەیان کەم کردەوە ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: گۆڕەکەییم پێ نیشان بدەن ، جا هاتە سەر گۆڕەکەی نوێژی لەسەر کرد .

لە گێڕانەوەیەکی ترا دەفەرموێ: (( أن رجلا أسود أو امرأة سوداء كان يقم المسجد فمات ، فسأل النبي (ﷺ) عنه ، فقالوا: مات ، قال: أفلا كنتم آذنتموني به دلوني على قبره - أو قال قبرها - فأتى قبرها فصلى عليها ))[191]

واتە: پیاوێکی ڕەش یا ژنێکی ڕەش مزگەوتی دەماڵی ، کە دەمرێ پێغەمبەر (ﷺ) ئاگای لێ نابێ ، تا ڕۆژێ هەواڵی دەپرسێ، دەڵێن: مردووە ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ئەی بۆ هەواڵتان بە من نەدا، گۆڕەکەیم پێ نیشان بدەن، جا کە گۆڕەکەیان پێ نیشان دا چوو نوێژی لەسەر کرد .

٢- لە گێڕانەوەی (موسلیم) دا ئەم زیادەی پێوە: (( ثم قال: إن هذه القبور مملوءة ظلمة على أهلها ، وإن الله عز وجل ينورها لهم بصلاتي عليهم ))[192]

---

[191] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الصلاة)، بابی: (كنس المسجد، والتقاط الخرق والقذى والعيدان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٥٨)، هەروەها لە هەمان کتابدا، بابی: (الخدم للمسجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٦٠)، هەروەها لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على القبر بعد ما يدفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٣٧)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢١٢)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٣)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في الصلاة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٢٧).

[192] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢١٢).

واتــە : لەپاشــا فــەرمووی: ئــەم گۆڕانــە پــڕن لــە تــاریكی ، لەبــەر تــاریكی زۆر خاوەناكانیـان وەك لـە تاریكستانابن وایـە ، بـەڵام خـوای بـەتوانا و شـكۆمەند بـە مەرحەمەتی خـۆی بـەهۆی ئـەم نوێـژەوە كـە مـن كـردم لەسـەریان بۆیـان ڕۆشـن و ڕووناك دەكاتەوە !

**پێشەوا (ترمـذی) فەرموویـەتی:** لای بەشـی زۆری زانایـان لـە هـاوەڵان و كەسـانی تـر كردەوە بەوە كراوە ، ئەوەش قسەی ئیمام (شافیعی) و (ئەحمەد) و (ئیسحاق) ە.

**(ئیبنوقەییم) فەرموویەتی:** ئـەم سـوننەتانە كـە موحكـەمن بەرپـەرچ دراونەتـەوە بـەم حەدیسە موتەشابیهە كە دەفەرموێ: (( لا تجلسوا علی القبور ، ولا تصلوا إلیها ))[192]

واتە : لەسەر گۆڕ دامەنیشن ، وە لە نوێژیشا ڕووی تێ مەكەن .

ئەمە فەرموودەیـەكی صـەحیحە ، وە ئەوكەسـەی كـە ئـەو قـسەیەی فـەرمووە هـەر خۆی نوێژی لەسەر گۆڕ كردووە ، جا ئەوەیان وتەكەیەتی و ئەوەشیان كردەوەكەی، لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان لەگەڵ ئەوەی تریان دژایەتی نیە ، چونكە ئەو نوێژەی كە قەدەغەی كردووە بەرەو گۆڕ بكرێت ، ئەو نوێژە نیە كە لەسەر گۆڕ دەكرێت .

چونكە ئەمـەیان نوێـژی جەنازەیـە و تایبـەت نیـە بـە شـوێنێكەوە ، بـەڵكو كردنـی دوور لە مزگەوت چاكترە لەوەی كەلە مزگەوتدا بكرێـت ، كەواتـە ئـەو نوێـژەی كـە لەسەر مردووەكە دەكرێت لەناو گۆڕەكەدا هەر لـە جـۆری ئـەو نوێژەیـە كـە لەسـەر دارمەیتەكەی دەكرێت ، چونكە هەر ئەو نوێـژە مەبەسـتە لـە هـەردوو جێگاكـەدا ، ئیتر جیاوازی نیە لە نێوان ئەوەی كە ئەو مردووە لەناو دارمەیتەكەدا بێت لەسـەر

---

[192] **صحیح** - (موسلیم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (النهي عن الجلوس علی القبر والصلاة علیـه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٢٤٧) ، هـەروەها (ئـەبوداود) لـە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (في كراهیـة القعود علی القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٩) ، هەروەها (ترمذی) لە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (ما جاء في كراهیة المشي علی القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٠).

زەوییەکە ، یاخود لەناو سکی زەوییەکەدا بێت ، بە پێچەوانەی نوێژەکانی ترەوە ، چونکە ئەوان دانەنراون بەرەو گۆڕ و لەناو گۆڕستان بکرێن ، چونکە ئەو کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە گۆڕستان بکرێتە مزگەوت ، لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) نەفرینی لەوانە کردووە کە گۆڕستان دەکەنە مزگەوت . ئیتر ئەوە لە کوێ یە کە نەفرینی کردووە لەو کەسەی ئەو کارە دەکات و ترساندویەتی ؟ وە ڕایگەیاندووە کە ئەوەی ئەوە بکات خراپترینی خەڵکە ، وەك دەفەرموێ: (( إن من شرار الناس من تدركهم الساعة وهم أحياء والذين يتخذون القبور مساجد ))[١٩٤]

واتە : خراپترینی خەڵك ئەوانەن کە ڕۆژی دواییان بەسەردا دێت و ئەوان زیندوون، هەروەها ئەوانەی کە گۆڕەکان دەکەنە مزگەوت . وە ئەمە لە کوێ کە خۆی چەندین جار ئەو کارەی کردووە ؟

---

[١٩٤] حسن - (بەززار) لە موسنەدەکەیدا (البحر الزخار) دا ، لە ژێر ناونیشانی : (عاصم بن بهدلة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٢٦) ، هەروەها (الشاشي) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند عبد الله بن مسعود رضي الله عنه - ما روى أبو وائل شقيق بن سلمة الأسدي عن عبد الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٨١) ، هەروەها (ابن خزيمة) لە کتابی (المواضع التي تجوز الصلاة عليها) ، بابی : (الزجر عن اتخاذ القبور مساجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٦٢) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (التاريخ) ، لە ژێر ناونیشانی: (ذكر البيان بأن من أدرك الساعة وهو حي كان من شرار) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٩٥٧) ، هەروەها (ابن ابي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز)، لە ژێر ناونیشانی: (من كره زيارة القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٦١٢) ، هەروەها (ئەبی نوعەیم) لە کتێبی (اخبار أصبهان) دا ، بابی : (الألف - أحمد بن جعفر بن هانئ الصوفي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٨١) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الكبير) دا ، بابی : (من اسمه عبد الله - طرق حديث عبد الله بن مسعود ليلة الجن مع رسول الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٢١٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٩١٦) ، و (تحذير الساجد/ ح ٢٨) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٨٨) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

**چوارەم: نوێژکردن لەسەر مردووی نادیار (غائب):**

واتە: ئەوکەسەی کەلە وڵاتێکی تردا دەمرێ دروستە بە غائیبی نوێژی لەسەر بکەیت ، بە مەرجێ کە کەس نەبێ لەو شوێنەدا نوێژی لەسەر بکات

هەر بۆیە لەلای زانایانی ئەهلی عیلم سێ ڕای جیاواز هەیە لەم بارەیەوە:

**١) دروستە نوێژی نادیار (غائیب) لەسەر مردوو بکەیت***: ئەمەش مەزهەبی ئیمام (شافیعی) و لە گێڕانەوەیەکا ئیمام (ئەحمەد) یشە ، بەڵگەشیان:

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( أن رسول الله (ﷺ) نعى النجاشي في اليوم الذي مات فيه ، خرج إلى المصلى ، فصف بهم وكبر أربعا ))[195]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەی کە (نەجاشی) مرد خەڵکی ئاگادار کردەوە، و دەرچوو بەرەو نوێژگە (موصەڵلا) و خەڵکی ڕیز کرد و چوار (الله أكبر) ی لەسەر کرد

**٢) دروست نیە نوێژی نادیار (غائیب) لەسەر مردوو بکەیت***: چونکە ئەو نوێژەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کردی لەسەر (نەجاشی) تایبەت بوو ، لەبەر ئەوە نابێتە بەڵگە، ئەمەش مەزهەبی ئیمام (مالیك) و (ئەبوحەنیفە) یە .

**٣) دروستە نوێژی نادیار (غائیب) لەسەر مردوویە بکەیت کە کەس نەبێ لەو شوێنەدا نوێژی مردووی لەسەر بکات***، بەڵام ئەگەر بێتوو لە شوێنی خۆی نوێژی مردووی

---

* (زاد المعاد لإبن القيم/ ج ١، ص ١٩٧).

[195] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الرجل ينعى إلى أهل الميت بنفسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤٥)، هەروەها (مالیك) لە (موطأ) دا لە کتابی (الجنائز)، بابی: (التكبير على الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٢)، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند أبي هريرة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٦١٤).

* (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١٣٩).

لەسەر کرا ئەوە ئیتر پێویست ناکا لە شوێنێکی تر نوێژی غائیبی لەسەر بکرێت ، چونکە بە نوێژی ئەو موسوڵمانانەی شوێنی خۆی فەرزی کیفایەکە لەسەر موسوڵمانانی شوێنەکانی تر لاچووە: ئەمەش ڕاو بۆچوونی شێخی ئیسلام (ئیبنوتەیمیە) یە ، وە هەڵبژاردەی شێخ (ابن عثیمین) یشە ، بەڵگەشیان:

لەبەر ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هیچ حەدیسێ نەگێڕدراوەتەوە جگە لەوەی (نەجاشی) کە نوێژی نادیار (غائیب) ی کردبێ لەسەر مردوو ، ئەوەی (نەجاشی) ش لەبەر ئەوە بووە کە لەناو ئوممەتێکی موشریکدا مردوو بوو ، وە هیچ یەکێ لە موسوڵمانان لەوێ ئامادە نەبوو تا نوێژی مردووی لەسەر بکات ، لەبەر ئەوە پێویست بوو کەوا پێغەمبەر (ﷺ) ئەو نوێژە نادیارەی لەسەر بکات .

وە (ئیبنوحەزم) فەرموویەتی[*] : نوێژ لەسەر مردووی نادیار (غائیب) بە جەماعەت و تاك دەكرێت ، وە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بە جەماعەت نوێژی لەسەر پادشای حەبەشە (نەجاشی) کردووە ، لە کاتێکدا ئەو لەسەر زەوی حەبەشە مردبوو ، هەروەها یارەکانیشی بەڕیز لەدوایەوە نوێژیان کردووە ، ئەم کارەش ئیجماعێکە لەوانەوە کە دروست نیە کەس لێی لا بدات ، بەلام ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) پێچەوانەی ئەومن ، بەڵگەشیان نیە پشتی پێ ببەسترێت.

---

[*] (زاد المعاد لإبن القيم/ ج ١، ص ١٩٧).

[*] (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١٣٩).

**پێنجەم: نوێژکردن لەسەر خۆکوژ:**

زانایان لەم بارەیەوە سێ ڕای جیاوازیان هەیە:

**١) دروست نیە نوێژی لەسەر بکرێ*** : ئەمەش مەزهەبی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) و (ئەوزاعی) یە ، بەڵگەشیان:

لە (جابیر) ی کوڕی (سەموورە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أتي النبي (ﷺ) برجل قتل نفسه بمشاقص ، فلم يصل عليه ))[١٩٦] واتە : تەرمی پیاوێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) بە پەیکانێ خۆی کوشتبوو ، جا پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر نەکرد .

**٢) دروستە نوێژی لەسەر بکرێ:** ئەمەش قسەی (حەسەنی بەصری) و (قەتادە) و (مالیك) و (ئەبوحەنیفە) و (شافیعی) و جەماوەری زانایانە .

**٣) دروستە نوێژی لەسەر بکرێ ، بەڵام وا چاکترە پێشەوا و زانایانی وڵات نوێژی لەسەر نەکەن ، بۆ ئەوەی ببێ بە پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسانی تر*** : ئەمەش گێڕدراوەتەوە لە ئیمام (مالیك) و کەسانی تریشەوە .

**لەم بارەیەوە شێخی ئیسلام (ابن تيمية) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ*** : هەرکەسێك نوێژ نەکات لەسەریان بۆ ئەوەی ببنە پەند بۆ کەسانێکی تر وەك ئەوان ، ئەوە چاکە ، وە ئەگەر لە ڕووکەش (ظاهر) دا نەیکات ، بەڵام لە پاش ملەدا

---

* (شرح صحيح مسلم للنووي/ ج ٧، ص ٤٧).

[١٩٦] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ترك الصلاة على القاتل نفسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٥٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ترك الصلاة على من قتل نفسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٦٣).

* (شرح صحيح مسلم للنووي/ ج ٧، ص ٤٧).

* (الإختيارات العلمية / ص ٥٢).

بیکات ، بۆ ئەوەی هەردوو بەرژەوەندیەکە کۆ بکاتەوە ئەوە پێشترە لەوەی یەکێك لە بەرژەوەندیەکان بفەوتێت.

وە ئەوەی لە (جابیری کوڕی سەموورە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە ... ، ئەوە لەوانەیە بۆ سەرزەنشت بووبێت ، بۆ ئەوەی کەس ئەو کارە نەکات ، وەك چۆن نوێژی لەسەر قەرزدار نەکردووە ، وە فەرمانی داوە بە هاوەڵان نوێژی لەسەر بکەن .

**شەشەم: نوێژکردن لەسەر ئەوکەسەی کەلە داری (حەددا) دەمرێت:**

کەسێك کە لە داری (حەددا) بکوژرێ دەشۆرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت ، ئەو یش بە بەڵگەی ئەوەی (بوخاری) دەیگێڕێتەوە لە (جابیر) ە وە:

١- لە (جابیر) ی کوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رجلا من أسلم ، جاء النبي (ﷺ) فاعترف بالزنا ، فأعرض عنه النبي (ﷺ) حتى شهد على نفسه أربع مرات ، قال له النبي (ﷺ): أبك جنون ؟ قال: لا ، قال: آحصنت؟ قال: نعم ، فأمر به فرجم بالمصلى ، فلما أذلقته الحجارة فر ، فأدرك فرجم حتى مات . فقال له النبي (ﷺ) خيرا ، وصلى عليه ))[١٩٧]

واتە : پیاوێك لە هۆزی (ئەسلەم) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانی بەوەدا نا کە زینای کردووە ، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕا تا چوار جار لەسەر خۆی ئیعتیرافی کرد ، ئنجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئایا تۆ شێتی ؟ کابرا وتی:

---

[١٩٧] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الحدود) ، بابی : (الرجم بالمصلى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٨٢٠)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الحدود) ، بابی : (من اعترف على نفسه بالزنى) لە (ئەبوهورەیرە) وە گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٣٩٦) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الحدود) ، بابی: (رجم ماعز بن مالك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤٣٠) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الحدود) ، بابی : (ما جاء في درء الحد عن المعترف إذا رجع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٢٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ترك الصلاة على المرجوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٦).

نەخێر ، فەرمووی: ژنت هێناوە ؟ کابرا وتی: بەڵێ ، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بردیان بۆ شوێنی نوێژی جەژن لەوێ ڕەجمیان کرد ، جا لەو کاتەدا بەردەبارانیان دەکرد زۆری بۆ هات و هەڵهات ، پاشان گرتیانەوە هەتا مرد بەردە بارانیان کرد ، (جابیر) دەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی بە باشی دواو ، نوێژی لەسەر کرد .

٢- لە (عیمران) ی کوڕی (حوصەین) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن امرأة من جهينة أتت نبي الله (ﷺ) وهي حبلى من الزنى، فقالت: يا نبي الله (ﷺ)، أصبت حدا ، فأقمه علي ، فدعا نبي الله (ﷺ) وليها، فقال: أحسن إليها، فإذا وضعت فأتني بها، ففعل، فأمر بها نبي الله (ﷺ)، فشكت عليها ثيابها، ثم أمر بها فرجمت ، ثم صلى عليها ، فقال له عمر: تصلي عليها يا نبي الله (ﷺ) وقد زنت؟ فقال: لقد تابت توبة لو قسمت بين سبعين من أهل المدينة لوسعتهم ، وهل وجدت توبة أفضل من أن جادت بنفسها لله تعالى؟ ))[١٩٨]

واتە: ژنێکی جوهەینەیی زۆڵێکی لە سکدا بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەر عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! شایانی حەددم حەددم لێ بدە ، پێغەمبەر (ﷺ) هەقداری ژنەکەی بانگ کرد و فەرمووی: باشبە بۆی و چاك بە لەگەڵی ، کە سکەکەی دانا ژنەکەم بۆ بێنە ، ئەویش ئاوای کرد و فەرمایشتەکەی پێغەمبەری بەجێ هێنا، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی فەرموو ژنەکەیان بە جلەکانی خۆیەوە شەتەك دا هەتا لە کاتی سەنگە سارکردندا لەشی دەرنەکەوێ، جا فەرمانی کرد

---

[١٩٨] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الحدود)، بابی: (من اعترف على نفسه بالزنى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤٠٨)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الحدود)، بابی: (المرأة التي أمر النبي برجمها من جهينة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤٤٠)، هەروەها (ترمزی) لە کتابی (الحدود)، بابی: (تربص الرجم بالحبلى حتى تضع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٣٥)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصلاة على المرجوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٦).

بەردەباران کرا ، لە پاشا خۆی نوێـژی مـردووی لەسـەر کـرد ، (عومـەر) یـش پێـی وت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ! ئەمـە داوێـن پیـسی کـردووە کەچـی تـۆ نوێـژی لەسەر دەکەی! فەرمووی: بەڕاستی ئەمە تەوبەیەکی وەهای کـردووە ئەگـەر بێـت و دابەشبکرێ بەسەر حەفتا کەس لە خەڵکی مەدینەدا بەشی هەموویان دەکا، تەوبـە لەوە باشتر دەبێ چی بێ کە گیانی خۆیی بەخشی لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە !

**حەوتەم: نوێژکردن لەسەر دزی تالأنی:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون: کە نوێژ دەکرێت لەسەر تـەرمی ئەوکەسـەی دزی لەو سامان و ماڵە بکات کە لە جەنگدا دەگیرێت (واتە: غەنیمەت) ، وە ئەوەی خـۆی دەکوژێت ، وە هەروەها ئەوانەی کە سەرپێچی فەرمانی خوا دەکەن و دەمرن.

**ئیمـام (نـەوەوی) فەرموویـەتی**[*]: (قاضـی) فەرموویـەتی: بۆچـوونی تێکـڕای زانایـان لەسەر ئەوەیە کە نوێـژ بکرێـت لەسـەر هـەموو موسـوڵمانێك لـە تۆڵـەدا کـوژرا ، یـا ڕەجم کرا، یا منداڵی زۆڵ بوو .

١- **(ئیبنوحەزم) فەرموویەتی:** نوێژ لەسەر هەموو موسوڵمانێك دەکرێـت ، چـاك بێـت یان خراپ ، لـە تۆڵـەدا کوژرابێـت یـا لـە شـەڕی نێـوان دوو موسـوڵماندا ، یـا لەسـەر سـتەم کـردن و دەسـتدرێژی ، جـا ئیمـام و کەسـانی تـر نوێـژی لەسـەر دەکـەن ، وە هــەروەها نوێــژ لەســەر بیدعەچــی دەکرێــت بــە مــەرجێك بــەو بیدعەیــەی نەگەیشتبێتە سنووری کوفر ، هەروەها کەسێك خـۆی کوشـتبێت یـا کەسـێکی تـری کوشـتبێت هـەر چـەندە خـراپترین کـەس بێـت لەسـەر زەویـدا ، بـە مـەرجێك بـە موسـوڵمانی مردبێـت هـەر نوێـژی لەسـەر دەکرێـت ، بـەپێی فەرمانـە گـشتیەکەی

---

[*] (شرح صحیح مسلم للنووي/ ج ٧، ص ٤٧).

پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( صلوا على صاحبكم )) [199] واتە: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن ، موسوڵمانیش هاوەڵی ئێمەیە ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ﴾ (الحجرات/ ١٠) واتە: بەڕاستی باوەڕداران.هەموو برای یەکن . هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ ﴾ (التوبة/ ٧١) واتە: پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار دۆست و یارمەتیدەری یەکترن.

وە هەرکەس بەرگری نوێژکردن بکات لەسەر موسوڵمان ئەوە تاوانێکی گەورە دەکات ، وە تاوانبار زیاتر پێویستی بە پاڕانەوەی برا موسوڵمانەکانی هەیە وەك لە پیاوچاك !!

٢- (**عەطا**) **فەرموویەتی**: (( لا أدع الصلاة على من قال: لا إله إلا الله ، قال (تعالى): ﴿من بعد ما تبين لهم أنهم من أصحاب الجحيم﴾ )) [200] واتە: وازناهێنم لە نوێژکردن لەسەر کەسێك کە وتبێتی (لا إله إلا الله) ، چونکە خوای گەورە

---

[199] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الفرائض) ، بابی : (قول النبي: من ترك مالا فلأهله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٣١) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الفرائض) ، بابی : (من ترك مالا فلورثته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٣٣) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الصلاة على المديون) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٠) ، هەروەها (نەسانی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على من عليه دين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٦٣) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الصدقات) ، بابی : (من ترك دينا أو ضياعا فعلى الله وعلى رسوله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤١٥).

[200] (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على ولد الزنا والمرجوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٠٢) ، هەروەها (ابن المنذر) لە کتێبی (الأوسط) دا لە کتابی (الصلاة على الجنائز) ، بابی : (ذكر الصلاة على من قتل في حد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠١٦).

فەرموویــــەتی: ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ (التوبــة/ ١١٣)

واتە: لە دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە بەڕاستی ئەوان دۆزەخین .

٣- (ئیبراهیمی نەخەعی) فەرموویەتی: (( لم یکونوا یحجبون الصلاة علی أحد من أهل القبلة ))[٢٠١] واتە: هەرگیز موسوڵمانە پێشووەکان لە هاوەڵان و تابیعین ڕێگرییان نەدەکرد لە نوێژکردن لەسەر هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە ، وە ئەوکەسەش کە خۆی بکوژێت نوێژی لەسەر دەکرێت .

هەروەها فەرموویەتی: (( السنة أن یصلی علی المرجوم ))[٢٠٢] واتە: سوننەت وەهایە نوێژ لەسەر ڕەجم کراو بکرێ .

هەروەها فەرموویەتی: (( یصلي علی من قتله الحدود ، وعلی من قتل نفسه ، وعلی من مات غرقا في البحر ))[٢٠٣] واتە : نوێژی مردوو لەسەر کەسێ دەکرێ کەلە داری حەددا کوژرابێ ، وە لەسەر ئەوکەسەی کە خۆی کوشتووە ، وە لەسەر ئەوکەسەش کە لەناو دەریادا نوقم بووە و خنکاوە.

---

[٢٠١] (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة علی ولد الزنا والمرجوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٠٣) ، هەروەها (ابن المنذر) لە کتێبی (الأوسط) دا لە کتابی (الصلاة علی الجنائز) ، بابی : (ذکر الصلاة علی من قتل في حد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠١٦).

[٢٠٢] (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة علی ولد الزنا والمرجوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤١٠).

[٢٠٣] (ابن شاهین) لە کتێبی (ناسخ الحدیث ومنسوخه) دا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (الخلاف في أمر هذه الأحادیث) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٤).

٤- (قەتادە) فەرموویەتی: (( ... ، لا أعلم أحدا من أهل العلم اجتنب الصلاة على من قال: لا إله إلا الله ))[٢٠٤] واتە: ... ، کەس نازانم لە زانایانی ئیسلام دووری کردبێ لەوەی نوێژ لەسەر کەسێك بکات کەو تبێتی (لا إله إلا الله).

٥- (ئیبنوسیرین) فەرموویەتی: (( ما علمت أحدا من أصحابنا ترك الصلاة على أحد من أهل القبلة ))[٢٠٥] واتە: کەس نازانم لە هاوەڵانمان کەوا نوێژی مردووی لەسەر ئەهلی قیبلەی تەرك دابێت .

٦- (حەسەنی بەصری) فەرموویەتی: نوێژ دەکرێت لەسەر هەرکەسێك کە وتبێتی (لا إله إلا الله) و نوێژی بەرەو قیبلە کردبێت ، چونکە نوێژ بۆ خۆی شەفاعەتە .

٧- لە (ئەبوغالیب) ە وە هاتووە کەوا فەرموویەتی: (( قلت لأبي أمامة الرجل يشرب الخمر فيموت أيصلى عليه ؟ قال: نعم ، لعله اضطجع على فراشه مرة فقال: لا إله إلا الله فغفر له بها ))[٢٠٦] واتە: بە (ئەبی ئومامەی باهیلیم) وت: پیاوی عارەق خۆر نوێژی لەسەر دەکرێت؟ فەرمووی: بەڵێ ، بە ئومێدی ئەوەی ڕۆژێك لەسەر جێگاکەی ڕاکشابێت و وتبێتی: (لا إله إلا الله) و خوا لێی خۆش بووبێت .

---

[٢٠٤] (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على ولد الزنا والمرجوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤١١).

[٢٠٥] (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على ولد الزنا والمرجوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤١٢).

[٢٠٦] (ابن ابي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الرجل يقتل نفسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٦٥٦).

**هەشتەم: نوێژکردن لەسەر بێ بڕوا و هاوبەش پەیداکەر:**

**١- خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ:** ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾ **(التوبة: ٨٤) واتە: ئەی پێغەمبەر هیچ کات لەسەر هیچ لەو دووڕووانە نوێژ نەکەی کە مرد ، هەروەها لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە ، چونکە بەڕاستی ئەوانە باوەڕیان بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی نەبوو، و کاتێ کە مردیشن لە ئایین دەرچوو بوون.**

**٢- هەروەها فەرموویەتی:** ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِىِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ﴾ **(التوبة: ٨٤) واتە: بۆ پێغەمبەرو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، ڕەوا نیە داوای لێخۆشبوون بۆ موشریك و هاوبەش پەیداکەران بکەن هەر چەندە ئەوانە خزمی نزیکیش بن ، دوای ئەوەی کە بۆیان ڕوون بۆتەوە کە بەڕاستی ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن * جا داوای لێخۆشبوونی (ئیبراهیم) بۆ باوکی لەبەر بەڵێنێك بوو کە پێی دابوو ، کاتێك بۆی دەرکەوت بەڕاستی باوکی دوژمنی خوایە ، ئیتر خۆی لێ بەری کرد .**

**نۆیەم: نوێژکردن لەسەر مردوو لە ناو مزگەوتدا:**

**لە (عەبباد) ی کوڕی (عبدالله) ی کوڕی (زوبێر) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن عائشة ، أمرت أن يمر بجنازة سعد بن أبي**

وقاص في المسجد ، فتصلي عليه ، فأنكر الناس ذلك عليها ، فقالت: ما أسرع ما نسي الناس ، ما صلى رسول الله (ﷺ) على سهيل ابن البيضاء إلا في المسجد ))[٢٠٧]

واتە: (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمانی کرد کەوا جەنازەکەی (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) بە ناو مزگەوتدا تێپەڕێنن ، بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات ، جا خەڵکی ڕەخنەی ئەوەیان لێ گرت ، جا فەرمووی: چەند زوو خەڵکی لە بیریان چوو ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر (سوهەیلی کوڕی بەیضاء) نوێژی نەکرد ئیللا لە ناو مزگەوتدا نەبێت.

ئەمەش مەزهەبی (حەنبەلیەکان) ە ، وە بەڵگەشیان بە حەدیسەکەی دایکە (عائیشە) هێناوەتەوە*.

بەڵام واباشە شوێنێ تایبەت بکرێت بۆ جەنازە لە غەیری مزگەوتدا لەبەر پاك ڕاگرتنی مزگەوت و ، هەروەها موستەحەببە کە ئەو شوێنە نزیکی گۆڕستانەکە بێت لەبەر ئاسان کاری بۆ خەڵکی ، ئەمەش مەزهەبی ئیمام (شافیعی) یە*.

هەروەها هاوەڵان لە مزگەوتدا نوێژیان لەسەر تەرمی (ئەبوبەکری صدیق) و (عومەری کوڕی خەتتاب) کردووە ، بێ ئەوەی کەس نکوڵی ئەو کارەی کردبێت ، چونکە ئەویش نوێژێکە وەك نوێژەکانی تر .

بەڵام ئیمام (مالیك) و (ئەبوحەنیفە) دەفەرموون*: نوێژکردن لەسەر مردوو لەناو مزگەوتدا کەراهەتی هەیە ، بەڵگەشیان: لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت)

---

[٢٠٧] صحيح – (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الجنازة في المسجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٤٩) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الصلاة على الميت في المسجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٣٣) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على لجنازة في المسجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٦٦).

* (الموسوعة الفقهية/ ج ١٦، ص ٣٦).

* (الموسوعة الفقهية/ ج ١٦، ص ٣٦).

دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( مـن صـلى على جنازة في المسجد ، فلا شيء عليـه ))[208] واتـه : هەرکـەس لـه مزگەوتـدا نوێـژ لەسەر تەرمێك بکات هیچی لەسەر نابێت لە تاوان .

ئـەم فەرموودەیـە لەلایەکـەوە بـە کـردەوەی پێغەمبـەرو (ﷺ) هـاوەڵان بـەرەنگاری کراوەو لەلایەکی تریشەوە سەنەدەکەی (ضعیف) ە.

**دەیەم: تاقە نوێژێ بۆ چەند تەرمێ دەبێ:**

١- لە (عەممار) ی نۆکەری (حاریث) ی کوڕی (نەوفـەل) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أنـه شـهد جنـازة أم كلثـوم ، وابنهـا ، فجعـل الغـلام مما يلي الإمام ، فأنكرت ذلك ، وفي القوم ابن عباس ، وأبو سعيد الخدري ، وأبوقتادة، وأبو هريرة ، فقالوا: هذه السنة ))[209]

واته : لەگـەڵ تـەرمی (ئـوم کـەلثـوم)* و کوڕەکەیـدا بـووم ، جـا تـەرمی کوڕەکـەیان لەبەردەم پێشنوێژەوە دانـاو تـەرمی دایکەکەشـی لـە پاڵیـا لـە ڕووی قیبلـەوە دانـا ، منـیش ئەمـەم پەسـەند نـەکرد ، (ئیبنوعـەبباس) و (ئەبوسـەعیدی خـودری) و

---

* (فتح الباري/ ج ٣، ص ٢٢٤).

[208] **ضعيف** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الجنازة في المسجد) گێڕاویەتـەوە بە ژمارە (٣١٩١) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابی داود/ ج ٣، ص ٢٠٧، ح ٣١٩١) ، و (ضعيف الجامع الصغير/ ح ٥٦٦٧) دا فەرموویەتی: (ضعیف) ە.

[209] **صحيح** - (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (إذا حضـر جنـائز رجـال ونـساء مـن يقـدم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩٣) ، هـەروەها (بەیهـەقی) لـە (الـسنن الكبرى) دا لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (جنـائز الرجـال والنـساء إذا اجتمعـت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٦٥٢٦) ، هـەروەها شـێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٣، ص ٢٠٨، ح ٣١٩٣) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

* (**ئوم کەلثوم**) کچی پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) ە و ، هاوسەری (عومەری کوڕی خەتتاب) بوو. کوڕەکەشی ناوی (زەید) بوو .

(ئەبوقەتادە) و (ئەبوهورەیرە) لەوێ بوون لەگەڵ پیاوەکانا ، جا فەرموویان: خۆی ئاوا سوننەتە (کە نێرینە لەلای پێشنوێژەوە بێ و مێیینەش لەلای قیبلەوە بێ ، وەك حاڵی ئەم دایك و کوڕە).

٢- لە (نافیع) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( یزعم ، أن ابن عمر صلى على تسع جنائز جميعا ، فجعل الرجال يلون الإمام ، والنساء يلين القبلة ، فصفهن صفا واحدا ))[٢١٠]

واتە : گوایە (ئیبنوعومەر) نوێژی لەسەر نۆ تەرم پێکەوە کردووە ، تەرمی پیاوەکانی دەخستە لای پێشنوێژەوە و تەرمی ئافرەتەکانیشی دەخستە لای قیبلەوە، وە هەمووشیانی کردبوو بەیەك ڕیز لەپێش خۆیەوە یەك لەپاڵ یەکا بەرەو قیبلە دانابوون و ئنجا یەك نوێژی لەسەر هەر نۆیان کرد .

**پانزەیەم: نوێژکردن لەسەر تەرم لە (موصەللا) دا:**

هەروەها موستەحەببە نوێژی مردوو لە (موصەللا) دا بکرێ ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆرجار نوێژی مردووی لەسەر تەرم لە (موصەللا) دا کردووە:

١- (ابن حبیب) دەفەرموێ: ئەو موصەللایەی کە بۆ نوێژکردن لەسەر جەنازە لە مەدینە تەرخان کرابوو بە پاڵی مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە بوو (ﷺ) ، لەلای خۆرهەڵاتەوە*.

---

[٢١٠] **صحیح** – (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (اجتماع جنائز الرجال والنساء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٧٨) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (جنائز الرجال والنساء إذا اجتمعت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٢٥) ، هەروەها (عبدالرزاق) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف الصلاة على الرجال والنساء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٣٢) ، هەروەها (ابن الجارود) لە کتێبی (المنتقى) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٢٨) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائي/ ج ٤، ص ٧١، ح ١٩٧٨) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٥٢) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

٢- لەو حەدیسەی کە (ئەبوهورەیرە) (خوای لێ ڕازی بێت) دەربارەی نوێژکردن لەسەر (نەجاشی) بە غائیبی بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: (( إن النبي (ﷺ) صف بهم بالمصلى ، فكبر عليه أربعا ))[٢١١] واتە : پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵەکانی لە موصەلاّ ڕیزکرد و ، چوار (الله أكبر) ی لەسەر تەرمی (نەجاشی) کرد .

٣- لە (عبدالله) ی کوڕی (عومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن اليهود ، جاءوا إلى النبي (ﷺ) برجل منهم وامراة زنيا ، فأمر بهما ، فرجما قريبا من موضع الجنائز عند المسجد ))[٢١٢]

واتە : لە سەردەمی پێغەمبەرا (ﷺ) جوولەکەکان پیاو و ئافرەتێکیان هێنا کە زینایان کردبوو ، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد کەوا ڕەجمیان بکەن ، جا موسوڵمانانیش لەو شوێنەی کە نزیکی نوێژکردن بوو لەسەر جەنازە لەلای مزگەوتەکە هەردووکیان ڕەجم کرد .

**(ابن حجر) ی عەسقەلانی دەفەرموێ:** حەدیسەکەی (ئیبنوعومەر) بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە نوێژکردن لەسەر تەرمەکان - لە سەردەمی پێغەمبەرا (ﷺ) - شوێنی دیاریکراوی خۆی هەبووە .

---

* (فتح الباري/ ج ٣، ص ٢٣٧).

[٢١١] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الجنائز بالمصلى والمسجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٢٧) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في التكبير على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٠٢).

[٢١٢] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الجنائز بالمصلى والمسجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٢٩) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الحدود) ، بابی : (رجم اليهود أهل الذمة في الزنى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤١٤).

**دوانزەیەم: نوێژکردن لەسەر تەرم لەناو گۆڕستاندا:**

لــە (ئەنــەس) ی کــوڕی (مالیــك) ە وە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە کــەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) نهى أن يصلى على الجنائز بين القبور ))[٢١٣]

واتە : پێغەمبەری خوا ( ﷺ) قەدەغەی کردووە کەوا نوێژ لە سەر جەنازە بکرێت لە ناو گۆڕستاندا .

**بـەڵام جومهـوری زانایـان دەفـەرموون:** کەراهـەتی هەیـە نوێـژ لەسـەر تـەرم لـەناو گۆڕستاندا بکرێت ، وە ئەو قسەیە لە (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب) و (عبدالله ی کوڕی عەمر) و (ئیبنوعەبباس) ە وە گێڕدراوەتەوە .

هـەروەها ئیمـام (شـافیعی) و (عـەطـا) و (ئیبراهیمـی نەخـەعی) و (ئیـسحاق) و (ابن المنذر) یش هەمان بۆچوونیان هەیە ، بەڵگەشیان:

لــە (ئــەبو ســەعید) ی خودرییــەوە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە کــەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( الأرض كلها مسجد إلا الحمام والمقبرة ))[٢١٤] واتـە : سـەر زەوی هـەمووی مزگەوتـە جگـە لـە گۆڕسـتان و شـوێنی خۆشۆردن (حەمام).

---

[٢١٣] **إسناده حسن** - (تەبەرانی) لە (المعجم الأوسط) دا ، بابی : (الميم من اسمه: محمد) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٥٧٣٣) ، هـەروەها شـێخ (هـەیثـەمـی) لـە (مجمـع الزوائـد/ ج ٣، ص ٣٦) دا و ، شـێخ (ئەلبانی) ش لە (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٥٤) دا فەرموویانە: ئیسنادەکەی (حسن) ە.

[٢١٤] **صحيح** - (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الصلاة) ، بـابی : (في المواضـع الـتي لا تجـوز فيهـا الـصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩٢) ، هەروەها (ترمذی) لـە کتـابی (الصلاة) ، بـابی : (ما جاء أن الأرض كلها مسجد إلا المقبرة والحمام) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣١٧) ، هـەروەها (ابـن ماجـه) لـە کتـابی (المساجد والجماعات) ، بـابی : (المواضع الـتي تكره فيها الصلاة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٧٤٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ١ ، ص ١٣٢ ، ح ٤٩٢) ، و (جامع الترمذي/ ج ٢ ، ص

**سیانزەیەم: نوێژكردن لەسەر مردووی ناو گۆڕ:**

زانایانی ئەهلی عیلم لەم بارەیەوە سێ ڕای جیاوازیان هەیە * :

**١) دروستە نوێژی لەسەر بكرێت:** ئەمەش قسەی زۆربەی ئەهلی عیلمە لە هاوەڵان و شوێنكەوتوانیان ، وە هەروەها قسەی (ابن المبارك) و (شافیعی) و (ئەحمەد) و (ابن حزم) یشە .

جا ئەوانەی ئەم ڕایەیان هەیە ، هەندێكیان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئەو نوێژكردنەیان ڕێگە پێداوە ، وە هەندێكی تر بۆ ماوەی یەك مانگ ڕێگەیان پێداوە ، وە هەندێكی تریان هەتا ئەو كاتەی لاشەی مردووەكە نەپووكابێتەوە ، وە هەندێكی تریان بۆ هەتا هەتا ڕێگەیان پێداوە .

**٢) بەهیچ شێوەیە نوێژكردن لەسەر گۆڕ دروست نیە:** ئەمەش قسەی لە گێڕانەوەیەكدا (ئیبراهیمی نەخەعی) و (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) ە.

**٣) هەتا مردووەكە نە نێژرێ نوێژكردن لەسەری دروست نیە:** ئەمەش قسەی لە گێڕانەوەیەكی ترا (ئیبراهیمی نەخەعی) و (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) یشە.

**چواردەیەم: مردن لە غەریبیدا:**

لە (عبدالله) ی كوڕی (عەمر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( مات رجل بالمدينة ممن ولد بها ، فصلى عليه رسول الله (ﷺ) ، ثم قال: يا ليته مات بغير مولده ، قالوا: ولم ذاك

---

١٣١ ، ح ٣١٧) ، و (سنن ابن ماجه/ ج ١ ، ص ٢٤٦ ، ح ٧٤٥) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ١ ، ح ٧٣٧) دا فەرموویەتی : (صحیح) ە.

* (الأم/ ج ١، ص ٤١٤) ، و (المجموع/ ج ٥، ص ٢١٠) ، و (المدونة/ ج ١، ص ١٧٠) ، و (المغني/ ج ٣، ص ٥٠٠) ، و (نيل المآرب/ ج ١، ص ٦٦) ، و (المحلى/ ج ٥، ص ١٣٩) ، و (البدائع/ ج ١، ص ٣١٤).

يـا رسـول الله (ﷺ) ؟ قـال: إن الرجـل إذا مـات بغـير مولـده قـيس لـه مـن مولـده إلى منقطع أثره في الجنة ))[٢١٥]

واته : پیاوێ له مەدینه له دایك بـوو بـوو ، وه هـەر لـەوێش مـرد ، جا پێغەمبـەر (ﷺ) كه نوێژی لەسەر كـرد فـەرمووی: خۆزگـه لـه شـوێنێكی تـر دەمـرد نـەك لـەم شوێنەی خۆیدا . وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! ئـەوه لەبەرچی ؟ فـەرمووی: لەبەر ئەوە ئەگەر پیاوێ له شوێنی لەدایك بوونی خۆی نەمرێ ، له شوێنی لەدایك بوونیەوه بۆی دەپێون تا ئەو شوێنەی كه دەمرێ و شوێنەواری كوێر دەبێتەوه ، بە قەد ئەوەی له بەهەشتا دەدەنێ !

**پانزەیەم: دروستێتی نوێژی ئافرەت لەسەر تەرم:**

دروسته بۆ ئافرەت نوێژ بكات لەسـەر جـەنازه وەك پیـاو ، جا بـه تـەنها بیكات یا لەگـەڵ جەماعەتـدا وەك یەكـه ، چـونكه (عومـەری كـوڕی خـەتتاب) چـاوەڕوانی (أم عبدالله) ی كرد هەتا نوێژی لەسەر (عوتبه) كرد .

---

[٢١٥] حسن - (نەسائی) لـه كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (الموت بغير مولـده) گێڕاویەتـەوه بـه ژمـاره (١٨٣٢)، هەروەها (ابن ماجه) له كتابی (الجنائز)، بابی : (ما جاء فيمن مـات غريبـا) گێڕاویەتـەوه بـه ژمـاره (١٦١٤) ، هـەروەها (ابـن حبـان) لـه كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في الـصبر وثـواب الأمراض والأعراض - ذكـر إعطـاء الله المتـوفى في غربتـه مثـل مـا بـين مولـده إلى) گێڕاویەتـەوه بـه ژماره (٢٩٨٦)، هەروەها (ئەحمەد) له (مسند) ه كەیـدا ، لـه ژێـر ناونیـشانی: (مـسند عبـد الله بـن عمرو بن العاص رضي الله عنهما) گێڕاویەتـەوه بـه ژمـاره (٦٤٦٤) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـه (سنن النسائی/ ج ٤، ص ٧، ح ١٨٣٢) ، و (سنن ابن ماجه/ ج ١، ص ٥١٥، ح ١٦١٤) ، و (صحيح الجامع الـصغير/ ح ١٦١٦) ، و (مـشكاة المـصابيح/ ج ١، ح ١٥٩٣) ، و (تخـريج أحاديـث مـشكلة الفقـر وكيـف عالجها الإسلام/ ص ٥٢، ح ٣٦) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

هـەروەها ڕیوایەتەکـەی (عـەببادی کـوڕی عبـدالله ی کـوڕی زوبێـر) کـەوا دایکـە (عائیـشە) نوێـژی لەسـەر تـەرمی (سـەعدی کـوڕی ئـەبی وەققـاص) کـرد لـەناو مزگەوتدا .

**(نەوەوی) فەرموویەتی:** دەبێ جەماعەتیش سوننەت بێ بۆیان وەك نوێژەكانی تر.

هـەروەها (حەسـەنی کـوڕی صـالّح) و (سـوفیانی ثـوری) و ئیمـام (ئەحمـەد) و (حەنەفیەکان) یش هەمان ڕایان هەیـە ، **بەڵام ئیمام (مالیـك) دەفـەرموێ:** دەبـێ بـە تەنها نوێژەکە بکەن نەك بە جەماعەت .

**شانزەیەم: ئەوەی لەپێشترە بۆ نوێژکردن لەسەر مردووەکە:**

زانایـان جیاوازییـان هەیـە لـەوەدا کە ئایا کێ لـە پێـشترە بـە ئیمامـەت لـە نوێـژی مـردوودا ؟ **جـا وتـراوە:** لـە پێـشترین کـەس بـۆ ئیمامـەت سەرپەرشـتی کـەری مردووەکەیـە ، پاشان فـەرمانڕەوا ، پاشـان بـاوك و بـاپیران ، پاشـان کـوڕو کـوڕەزاو بـەرەوخوار ، پاشـان نـزیکترین خزمـی پـشتی ، ئەمـەش بۆچـوونی (مالیکیـەکان) و (حەنبەلیەکان) ە.

**وە وتراوە:** لە پێشترین کـەس باوکـە ، پاشـان بـاپیرە ، پاشـان کـوڕە ، پاشـان کـوڕەزا ، پاشان برا ، پاشان برازا ، پاشان مام ، پاشـان ئـامۆزا ، بـەپێی تـەرتیبی خزمایـەتی ، ئەمەش بۆچوونی ئیمام (شافیعی) و (ئەبویوسف) ە.

**بەڵام ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (محمدی کوڕی حەسەن) دەفەرموون:** وای ئەگەر ئامـادەبوو لە پێشترین کەسە ، پاش ئـەو (قـازی) ، پـاش ئـەو ئیمـامی ئـەو شـوێنە ، پـاش ئـەو سەرپەرشتی کەری ژنی مردووەکە ، پاشان بەپێی نزیکی خزمایەتی ، جگە لە باوك کە دەبێت پێش کوڕی مردووەکە بخرێت ئەگەر هەردووکیان ئامادەبوون .

## سێ بابەتی تایبەت

### ١) منداڵی نە باڵغ دەتوانی نوێژی مردووی لەسەر نەکەیت

لـە دایکـە (عائیـشە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنــەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( مـات إبـراهیم ابـن الـنبي (ﷺ) ، وهـو ابـن ثمانية عشر شهرا فلم يصل عليه رسول الله (ﷺ) ))[٢١٦]

واتە : (ئیبراهیم) ی کوڕی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) وەفـاتی کـرد کاتێـك کـە تەمـەنی هەژدە مانگ بوو ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لە سەر نەکرد .

### ٢) ئایا لەسەر بەشێ لە مردووی مرۆڤ نوێژ دەکرێ؟

لەو بارەیەوە هەندێ ئاسار هەن لە هاوەڵانەوە کە ئاماژەیان پێ دەکەین بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەسەلەکە:

أ- لـە (عـامیر) ی کـوڕی (شـەراحیل) ی شـەعبییەوە (ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ) دەگێڕێتــەوە کــەوا فەرموویــەتی: (( أن عمــر ، صــلى علــى عظــام بالــشام ))[٢١٧]

واتە : (عومەری کوڕی خەتتاب) لە وڵاتی (شام) نوێژی لەسەر چەند ئێسکێ کرد .

---

[٢١٦] حسن - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الصلاة على الطفل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٨٧) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (الملحق المستدرك من مسند الأنـصار - حـديث الـسيدة عائـشة رضـي الله عنهـا) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٥٧٣٠) ، هـەروەها (بەیهەقی) لە کتێبی (معرفة السنن والآثار) دا لە کتابی (الجنائز) ، لـە ژێـر ناونیـشانی: (الـسقط) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢١٧٩) ، هـەروەها شێخ (ئـەلبانی) لـە (سـنن ابـی داود/ ج ٣، ص ٢٠٧، ح ٣١٨٧) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٤٤) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

[٢١٧] مرسل - (ابـن ابـي شيبة) لـە (مـصنف) ە کەیـدا لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (في الـصلاة علـى العظام وعلى الرءوس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٦٩٧).

ب- لە (خالید) ی کوڕی (مەعدان) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن أبا عبيدة صلى على رءوس بالشام ))[218]

واتە : ئەبوعوبەیدە (کە ناوی: عامیری کوڕی عبدالله ی کوڕی مەسعودی هەذلییە) لە وڵاتی (شام) نوێژی لەسەر کۆمەڵە کەللە سەرێ کرد .

ج- (ابن أبي شيبة) لە (سوفیانی ثوری) یەوە ئەویش لە پیاوێکەوە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن أبا أيوب ، صلى على رجل ))[219]

واتە : (ئەبوئەییوب) ی ئەنصاری نوێژی لەسەر قاچێ کرد .

**جا زانایانی ئەهلی عیلم لەم بارەیەوە سێ ڕای جیاوازیان هەیە :**

**یەکەم:** نوێژی لەسەر دەکرێ ئیتر ئەو پارچەیە کەم بێ یا زۆر ، ئەمەش قسەی ئیمام (شافیعی) و (ئەحمەد) ە*، وە (ئیبنوحەزم) یش هەمان شتی فەرمووە*.

**دووەم:** ئەگەر زیاد لە نیوەی لاشەکە بەردەست کەوت ئەوە دەشۆرێ و نوێژیشی لەسەر دەکرێ ، بەڵام ئەگەر نیوەی لاشەکەی دەست کەوت ئەوە نە دەشۆرێ و نە نوێژیشی لەسەر دەکرێ ، ئەمەش قسەی ئیمام (ئەبوحەنیفە) یە .

---

[218] **مرسل** – (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الصلاة على العظام وعلى الرءوس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٦٩٥) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتێبی (معرفة السنن والآثار) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الشهيد ومن يصلى عليه ويغسل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٠٤).

[219] **ضعيف** – (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الصلاة على العظام وعلى الرءوس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٦٩٦).

* (المجموع لإمام النووي/ ج ٥، ص ٢١٤).

* (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١٣٨).

وە ئیمام (مالیك) یش هەمان بۆچوونی هەیە ، بەڵام ئەو دەفەرموێ: تەنها نوێژی لەسەر ناکرێ*.

سێیەم: بە هیچ شێوەیەك نوێژی لەسەر ناکرێ ، ئەمەش قسەی (داودی ظاهری) یە*.

**٣) تێکەڵ بوونی لاشەی مردووی موسوڵمان و هاوبەشدانەر**

ئەگەر لاشەی مردووی چەند موسوڵمانێ تێکەڵ بە لاشەی چەند هاوبەشدانەرێ بوو ، وە نەدەتوانرا لەیەك جیا بکرێنەوە ، ئەوە لەلای زانایانی ئەهلی عیلم دوو ڕاو بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەری:

**یەکەم:** ئەگەر لاشەی مردووی کۆمەڵە موسوڵمانێ تێکەڵ بە لاشەی کۆمەڵە هاوبەشدانەرێ بوو، وە نەدەتوانرا لەیەك جیا بکرێنەوە ئەوە لەم حاڵەتەدا بە گشتی نوێژی مردوو لەسەر هەموویان دەکرێ ، ئەمەش مەزهەبی ئیمام (مالیك) و (شافیعی) و (ئەحمەد) ە*.

**دووەم:** ئەگەر لاشەی مردووی کۆمەڵە موسوڵمانێ تێکەڵ بە لاشەی کۆمەڵە هاوبەشدانەرێ بوو، وە لاشەی موسوڵمانەکان زۆرتر بوو لەوانی تر، وە نیشانەیەکیش نەبوو بۆ ناسینەوەی لاشەی بێ بڕوا و هاوبەشدانەرەکان ، ئەوە لەم حاڵەتەدا هەموویان دەشۆرێن و نوێژی مردوویان لەسەر دەکرێ ، وە ئەگەر هاتوو لاشەی مردووە بێ بڕواکان زۆرتر بوو لە لاشەی موسوڵمانە مردووەکان، وە نەدەتوانرا لاشەی موسوڵمانەکان جیابکرێتەوە مەگەر بە نیشانەیەکی دیاریکراو، ئەوە لەم حاڵەتەدا نوێژی مردوو لەسەر هیچکام لە تەرمەکان ناکرێ ، لەبەر

---

* (المجموع لإمام النووي/ ج ٥، ص ٢١٤).

* (المجموع لإمام النووي/ ج ٥، ص ٢١٤).

* (المغني لإبن قدامة/ ج ٢، ص ٤٧٧).

ئەوەی خوای گەورە قەدەغەی نوێژکردنی لە موسوڵمانان کردووە لەسەر تەرمی بێ بڕواو هاوبەشدانەران ، جا لەبەر ئەوە دروستە واز لەو کەمە لاشەی موسوڵمانانە بهێنرێ کە تێکەڵ بە لاشەی بێ بڕوایان بووە ، ئەمەش مەزهەبی ئیمام (ئەبوحەنیفە) یە*.

* (المغني لإبن قدامة/ ج ٢، ص ٤٧٧) ، و (المبسوط للسرخسي/ ج ١، ص ٥٤ - ٥٥).

## چوارەم: هەڵگرتنی تەرم ( جەنازە )

### ١) حوکمەکەی*:

ئەهلی عیلم هەموویان کۆن لەسەر ئەوەی کە هەڵگرتنی تەرم فەرزی کیفایەیە ، واتە: ئەگەر کۆمەڵێك موسوڵمان پێی هەڵسان ئەوانی تر لەسەریان دەکەوێ و گوناهبار نابن . بەڵام لەبارەی شوێنکەوتنی جەنازە و ناشتنی ڕایان وایە کە ئەوە سوننەتە .

### ٢) هەڵگرتن و شوێنکەوتنی حەقێکی برایەتیە:

أ- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (( حق المسلم على المسلم خمس: رد السلام ، وعيادة المريض ، واتباع الجنائز ، وإجابة الدعوة ، وتشميت العاطس ))[٢٢٠]

واتە : مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان پێنجە: **یەکەم:** ئەگەر سەلامی لێ کرد وەڵامی بداتەوە. **دووەم:** ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکات. **سێیەم:** ئەگەر مرد شوێن جەنازەی بکەوێت. **چوارەم:** ئەگەر دەعوەتی کرد بۆ نان خواردن ، ئەوە

---

* (ابن عابدين/ ج.١، ص ٦٢٤) ، و (الفتاوى الهندية/ ج ١، ص ١٥٩) ، و (فتح الباري/ ج ٣، ص ١١٢) ، و (شرح صحيح مسلم لإمام النووي/ ج ١، ص ١٨٨).

[٢٢٠] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الأمر باتباع الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤٠) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (السلام) ، بابی : (من حق المسلم للمسلم رد السلام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦١٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الأدب) ، بابی : (في العطاس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٣٠).

وەڵامی بداتـەوە و بـچێ بـە دەم دەعوەتەکەیـەوە. **پێنجـەم**: ئەگـەر پـژمی و وتـی: (الحمد لله) ، ئەوە پێی بڵێت: (یرحمك الله)- .

ب- لـە (بـەڕڕائی) کـوڕی (عازیـب) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( أمرنا النبي (ﷺ) بـسبع ، ونهانـا عـن سـبع: أمرنـا بعيـادة المـريض ، واتباع الجنازة ، ... ))[221] واتـە: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمانی پـێ کـردووین کـە حـەوت شت بکەین: وە ڕێگریشی لێ کردووین لە حەوت شتی تر: فەرمانی پێ کردووین بـە سەردانی نەخۆش ، وە شوێنکەوتنی جەنازە .

**٣) موستەحەببە جەنازە لە هەر چوارلاوە بەسەرشان هەڵبگیرێت:**

أ- لـە (عبـدالله) ی کـوڕی (مەسـعود) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( من اتبع جنازة فليحمل بجوانب السرير كلها ؛ فإنه من السنة ، ثـم إن شاء فليتطوع ، وإن شاء فليدع ))[222]

---

[221] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الاستئذان)، بابی: (إفشاء السلام) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٦٢٣٥)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (اللباس والزينة)، بـابی: (تحـريم اسـتعمال إنـاء الـذهب والفـضة علـى الرجال والنساء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٥٦)، هەروەها (ترمذی) لـە کتـابی (اللبـاس)، بـابی: (مـا جاء في ركوب المياثر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧٦٠)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنـائز)، بـابی: (الأمر بإتباع الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٣٨)، هـەروەها (ابـن ماجـە) لـە کتـابی (الكفـارات)، بابی: (إبرار المقسم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١١٥).

[222] **ضعيف** – (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (مـا جـاء في شهود الجنـائز) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٤٧٨) ، هـەروەها (ابـن أبـي شـيبة) لـە (مـصنف) ە کەیـدا لـە کتـابی (الجنـائز) ، لـە ژێـر ناونیـشانی: (مـا قـالوا فيمـا يجـزي مـن حمـل جنـازة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١١٠٨٩) ، هـەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من حمل الجنازة فدار على جوانبها الأربعة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٤٦) ، هەروەها (ئـەبی حەنیفـە) لـە (مـسند) ە کەیـدا ، لـە ژێـر ناونیشانی: (روايته عن منصور بن المعتمر) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٩٠) ، هـەروەها (تەیاڵیـسی)

واتە : هەرکەس ترمێکی هەڵگرت با هەر جارە شان بداتە ژێر لایەکی ، چونکە ئەو کارە سوننەتە ، پاشان ئەوکەسە ئارەزووی خۆیەتی دوای ئەوەی لە هەموو لاکانیەوە هەڵیگرت دووبارەی دەکاتەوە یا وازی لێ دەهێنێ .

ب- لە (ئەبوسەعید) ی خودرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( عودوا المريض ، واتبعوا الجنازة تذكركم الآخرة ))[٢٢٣] واتە : سەر لە نەخۆش بدەن و ، شوێن جەنازە بکەون ، چونکە ڕۆژی دواییتان بیر دەخاتەوە .

---

لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (ما أسند عبد الله بن مسعود رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٣٦) ، هەروەها (الشاشي) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند عبد الله بن مسعود رضي الله عنه - ما روى أبو عبيدة بن عبد الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٦٩) ، هەروەها (ابن الجعد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (بقية حديث شعبة عن منصور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٥٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجه/ ج ١، ص ٤٧٤، ح ١٤٧٨)، و (سلسلة الأحاديث الضعيفة/ ج ١٠، ح ٤٥٣٠) ، و (ضعيف الجامع الصغير/ ح ٥٣٢٨) دا فەرموویەتی: (ضعيف) ە.

[٢٢٣] صحيح - (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند أبي سعيد الخدري رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٠٣٠) ، هەروەها (بوخاری) لە کتێبی (الأدب المفرد) دا ، بابی : (عيادة المرضى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٣٦) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی: (من امر بعيادة المريض واتباع الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٦٥٥) ، هەروەها (تەیاڵیسی) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (أحاديث النساء - ما روى أبو سعيد الخدري عن النبي (ﷺ) - الأفراد عن أبي سعيد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٤١) ، هەروەها (عبد بن حميد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (من مسند أبي سعيد الخدري) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٠٢) ، هەروەها (ئەبی یەعلا) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (حديث أبي موسى الأشعري) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٥٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (الأدب المفرد/ ج ١، ص ١٨٣، ح ٥١٨) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٤١٠٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**٤) لە هەڵگرتنیدا پاداشتێکی زۆر هەیە بۆ پیاوان:**

لــە (ئــەبوهورەیرە) وە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە کــەوا فەرموویــەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من صلى على جنازة ولم يتبعها فله قيراط ، فإن تبعها فله قيراطان ، قيل: وما القيراطان ؟ قال: أصغرهما مثل أحد ))[٢٢٤]

واتە: هەر کەسێك نوێژ لەسەر جەنازە بکات و شوێنی نەکەوێت ئەوە (قیراط) یێك جاکەی بۆ دەنووسرێت ، جا ئەگەر شوێنیشی بکەوێت ئەوە دوو (قیراط) ی بۆ هەیە ، جا وتیان : دوو (قیراط) چی یە؟ فەرمووی: بچووك ترینیان وەك کێوی (ئوحود) ە .

**بەڵام سەبارەت بە ئافرەتان باش نیە شوێنی جەنازە بکەون:**

لە (أم عطية) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( نهينا عن اتباع الجنائز ، ولم يعزم علينا ))[٢٢٥] واتە : قەدەغەمان لەسەر کرا کەوا شوێنی جەنازە بکەوین ، بەڵام عەزمیش نەکرا لەسەرمان - کە هەر نەچین - .

**(ابن حجر) ی عەسقەلانی لە (الفتح) دا دەفەرموێ***: واتە زۆریان لێ نەکردین کە نەچین ، وەك چۆن لە شتە قەدەغەکراوەکانی تردا زۆریان لێ دەکردین ، وەك ئەوەی بڵێت: بە کەراهەتیان دادەنا شوێن تەرم بکەوین بێ ئەوەی حەرامی بکەن .

---

[٢٢٤] **صحيح** - (موسليم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (فضل الصلاة على الجنازة واتباعها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨٩).

[٢٢٥] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الحيض) ، بابی : (الطيب للمرأة عند غسلها من الحيض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٣) ، هەروەها (موسليم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی: (نهي النساء عن اتباع الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٦٤) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في اتباع الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٧٧).

* (فتح الباري/ ج ٢، ص ٥٩٩).

وە (قـرطبي) فەرموویـەتی: ڕوالـەتی قـسەکەی (أم عطیـة) ئەوەیـە ئـەو کەراهەتـە کەراهەتی تەنزیهە ، وە جەماوەری زانایانیش هەر ئەوە دەفەرموون.

وە ئیمام (مالیك) یش هەر بەلای ئەوەوە مەیلی هەیە کە دروستە ، ئەمەش قسەی خەڵکی مەدینەیـە ، وە بەڵگەی دروسـتی ئەوەیە: کـە (ابـن ماجـه) و (ئەحمـەد) و (ابـن أبـي شـیبة) لـە ڕێگـای (محمـدی کـوڕی عـەمری کـوڕی عـەطـاء) ە وە لـە (ئەبوهورەیرە) وە دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) کان في جنـازة ، فرأى عمر امرأة ، فصاح بها ، فقال النبي (ﷺ): دعها یا عمر ))[٢٣٦]

جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ تەرمێکدا بوو ، (عومەر) ژنێکی بینـی دەنگـی دا ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: وازی لێ بهێنە ئەی عومەر !

ئـەوەش مەزهـەبی (ئیبنومەسـعود) و (ئیبنوعومـەر) و (ئـەبی ئومامـە) و دایکـە (عائیـشە) و (مەسـروق) و (حەسـەنی بەصـری) و (ئیبراهیمـی نەخـەعی) و (ئەوزاعی) و (ئیسحاق) و (حەنەفیەکان) و (شافیعیەکان) و (حەنبەلیەکان) ە*.

لەلای ئیمام (مالیك) هاتووە: کە چوونی پیرەژنی بۆ گۆڕستان بە خراپ دانەناوە ، وە هەروەها چوونی ئافرەتی گەنج لەگەڵ جەنازەی کەسێك کە موصیبەتەکەی گـەورە بێت بۆی ، بە مەرجێك داپۆشراو بێت و بە دەرچوونەکەی تووشی فیتنە نەبێت .

---

[٢٣٦] ضعیف - (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في البکاء علی المیت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٨٧) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لـە ژێـر ناونیـشانی : (مـسند أبـي هریـرة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٥٢٠) ، هەروەها (ابن أبي شیبة) لە (مـصنف) ە کەیـدا لـە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من رخص أن تکون المرأة مع الجنازة والصیاح لا یـری بـە) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١١١٠٢) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـە (سـنن ابـن ماجـە/ ج ١، ص ٥٠٥، ج ١٥٨٧) دا فەرموویەتی: (ضعیف) ە.

* (المجموع/ ج ٥، ص ٢٧٧) ، و (ابن عابدین/ ج ١، ص ٢٠٨) ، و (فتح الباري/ ج ٢، ص ٥٩٩).

**(ئیبنوحەزم) ڕای وایە*** : ئەوەی جومهور لەم بارەیەوە کردوویانەتە بەڵگە ڕاست نیە، وە دروستە ئافرەت شوێن تەرم بکەوێت .

**وە دەفەرموێ:** بە خراپی نازانین ئافرەت شوێن تەرم بکەوێت ، وە بەرگری ئەوەیان لێ ناکەین ، وە دەربارەی قەدەغەیی ئەوە چەند (أثر) ێك هاتووە هیچیان ڕاست نین ، چونکە یا (مرسل) ە یا لە نە ناسراو (مجهول) ە وەیە ، یا لە کەسێکەوەیە کە ناکرێتە بەڵگە ، جا لەپاش باسکردنی حەدیسەکەی (أم عطیة) دەفەرموێ: ئەگەر بە سەنەدیش صەحیح بێت هیچ بەڵگەی قەدەغەیی تێدا نیە ، بەڵکو تەنها لەبەر کەراهەت بووە ، وە پێچەوانەی ئەمە ڕیوایەتی صەحیح هاتووە ، وەك گێڕاومانەتەوە لە ڕێگای (شوعب) ە وە: لە (وەکیع) ە وە لە (هیشامی کوڕی عوروە) وە لە (وەهەبی کوڕی کەیسان) ە وە لە (محمدی کوڕی عەمری کوڕی عەطاء) ە وە لە (ئەبوهورەیرە) وە کەوا فەرموویەتی: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) ئامادەی ناشتنی تەرمێك بوو ، (عومەر) یش ئافرەتێکی لەگەڵدا بینین ، هاواری لێ کردو دەنگی دا ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: وازی لێ بهێنە ئەی عومەر ، چونکە چاو پڕ لە فرمێسکە و ، دڵ و دەروون بریندارە و ، کارەساتەکەش تازەیە .

**هەروەها دەفەرموێ:** لە (ئیبنوعەبباس) ە وە بە صەحیحی هاتووە: کە بە خراپی دانەناوە ئافرەت دوای تەرم بکەوێت .

**٥) بەجێ هێشتنی جەنازە لەبەر بوونی کارێکی خراپ:**

**دانەری کتێبی (المغني) فەرموویەتی:** ئەگەر کەسێك لەگەڵ تەرمێکدا ڕۆیشت و کارێکی خراپی بینی یا بیستی ، ئەوە ئەگەر توانای بەرپەرچی دانەوە و لابردنی هەبوو با نەیەڵێت بکرێت ، بەڵام ئەگەر توانای لابردنی نەبوو ، ئەوە دوو ڕووی هەیە: **یەکەمیان:** با لای ناخۆش بێت و نکۆڵی لێ بکات و تەرمەکە بەجێ نەهێڵێت

* (المحلى لابن حزم/ ج ١٣، ص ٣٣٩ - ٣٤٠).

و هەر بە شوێنیەوە بێت ، جا ئەوەی لەسەری فەرزە بە نکوڵی کردنەکە لەسەر خۆی لای دەبات و ، حەقێك واز لێ نەهێنێ بۆ شتێکی پووچەڵ .

دووەم: ئەوکەسە دەگەڕێتەوە و لەگەڵ ئەو تەرمەدا ناڕوات ، چونکە چوونی دەبێتە هۆی بیستن و بینینی خراپە ، لەگەڵ ئەوەدا کە دەتوانێ ئەوە واز لێ بهێنێت و نەچێت.

**٦) دروست نیە بە دەنگی بەرز شوێنی جەنازە بکەوی:**

أ- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا تتبع الجنازة بصوت ، ولا نار))[٢٢٧]

واتە: نابێت شوێنی جەنازە بکەویت بە دەنگەوە ، وە بە ئاگریشەوە.

ب- لە (قەیسی کوڕی عوباد) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان أصحاب رسول الله (ﷺ) يكرهون رفع الصوت عند الجنائز ، وعند القتال ، وعند الذكر ))[٢٢٨]

واتە: هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بەرزکردنەوەی دەنگیان لە سێ کاتدا لاناخۆش بوو: یەکەم: کاتی ئامادەبوونی تەرم ، دووەم: کاتی جەنگ ، سێیەم: کاتی یادی خوا.

---

[٢٢٧] حسن بشواهده - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في النار يتبع بها الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧٧٣) ، هەروەها (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (ومن مسند بني هاشم - مسند أبي هريرة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٣١١) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (احكام الجنائز / ٧١) دا فەرموویەتی : (وفي سنده من لم يسم ، لكنه يتقوى بشواهده المرفوعة، وبعض الآثار الموقوفة).

[٢٢٨] (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كراهية رفع الصوت في الجنائز والقدر الذي لا يكره منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٦٧) ، هەروەها (وكيع بن جراح) لە کتێبی (الزهد) دا ، بابی : (الحزن وفضله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٥).

هەروەها (سەعیدی کوڕی موسەییب) و (سەعیدی کوڕی جوبەیر) و (حەسەنی بەصری) و (ئیبراهیمی نەخەعی) و (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) و (ئیسحاق): لایان ناخۆش بووە کەسێك لە دوای تەرمێکەوە بوایە و بیوتایە: داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن .

**پێشەوا (ئەوزاعی) فەرموویەتی:** ئەوە داهێنراو (بیدعە) یە .

**ئیمام (نەوەوی) فەرموویەتی**[*]: بزانە ڕاست ئەوەیە کە پێشینان لەسەری بوون ، ئەویش بێ دەنگیە کاتی ڕۆیشتن بە دوای تەرمەوە ، وە نابێت دەنگ بەرز بکرێتەوە بە خوێندنی قورئان و یادی خوا کردن ، چونکە ئەو شێوەیە بۆ دڵی ئەوکەسە ئارامترە و زیاتر بیری لای ئەو شتانە دەبێت کە پەیوەندی بە جەنازەکەوە هەیە ، وە هەر ئەوەش پێویستە لەو حاڵەتەدا ، جا ئەم قسەیەش هەق و ڕاستە ، ئیتر بە زۆری ئەوکەسانە کە پێچەوانەی دەکەن فریو مەخۆن .

**٧) دروست نیە بە ئاگرەوە شوێنی جەنازە بکەوی:**

چونکە ئەو کارە کاری سەردەمی جاهیلییە و نابێ دووبارە بکرێتەوە ، هەر بۆیە (ابن المنذر) فەرموویەتی: هەرچی زانستی لێوە لەبەرکراوە لە زانایان ئەو کارەیان لا خراپ بووە.

أ- لە (ئەبوبوردە) ی کوڕی (ئەبی موسا) ی ئەشعەرییەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أوصى أبو موسى الأشعري حين حضره الموت ، فقال: لا تتبعوني بمجمر ، قالوا له: أوسمعت فيه شيئا ؟ قال: نعم ، من رسول الله (ﷺ) ))[229] واتە : کاتێ (ئەبوموسای ئەشعەری) لەسەرەمەرگدا بوو وەسێتی کرد ،

---

[*] (الأذكار لإمام النووي/ ص ٢٠٣).

[229] **حسن** – (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٨٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (لا يتبع الميت بنار)

فەرمووی: بە ئاگرو بخور شوێنم مەکەون بۆ سەر گۆڕستان ، جا وتیان: بۆ شتێکتان لەو بارەیەوە بیستووە ؟ فەرمووی: بەڵێ ، لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە .

**ب- پێشەوا (بەیهەقی) فەرموویەتی:** (( وفي وصية عائشة ، وعبادة بن الصامت ، وأبي هريرة ، وأبي سعيد الخدري ، وأسماء بنت أبي بكر رضي الله عنهم: أن لا تتبعوني بنار ))[230] لە وەسیەتی دایکە (عائیشە) و (عوبادەی کوڕی صامیت) و (ئەبوهورەیرە) و (ئەبوسەعیدی خودری) و (ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق) دا هاتووە کەوا فەرموویانە: شوێن تەرمەکەم مەکەون بە ئاگرەوە .

بەڵام ئەگەر ناشتنەکە لە شەودا پێویستی بە ڕووناکی هەبوو ئەو کاتە خراپ نیە.

**٨) دروستە خەڵکی بە پیادە لە پێش و، لە پاش و، لە لای ڕاست و، لە لای چەپی جەنازەوە بڕۆن:**

أ- لە (موغیرە) ی کوڕی (شوعبە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( الراكب خلف الجنازة ، والماشي حيث شاء منها ، .. ))[231] واتە : سوار لە پشتی تەرمەوە دەڕوات و ، پیادە بە ئارەزووی خۆیەتی لە کوێوە دەڕوات با بڕوات .

---

گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٦٨) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجە/ ج ١، ص ٤٧٧، ح ١٤٨٧) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

[230] (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (لا يتبع الميت بنار) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٦٩).

[231] **صحيح** – (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (مكان الراكب من الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٤٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائي/ ج ٤، ص ٥٥؛ ح ١٩٤٢) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٣٥٣٣) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

لە گێڕانەوەی (نەسائی) دا دەفەرموێ: (( الراكب يسير خلف الجنازة ، والماشي يمشي خلفها ، وأمامها ، وعن يمينها ، وعن يسارها قريبا منها ، .. ))[٢٣٢]

واتە : سوار لە پشتی تەرمەوە دەڕوات ، وە پیادەش بە ئارەزووی خۆیەتی ، لە پشتیەوە ، لە پێشیەوە ، لە ڕاستیەوە ، لە چەپیەوە دەڕوات بە ئارەزووی خۆیەتی ، ئەوەندە هەیە لە نزیکی تەرمەکەوە دەڕۆن !

ب- لە (جابیر) ی کوڕی (سەموورە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أتي النبي (ﷺ) بفرس معروري ، فركبه حين انصرف من جنازة ابن الدحداح ، ونحن نمشي حوله ))[٢٣٣] واتە : پێغەمبەر (ﷺ) کە لە ناشتنی تەرمی (ئیبنودەحداح) گەڕایەوە ئەسپێکیان بە پشتی ڕووتی بۆ هێنا ، سواری بوو ، ئەو بە سواری و ئێمەش بە پێ لە دەوری بەرەومالّ ڕۆیشتینەوە .

ج- لە (ئیبنوعومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( رأيت النبي (ﷺ) وأبا بكر وعمر يمشون أمام الجنازة ))[٢٣٤]

---

[٢٣٢] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (المشي أمام الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٨٠) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الصلاة على الأطفال) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٣١) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (مكان الراكب من الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٤١) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في شهود الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٨١) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ٣، ص ٢٠٥، ح ٣١٨٠) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٣٥٢٥) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ١، ١٦٦٧) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[٢٣٣] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ركوب المصلي على الجنازة إذا انصرف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٣٥).

[٢٣٤] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (المشي أمام الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٧٩) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في المشي أمام الجنازة)

واتــە : دیومــە کــە پێغەمبــەر (ﷺ) لــە پێــشی تەرمــەوە ڕۆیــشتووە ، وە هــەروا (ئەبوبەکر) و (عومەر) یشم دیوە کە ئەوانیش لە پێشی تەرمەوە ڕۆیشتوون .

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە:**

**بەشی زۆری ئەهلی عیلم** ئەوەیان هەڵبژاردووە کە ڕۆیشتن لە پێش تەرمەوە چاکترە ، چونکە پێغەمبەرو (ﷺ) ئەبوبەکرو عومەر لە پێش تەرمەوە دەڕۆیشتن .

وە **(حەنەفیەکان) ڕایان وایە:** کە مردو نێژەکان لە دوای تەرمەکەوە بڕۆن باشترە ، چــونکە لــە فــەرمانی پێغەمبــەرەوە (ﷺ) وا دەردەکــەوێت ، وە شــوێنکەوتوو ئەوکەسەیە کە لەدوایەوە دەڕوات .

**بەڵام پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب) پێی باش بوو ئەوکەسەی شوێن جەنازە دەکەوێ لەدوای جەنازەکەوە بڕوات چاکترە:**

لــە (عبــدالرحمن) ی کــوڕی (ئــەبزا) وە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە کــەوا فەرموویــەتی: (( أن أبـا بكـر ، وعمـر ، رضـي الله عنهمـا كانـا يمـشيان أمـام الجنـازة ، وكان علي رضـي الله عنـه يمـشي خلفها ، فقيـل: لعلي رضـي الله عنـه إنهما يمـشيان

---

گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٠٧) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (مكان الماشي مـن الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٤٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في المشي أمام الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٨٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سـنن أبـی داود/ ج ٣، ص ٢٠٥، ح ٣١٧٩) ، و (جامع الترمذي/ ج ٣، ص ٣٢٩، ح ١٠٠٧) ، و (سنن النـسائي/ ج ٤، ص ٥٦، ح ١٩٤٤) ، و (سـنن ابـن ماجـه/ ج ١، ص ٤٧٥، ح ١٤٨٢) ، و (مـشكاة المـصابيح/ ج ١، ١٦٦٨) ، و (إرواء الغليل/ ج ٣، ح ٧٣٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**أمامها ، فقال: إنهما يعلمان أن المشي خلفها أفضل من المشي أمامها ، كفضل صلاة الرجل في جماعة على صلاته فذا ، ولكنهما سهلان يسهلان للناس ))**[٢٢٥]

**واتە : (ئەبوبەکر) و (عومەر) (خوایان لێ ڕازی بێت) پێش جەنازە دەکەوتن ، بەڵام (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب) (خوای لێ ڕازی بێت) دوای دەکەوت ، جا پێیان وت: ئەوان پێش دەکەون ، فەرمووی: بەڕاستی هەردووکیان دەیانزانی کە ڕۆیشتن لە دوای تەرمەوە چاکترە لە ڕۆیشتن لە پێشیەوە ، وەك چاکێتی نێوان نوێژی جەماعەت و نوێژی تاك ، بەڵام ئەوان کار ئاسانن و لەبەر کارئاسانی بۆ خەڵك ئەمەیان دەکرد .**

**وە ئەمەش مەزهەبی (ئەوزاعی) و (ئەبوحەنیفە) و (ئیسحاق) ە*.**

**وە (ئەنەسی کوڕی مالیك) ڕای وابوو: کە هەموو لایەکان وەك یەکن ، ئەویش بەپێی حەدیسەکەی (موغیرەی کوڕی شوعبە) کەلە پێشەوە ئاماژەمان پێدا .**

**بەڵام سەبارەت بە سواری:**

**جومهوری زانایان: بەڕێ کردنی مردوو بە سواری بە کەراهەت دادەنێن ، مەگەر بەهانەیەك هەبێت ، بەڵام دوای ناشتنی و کاتی گەڕانەوە بە دروستیان داناوە بەبێ کەراهەت ، بەپێی حەدیسەکەی (ثوبان) (خوای لێ ڕازی بێت).**

**(حەنەفیەکان) یش ڕایان وایە: کە سواری خراپ نیە هەر چەندە بەپێ ڕۆیشتن چاکترە ، ئەگەر هۆیەك نەبێت ، وە سوننەتە سوار لە دوای تەرمەوە بڕوات لەبەر ئەو حەدیسەی باسکرا .**

---

[٢٢٥] (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (المشي خلفها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٨٠).

* (الأم/ ج ١، ص ٢٤٠) ، و (بداية المجتهد/ ج ١، ص ٣٤٤) ، و (فتح الباري/ ج ٣، ص ٢١٩).

**(خطابي) فەرموویەتی:** نەمزانیوە زانایان جیاوازییان هەبێ لەوەدا کە دەبێ سوار لە دوای تەرمەوە بڕوات .

**٩) ئەوەی دەوترێ لە کاتی ڕۆیشتن لەگەڵ جەنازەدا:**

موستەحەببە کەوا خۆی خەریك بکات بە زیکری خواوە و، وە بیربکاتەوە لە حاڵی مردووەکە و ئەوەی کە چاوەڕوانیەتی لە ناو گۆڕدا و، وە هەروەها بیرلەوە بکاتەوە کە ئەمە کۆتایی ژیانی دونیایە و چارەنووسی ئەهلەکەیەتی.

وە زۆر خۆی بپارێزێ لە قسەی پڕوپووچ و بێ سوود، چونکە بەڕاستی ئەمە کاتی زیکر و بیرکردنەوەیە و، بێ ئاگایی و خۆ خەریك کردن بە قسەی پڕوپووچ و بێ سوود و بەتاڵ کارێکی زۆر نەشیاوە و، قسەی بێ سوودیش لە هەموو کاتێکدا قەدەغەی لێکراوە چ جای لە کاتی ئاوادا ؟!

وە ئەوەش بزانە ئەوەی کەوا شیاو و هەڵبژێردراوە لەلای پێشینان و وان لەسەری بێ دەنگی یە لە کاتی ڕۆیشتن لەگەڵ جەنازەدا، وە دەنگ هەڵنەبڕینە بە قورئان خوێندن و زیکر و جگە لەمانە ، وە حیکمەتیش لەمەدا ئەوەیە کەوا سوکنایی یەك بێ بۆ بیرو هۆشی کەسەکە و، بیرکردنەوەی سازگار و کۆبێ لە بارەی ئەوەی کە پەیوەندی بە جەنازەکەوە هەیە، وە ئەمەش داواکراوە لە کاتی ئاوادا.

**١٠) کەراهەتی هەیە بۆ کەسێ کە شوێن جەنازە کەوتبێ کەوا دابنیشێ بەر لەوەی جەنازەکە دابنرێتە سەر زەوی** ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لەو جۆرە کارە کردووە.

أ- لە (سەعید) ی مەقبورییەوە لە باوکیەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( كنا في جنازة ، فأخذ أبو هريرة رضي الله عنه بيد مروان فجلسا

قبل أن توضع ، فجاء أبو سعيد رضي الله عنه فأخذ بيد مروان ، فقال: قم فوالله لقد علم هذا أن النبي (ﷺ) نهانا عن ذلك . فقال أبو هريرة صدق ))[٢٣٦]

واتە : جارێکیان بە دوای تەرمێکەوە دەڕۆیشتن کاتێ گەیشتینە گۆڕستانەکە (ئەبوهورەیرە) دەستی مەڕوانی گرت و دانیشتن پێش ئەوەی تەرمەکە دابنرێت ، جا لەولاوە (ئەبوسەعید) (خوای لێ ڕازی بێت) هات و دەستی مەڕوانی گرت و پێی فەرموو: سوێند بەخوا (ئەبوهورەیرە) دەزانێت کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی لێ قەدەغە دەکردین ، (ئەبوهورەیرە) ش فەرمووی: ڕاست دەکات .

ب- هەروەها لە (ئەبی سەعید) ی خودرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا اتبعتم جنازة ، فلا تجلسوا حتى توضع ))[٢٣٧] واتە: کاتێك شوێن تەرمێك کەوتن ئەوە دامەنیشن هەتا تەرمەکە دادەنرێتە سەر زەوی .

ج- ئیمام (بوخاری) فەرموویەتی: (( من تبع جنازة ، فلا يقعد حتى توضع عن مناكب الرجال ، فإن قعد أمر بالقيام ))[*] واتە: هەرکەس شوێن تەرمێك بکەوێت با دانەنیشێت هەتا تەرمەکە لەسەر شانی پیاوەکان دادەنرێت ، وە ئەگەر کەسێك دانیشتبوو دەبێ هەڵبسێنرێت .

---

[٢٣٦] صحيح – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (متى يقعد إذا قام للجنازة ؟) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٩) ، هەروەها (ابن الجعد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مخلد بن خفاف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٩٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٨٤).

[٢٣٧] صحيح – (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢١٧)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٧٣).

[*] (صحيح البخاري / كتاب الجناز ، باب: ٤٨).

ئەمــەش بۆچــوونی بەشــی زۆری هــاوەڵان و تابیعیــەکان و (حەنەفیــەکان) و (حەنبەلیەکان) ە ، وە قسەی ئیمام (ئەحمەد) و (ئەوزاعی) و (ئیسحاق) و (محمدی کوڕی حەسەن) یشە*.

**ئیمام (شـافیعی) فەرموویـەتی:** کاتێـك تەرمەکە هـات و ئـەو دانیـشتبوو بـا لەبـەری هەڵنەسێت .

**(شافیعیەکان) یش دەفـەرموون:** دانیـشتن بـۆ مردونیـژەکان پـێش دانـانی تەرمەکە کەراهەتی نیە ، بەڵام لەسەر ئەوە ڕێکن کە هەرکەس پـێش تەرمەکە بکـەوێت و هەتا دەگەنە لای دابنیشێت قەیناکە .

**پێشەوا (ترمذی) فەرموویەتی:** لە هەندێ لە زانایانی صەحابە و لە کەسانی تریـشەوە گێردراوەتەوە کە ئەوان پێش تەرمەکە دەگەیشتنە سەر گۆڕەکە و دادەنیشتن .

**وە لە ئیمام (ئەحمەد) ە وە هاتووە کەوا فەرموویەتی:** ئەگەر هەڵسا عـەیبی لێ نـاگرم ، ئەگەر هەڵیش نەسا ئەوە قەیناکە .

**١١) مەلائیکەی ڕەحمەتیش تەرم بەڕێ دەکەن بۆ سەر گۆڕستان:**

أ- لە (ثوبان) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویـەتی: (( أن رسـول الله (ﷺ) أتي بدابة وهو مع الجنازة فأبى أن يركبها ، فلما انصرف أتي بدابة فركـب ، فقيل له ، فقال: إن الملائكة كانت تمشي ، فلم أكن لأركـب وهـم يمـشون ، فلمـا ذهبـوا ركبت ))[٢٢٨] واتە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگـەڵ تـەرمێکا دەچـوو بـۆ سـەر

---

* (ابن عابدين/ ج ١، ص ٦٠٨) ، و (الشرح الصغير/ ج ١، ص ٢٢٩) ، و (ومغني المحتاج/ ج ١، ص ٢٤٧).

[٢٢٨] **صحيح** – (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (الركوب في الجنـازة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣١٧٧) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (١٣٤٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز)، بابی : (الركوب عنـد الانـصراف مـن

گۆڕستان ، جا وڵاخێکیان بۆ هێنا کە سواری بێ ، بەڵام سواری نەبوو ، لەو سەرەوە کە گەڕایەوە وڵاخێکیان بۆ هێنا ئەمجار سواربوو ، کە بۆ ئەمە قسەیان لەگەڵی کرد فەرمووی: ئەوسا مەلائیکەتەکان لەگەڵ تەرمەکەدا بەپێ دەڕۆیشتن ، جا نەدەبوو من بە سواری و ئەوان بەپێ ، بەڵام ئێستا ئەوان ڕۆییون ، لەبەر ئەوە سوار بووم .

ب- لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( يتبع الميت ثلاثة ، فيرجع اثنان ويبقى معه واحد: يتبعه أهله وماله وعمله ، فيرجع أهله وماله ويبقى عمله ))[239] واتە : سێ شت شوێن مردوو دەکەون و تا سەر لێواری گۆڕ لەگەڵی دەچن، بەڵام لەوێ دوانیان دەگەڕێنەوە و یەکێکیان لەگەڵی دەمێنێتەوە: کەس و کارو ، ماڵ و ، کردەوەی لەگەڵی دەچن ، بەڵام کەس و کارو ماڵەکەی دەگەڕێنەوە ، تەنیا کردەوەکەی لەگەڵی دەمێنێ !

**١٢) هەڵسان لەبەر تەرم:**

أ- لە (ئەبوسەعید) ی خودرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا رأيتم الجنازة ، فقوموا ، فمن تبعها فلا يقعد حتى توضع ))[240] واتە : کە تەرمتان دی هەڵسن لەبەری تا

---

الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٦٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٣، ص ٢٠٤، ح ٣١٧٧) ، و (تلخيص أحكام الجنائز / ص ٤١) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[239] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الرقاق) ، بابی : (سكرات الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥١٤) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الزهد والرقائق) ، بابی : (منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٣٥٠) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الزهد) ، بابی : (ما جاء مثل ابن آدم وأهله وولده وماله وعمله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٧٩).

[240] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من تبع جنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٧)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢١٦) ،

تێدەپەڕێ ، ئەوکەسەشی دوای دەکەوێ با دانەنیشێت تا تەرمەکە دادەنرێ لەلای گۆڕەکەی .

ب- لە (جابیر) ی کوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( مرت جنازة ، فقام لها رسول الله (ﷺ) وقمنا معه ، فقلنا: يا رسول الله (ﷺ)، إنها يهودية ، فقال: إن الموت فزع ، فإذا رأيتم الجنازة فقوموا ))[٢٤١]

واتە : تەرمێکی ڕەت بوو ، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لەبەری هەڵسا ، ئێمەش لەگەڵیا لەبەری هەڵساین ، ئنجا وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! خۆ ئەمە تەرمی جوولەکەبوو ، فەرمووی: مردن بە سامە ! لەبەر ئەوە کە تەرمتان دی لەبەری هەڵسن !

ج- لە (عەلی) کوڕی (ئەبی تالیب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( رأينا رسول الله (ﷺ) قام فقمنا ، وقعد فقعدنا ))[٢٤٢]

واتە : لەسەرەتاوە دەمان دی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی لەبەر تەرم هەڵدەستێ لەبەر ئەوە ئێمەیش لەبەری هەڵدەساین ، بەڵام لەدواییدا پێغەمبەر (ﷺ) وازی

---

هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في القيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٣) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الأمر بالقيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩١٧).

[٢٤١] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من قام لجنازة يهودي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣١١) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢١٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام لجنازة أهل الشرك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٢٢).

[٢٤٢] صحيح - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (نسخ القيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٢٧) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الوقوف للجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٩٨).

لەمە هێناو دانیشتنی لە خۆی تێك نەدەدا ، لەبەر ئەوە ئێمەش وازمان لێ هێناوەو دانیشتن لەخۆمان تێك نادەین .

د- لە (عبدالرحمن) ی کوڕی (ئەبی لەیلا) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان سهل بن حنيف ، وقيس بن سعد قاعدين بالقادسية ، فمروا عليهما بجنازة ، فقاما ، فقيل لهما إنها من أهل الأرض أي من أهل الذمة ، فقالا: إن النبي (ﷺ) مرت به جنازة فقام ، فقيل له: إنها جنازة يهودي ، فقال: أليست نفسا))[٢٤٣] واتە : جارێکیان (سەهلی کوڕی حونەیف) و (قەیسی کوڕی سەعد) لە (قادسیە) دانیشتبوون ، جا لەو کاتەدا تەرمێکیان بە لایاندا تێپەڕاند ، ئەوانیش هەڵسان لەبەری ، پێیان وترا: ئەو جەنازەیە لە ئەهلی زیمە بوو ، وتیان: پێغەمبەر (ﷺ) تەرمێکی بەلادا تێپەڕی هەڵسا لەبەری ، عەرزیان کرد: ئەوە تەرمی جوولەکە بوو، فەرمووی: ئایا ئەویش نەفسێك نەبووە؟

وە لە گێڕانەوەی (بوخاری) دا هاتووە کەوا (ئیبنوئەبی لەیلا) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: (( كان أبو مسعود ، وقيس: يقومان للجنازة ))[٢٤٤] واتە : (ئەبومەسعود) و (قەیس) لەبەر تەرم هەڵدەسان .

هـ- لە (عامیر) ی کوڕی (ڕەبیعە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( وكان ابن عمر إذا رأى جنازة قام حتى تجاوزه ))[٢٤٥] واتە : (ئیبنوعومەر) هەر تەرمێکی دەبینی لەبەری هەڵدەسا هەتا تێدەپەڕی .

---

[٢٤٣] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من قام لجنازة يهودي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣١٢) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام للجنازه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٢٢) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام لجنازة أهل الشرك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٢٠).

[٢٤٤] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من قام لجنازة يهودي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣١٢).

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە[*] :**

**پێشەوا (ترمذی) فەرموویەتی:** حەدیسەکەی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) (حسن صحیح) ە ، چوار تابیعی تێدایە یەك لەیەکی دەگێڕنەوە ، وە لای هەندێ لە زانایان کار بەوە دەکرێت .

**ئیمام (شافیعی) فەرموویەتی:** ئەوە ڕاسترین شتە کە لەو بارەیەوە هاتووە .

**ئیمام (ئەحمد) فەرموویەتی:** ئەوکەسە ئارەزووی خۆیەتی هەڵدەسێت یان نا ، وە بەڵگەشی ئەوەیە کەلە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویانەتەوە کەلە پێشەوە هەڵدەستا پاشان هەڵنەدەسا.

وە ئەمە قسەی (ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم) یشە ، وە لەگەڵ ئیمام (ئەحمەد) و (ئیسحاقی کوڕی حەبیب) و (ابن الماجشون) لە (مالیکیەکان) وە هەندێ لە (شافیعیەکان) ڕێکن لەسەر ئەوە ، وە ئەمە هەڵبژاردەی ئیمام (نەوەوی) شە .

**وە ئیمام (نەوەوی) فەرموویەتی:** هەڵبژێرراو لەو بارەیەوە ئەوەیە کە هەڵسان لەبەر تەرم پەسەندە ، خاوەن مەزهەب و (موتەوەلی) ش هەر ئەوە دەڵێن .

**(ئیبنوحەزم) فەرموویەتی[*] :** هەرکەس تەرمێکی بینی پەسەندە لەبەری هەڵسێت ، ئەگەر تەرمی بێ بڕوایەکیش بێت هەتا دادەنرێت یا تێدەپەڕێت ، یان دوای کەوێت ، جا ئەگەر هەڵیش نەسێت قەیناکە ، ئەوانەی دەڵێن: پەسەندە ، بەڵگەیان ئەوەیە کە جەماعەت لە (ئیبنوعومەر) ە وە لە (عامیری کوڕی ڕەبیع) ە وە (خوای

---

[٢٤٥] (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند المكيين - حديث عامر بن ربيعة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٣٧٢) ، هەروەها (عبد بن حميد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (حديث عامر بن ربيعة رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٦).

[*] (فتح الباري/ ج ٣، ص ٢١٦) ، و (المجموع/ ج ٥، ص ٢٨٠) ، و (الإعتبار للحازمي/ ص ١٢٨) ، و (الفتاوى الهندية/ ج ١، ص ١٦٠) ، و (المحلى لإبن حزم/ ج ٥).

[*] (المحلى لإبن حزم/ ج ١٣، ص ٣٣٠).

لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنــەوە كـەوا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( إذا رأيـتم الجنازة ، فقوموا لها ، حتـى تخلفكم أو توضـع ))[٢٤٦] واتـە: ئەگـەر تـەرمێكتان بینـی لەبەری هەڵسن ، هەتا تێدەپەڕێ لێتان یا دادەنرێت .

**١٣) ئەوەی دەوترێ لە كاتی تێپەڕینی جەنازەیەك بەلاتدا:**

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەم بارەوە لە (الأذكار) دا فەرموویەتی[*]:
موستەحەببە كەوا بوترێ: (**سبحان الحي الذي لا يموت**) واتە: پاك و بێ گەردی بۆ ئەوكەسەی كە هەمیشە زیندووە و نامرێت .

هـەروەها پێـشەوا نـەوەوی (ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ) دەفـەرموێ: قـازی و پێـشەوا (**أبو المحاسن الروياني**) كە یەكێكە لە هاوەڵانمان لە كتێبی (البحـر) دا دەفـەرموێ: موستەحەببە كەوا بپاڕێتەوە و بڵێ: (**لا إله إلا الله الحي الذي لا يموت**) واتـە: هـیچ پەرستراوێك نییە كـە شـایانی پەرسـتن بێـت جگـە لـەخوا كـە هەمیـشە زینـدووە و نامرێت.

وە موستەحەببە كەوا بۆی بپاڕێتـەوە و ستایـشی بكـات بـە چاكە ئەگـەر هـاتوو لـە ئەهلی ستایش بوو ، وە با لە ستایش كردنیدا لە سنوور دەرنەچێت .

---

[٢٤٦] **صحيح** - (موسلیم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام للجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢١٤) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (القيام للجنـازة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣١٧٢) ، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في القيام للجنـازة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٠٤٢) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في القيام للجنـازة) گێڕاویەتـەوە بە ژمارە (١٥٤٢).

[*] (نيل الأوطار بتخريج احاديث كتاب الأذكار/ ج ١ - ص ٣٧٥).

## پێنجەم: شاردنەوە و ناشتنی مردوو

**١) حوكمەكەی:**

**جومهوری زانایان ڕایان وایە*** : كە شتنی مردوو، وە كفن كردن و نوێژ لەسەركردن و ناشتنی فەرزی كیفایەیە ، واتە: ئەگەر كۆمەڵێك موسوڵمان پێی هەڵسان ئەوانی تر لەسەریان دەكەوێ و گوناهبار نابن .

**٢) چەند حوكمێكی شەرعی لەو بارەیەوە:**

**یەكەم: ئەو كاتەی مردووی تێدا دەنێژرێ:**

جومهوری زانایان ڕایان وایە كە ناشتنی مردوو بە شەو بێت یا بە ڕۆژ وەك یەكە ، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پیاوەی كە دەنگی بە زیكری خوا بەرز دەكردەوە لە شەوا ناشتی ، وە (عەلی كوڕی ئەبی تالیب) (فاتیمە) ی هاوسەری لە شەودا ناشت (خوایان لێ ڕازی بێت) ، وە هەروەها (ئەبوبەكری صدیق) و (عوسمانی كوڕی عەففان) و دایكە (عائیشە) و (ئیبنومەسعود) بە شەو نێژراون .

لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) دخل قبرا ليلا ، فأسرج له سراج ، فأخذه من قبل القبلة ، وقال: رحمك الله ، إن كنت لأواها تلاء للقرآن ، وكبر عليه أربعا ))[٢٤٧]

---

* (المجموع لإمام النووي/ ج ٥، ص ١٢٨) ، و (الأم لإمام الشافعي/ ج ١، ص ٢٤٣) ، و (المحلى لإبن حزم/ ج ٥، ص ١١٣) ، و (فتح الباري لحافظ ابن حجر/ ج ٣، ص ١٣٥).

[٢٤٧] **ضعيف** - (ترمذی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الدفن بالليل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبری) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (من قال: يسل

واتە : شەوێك پێغەمبەر (ﷺ) چووە ناو گۆڕێکەوە و چرایان بۆ داگیرساند (بە مەبەستی ناشتنی پیاوێك) ، پاشان لاشەکەی لای قیبلەوە وەرگرت و فەرمووی: خوا ڕەحمەت پێ بکات ، چونکە پیاوێکی زۆر لەخوا ترس و زۆر قورئان خوێن بووی ، وە چوار (الله أكبر) ی لەسەر کرد .

**پێشەوا (ترمذی) دوا بەدوای ئەم حەدیسە فەرموویەتی:** (رخص أكثر أهل العلم في الدفن بالليل) واتە: بەشی زۆری زانایان ڕێیانداوە مردوو بەشەو بنێژرێت .

**بەڵام لەڕاستیدا ناشتنی مردوو لە شەوا کەراهەتی هەیە و باش نیە بکرێ:**

١- لە (جابیر) ی کوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا تدفنوا موتاكم بالليل ، إلا أن تضطروا ))[٢٤٨] واتە: مردووەکانتان بەشەو مەنێژن مەگەر لەبەر ناچاری نەبێت.

٢- لە (جابیر) ی کوڕی (عبدالله) (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) خطب يوما ، فذكر رجلا من أصحابه قبض فكفن في كفن غير طائل ، وقبر ليلا ، فزجر النبي

---

الميت من قبل رجل القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٥٠) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الكبير) دا ، بابی : (من اسمه عبد الله - وما أسند عبد الله بن عباس رضي الله عنهما - عطاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٠٨٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٣، ص ٣٧٢، ح ١٠٥٧) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ١، ح ١٧٠٦) دا فەرموویەتی: (ضعيف) ە.

[٢٤٨] **صحيح** – (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الأوقات التي لا يصلى فيها على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٢١) ، هەروەها (ابن شاهين) لە کتێبی (ناسخ الحديث ومنسوخه) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (حديث آخر في دفن الليل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجه/ ج ١، ص ٤٨٧، ح ١٥٢١) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٧٢٦٨) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

(ﷺ) أن يقبر الرجل بالليل حتى يصلى عليه ، إلا أن يضطر إنسان إلى ذلك ، وقال النبي (ﷺ): إذا كفن أحدكم أخاه ، فليحسن كفنه ))[249]

واته : ڕۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) له وتارێکا ، باسی ئەوەی کرد ، کە پیاوێ لە هاوەڵانی مردووه و لە کفنێکی نا شایستەدا کفن کراوه ، وه به شەویش نێژراوه ، جا پێغەمبەر (ﷺ) هەڕەشەی لەوه کرد کە مردوو لە شەودا بنێژرێ ، چونکه لە شەودا کەمتر نوێژی لەسەر دەکرێ ، مەگەر لەبەر ناچاری مرۆڤ ئەوه بکا ، ئەوه قەیناکا ، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کاتێ یەکێکتان تەرمی برای موسوڵمانی خۆی کفن دەکا با بە جوانی کفنی بکا .

**دووەم: قەدەغەکراوه لە شاردنەوەی مردوو لە سێ کاتدا:**

لە (عوقبە) ی کوڕی (عامیر) ه وه (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوه کەوا فەرموویەتی: (( ثلاث ساعات كان رسول الله (ﷺ) ينهانا أن نصلي فيهن أو أن نقبر فيهن موتانا: حين تطلع الشمس بازغة حتى ترتفع ، وحين يقوم قائم الظهيرة حتى تميل الشمس ، وحين تضيف الشمس للغروب حتى تغرب ))[250]

---

[249] صحيح - (موسليم) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (في تحسين كفن الميت) گێڕاویەتەوه بە ژمارە (٢١٨٢) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الكفن) گێڕاویەتەوه بە ژمارە (٣١٤٨)، هەروەها (نەسائی) له کتابی (الجنائز) ، بابی : (الأمر بتحسين الكفن) گێڕاویەتەوه بە ژمارە (٢٨٠٥).

[250] صحيح - (موسليم) له کتابی (صلاة المسافرين) ، بابی : (الأوقات التي نهي عن الصلاة فيها) گێڕاویەتەوه بە ژمارە (١٩٢٦) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الدفن عند طلوع الشمس وعند غروبها) گێڕاویەتەوه بە ژمارە (٣١٩٢) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في كراهية الصلاة على الجنازة عند طلوع الشمس وعند غروبها) گێڕاویەتەوه بە ژمارە (١٠٣٠) ، هەروەها (نەسائی) له کتابی (المواقيت) ، بابی : (الساعات التي نهي

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سێ کاتدا نەهی لێکردووین کەوا نوێژی تێدا بکەین، یاخود مردووی تێدا بنێژین: یەکەم: کاتی خۆرهەڵهاتن تا ئەوکاتەی بە جوانی بەرز دەبێتەوە ، دووەم: کاتێ کە خۆر دەکەوێتە ناوەندی ئاسمان تا لا دەدات ، سێیەم: کاتێ کە خۆرئاوا دەبێت.

**سێیەم: پەلەکردن لە ناشتنیدا:**

١- لە (عویەینە) ی کوڕی (عبدالرحمن) ە وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە ، ئەویش لە باوکیەوە* کەوا فەرموویەتی: (( أنه كان في جنازة عثمان بن أبي العاص وكنا نمشي مشيا خفيفا ، فلحقنا أبو بكرة فرفع سوطه ، فقال: لقد رأيتنا ونحن مع رسول الله (ﷺ) نرمل رملا ))[251]

واتە : خۆم لەگەڵ تەرمی (عوسمانی کوڕی ئەبولعاص) دا بووم ، سووک سووک لەسەرخۆ دەڕۆیشتین ، بەڵام (ئەبوبەکرە) مان پێ گەیشت بە دەنگێکی بەرز فەرمووی: بۆ خۆم لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم (ﷺ) تەرمێکمان ڕەت دەکرد بەتەکان دەڕۆیشتین .

٢- لە (ئەبوسەعید) ی خودرییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا وضعت الجنازة ، واحتملها الرجال على أعناقهم ، فإن كانت صالحة ، قالت: قدموني ، وإن كانت غير صالحة ،

---

عن الصلاة فيها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٥٩) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الأوقات التي لا يصلى فيها على الميت ولا يدفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥١٩).

* باوکی عویەینە ناوی (عبدالرحمن ی کوڕی جەوشەن) ی غەطفانیە.

[251] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الإسراع بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٨٢) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الإسراع في المشي بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٦٠) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٢، ص ٢٠٥، ح ٣١٨٢) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٢، ح ٣٥١٠) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

قالت: يا ويلها أين يذهبون بها؟ يسمع صوتها كل شيء إلا الإنسان ، ولو سمعه لصعِق))[٢٥٢]

واتە : کاتێ تەرمی مردوو دادەنرێ لەناو دارەمەیتا ، وە پیاوان هەڵێ دەگرن و دەینێنە سەرشانیان تا بیبەن بۆ سەر گۆڕستان ، لەوکاتەدا مردووەکە ئەگەر مرۆڤێکی باش بێ دەڵێ: زووکەن زوو بمبەن ! بەڵام ئەگەر مردووەکە مرۆڤێکی باش نەبێ دەڵێ: هەی هاوار ! خۆم ڕۆ ! بۆ کوێم دەبەن؟ جا لەم کاتەدا هەموو شتێ دەنگی دەبیستێ ئادەمیزاد نەبێ ، ئەگەر ئادەمیزاد گوێی لەم هاتو هاوارەی بێ لە ترسانا دەتۆقێ و زەندەقی دەچێ .

٣- لە (ئەبی بەکرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( لقد رأيتنا مع رسول الله (ﷺ) وإنا لنكاد نرمل بها رملا ))[٢٥٣] واتە : ئەگەر چاوت لێمان دەبوو چۆن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەڕۆیشتین بە پەلە ، هەروەك لۆقەمان بە تەرمەکە بکردایە وابوو .

ئیمام (بوخاری) لە (مەحمود) ی کوڕی (لەبید) ی کوڕی (عوقبە) ی ئەنصارییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( أسرع النبي (ﷺ) حتى تقطعت نعالنا يوم مات سعد بن معاذ ))[٢٥٤] واتە: ئەو ڕۆژەی کە (سەعدی کوڕی

---

[٢٥٢] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (حمل الرجال الجنازة دون النساء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣١٤) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (السرعة بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٠٩).

[٢٥٣] صحيح - (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (السرعة بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٣١) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٤، ص ٤٣، ح ١٩٣١) دا فەرموویەتی: (صحيح) ه.

[٢٥٤] صحيح - (بوخاری) لە کتێبی (التاريخ الكبير) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٢٨).

موعاز) مـرد و بردمـان بـۆ گۆڕسـتان ، پێغەمبـەر (ﷺ) ئەوەنـدە پەلـەی کـرد هـەتا نەعلەکانمان پچڕا .

(ابن حجر) ی عەسقەلانی فەرموویەتی: سەرئەنجام ئەوەیە کە پەسەندە پەلە لە تەرم بکرێت بۆ بردنی بەرەو گۆڕستان ، بەڵام بە مەرجێك خێراییەکە وانەبێت شتێکی خـراپ بەسـەر مردووەکـەدا بێنێـت یـا ببێتـە بـارێکی گـران بەسـەر شـانی هەڵگرەکانەوە، یا ئەوانەی لەگەڵیا دەڕۆن ، هەتا ئەوەی مەبەستە لە پاك و خاوێنی و ئەزیەت نەکردنی موسوڵمان لەدەست نەچێت .

ئیمام (قرطبي) فەرموویەتی: مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە کە مردووەکە لـە ناشتن دوا نـەخرێت ، چـونکە لەسـەرخۆ ڕۆیـشتن لەوانەیـە ببێتـە هـۆی شانازی کـردن و دەمار زلی .

**چوارەم: (لەحەد) چاکترە لە (شەق):**

١- لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کـەوا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( اللحد لنـا والـشق لغيرنـا ))[٢٥٥] واتـە: (لەحـەد) بـۆ ئێمەیـە و ، (شەق) یش بۆ غەیری ئێمە .

---

[٢٥٥] **صحيح** – (ئەبوداود) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (في اللحـد) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣٢٠٨) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (مـا جاء في قـول الـنبي : اللحـد لنـا والـشق لغيرنـا) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (١٠٤٥) ، هـەروەها (نەسائی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (اللحـد والـشق) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٠٠٨) ، هـەروەها (ابـن ماجـه) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في استحباب اللحد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٥٤) ، هەروەها شێخ ( ئەلبانی) لە (سنن ابي داود / ج ٢ - ص ٢١٣ - ح ٣٢٠٨) ، و (سنن ابـن ماجـه / ج ١ - ص ٤٩٦ - ح ١٥٥٥) ، و (سـنن النـسائي / ج ٤ - ص ٨٠ - ح ٢٠٠٩) ، و (حامع الترمـذي / ج ٣ - ص ٣٨٣ - ح ١٠٤٥) ، و (صـحيح الجـامع الـصغير/ ح ٥٤٨٩) دا فەرموویەتی : (صحيح) ە.

ب- لە (عامیر) ی کوڕی (سەعد) ی کوڕی (ئەبی وەققاص) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن سعد بن أبي وقاص ، قال: في مرضه الذي هلك فيه: الحدوا لي لحدا ، وانصبوا علي اللبن نصبا ، كما صنع برسول الله (ﷺ)))[256]
واتە : (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) لەو نەخۆشییەدا کە تیایا مرد ڕایسپارد فەرمووی: لادڕ (لەحەد) م بۆ لێدەن و بەخشتی کاڵ لای پشتم بگرن ، پێغەمبەری خوایان (ﷺ) چۆن لێکرد منیش ئاوا .

**(لەحەد):** ئەوەیە کە لە لاوە لە ڕووی قیبلەوە چاڵی بۆ بکرێ . **(شەق):** ئەوەیە کەلە ژێرەوە چاڵ بکرێت وەك جۆگەی ئاو.

**پێشەوا (نەوەوی) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەم بارەوە فەرموویەتی***: زانایان کۆبوونەتەوە لەسەر ئەوەی کە (لەحەد) و (شەق) هەردووکیان دروستن ، بەڵام ئەگەر زەویەکە ڕەق بوو ، نەدەڕووخا ئەوە (لەحەد) ە کە باشترە، لەبەر ئەو بەڵگانەی پێشوو ، وە ئەگەر زەویەکە زوو دەڕوخا ئەوە (شەق) چاکترە.

**پێنجەم: قوڵ کردنی گۆڕ:**

وا باشە گۆڕ ئەوەندە قوڵ بکرێت تا پارێزراو بێت لە دڕندە و، هەروەها بۆنیشی نەیەتەدەر.

---

[256] **صحیح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في اللحد ونصب اللبن على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٣٧) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (اللحد والشق) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٠٧).

* (المجموع شرح المهذب/ ج ٥ - ص ٢٨٧).

(ابن المنذر) لە (عومەر) ی کوڕی (خەتتاب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا: (( أنه أوصى: أن يعمق قبره قامة وبسطة ))[257]

واتە : کەوا (عومەر) وەسێتی کردووە و فەرموویەتی: ئەوەندەی باڵای پیاوێك کە دەست بەرز بکاتەوە گۆڕەکەم قوڵ بکەن و ، ئەوەندەی مردوویەکیش فراوانی بکەن.

وە لەلای ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (ئەحمەد): گۆڕ ئەوەندەی نیو باڵای پیاو قوڵ دەکرێت ، وە ئەگەر لەوە زیاتر بێت چاکترە .

**شەشەم: ڕاخستنی پۆشاك لەناو گۆڕدا:**

جومهوری زانایان بە خراپیان داناوە پۆشاك یا سەرین و ئەو جۆرە شتانە لەناو گۆڕا بۆ مردوو ڕابخرێت .

**بەڵام (ئیبنوحەزم) ڕای وایە:** کە قەیناکە پۆشاك ڕابخرێت لەژێر مردوودا لەناو گۆڕدا، ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی (موسلیم) لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( جعل في قبر رسول الله (ﷺ) قطيفة حمراء))[258]

واتە : لەکاتی ناشتنی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پارچە قەیفەیەکی سووریان لە ژێر تەرمەکەیدا ، لە گۆڕەکەیدا ڕاخست .

---

[257] (ابن المنذر) لە کتێبی (الأوسط) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (دفن الموتى - ذكر قدر ما يعمق القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٢).

[258] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (جعل القطيفة في القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٣٨) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الثوب الواحد يلقى تحت الميت في القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٨) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (وضع الثوب في اللحد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠١١).

**پاشان دەفەرموێ:** خوا وازی لەو کارە هێنا کاتی ناشتنی پێغەمبەرە مەعصومەکەی (ﷺ) و لێی قەدەغە نەکرد ، وە چاکترین کەسانی سەر زەوی لەو کاتەدا ئەو کارەیان کردووە بە ڕای هەموویان و کەسیان نکۆڵییان لێ نەکرد .

**٣ ) سوننەتەکانی ناشتنی مردوو:**

**یەکەم: لە کاتی ناشتنی ئافرەتی مردوودا*:**

سوننەتە پارچەیەك قوماش یان هەر شتێکی تر بدرێ بەسەر گۆڕەکەدا تا دەنێژرێت ، بۆ ئەوەی ببێ بە سترێ بۆی .

ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) و (ئەحمەد) بە پەسەندیان داناوە کەوا پۆشاکێك بەسەر گۆڕەکەدا بدرێت ئەگەر هاتوو مردووەکە ئافرەت بوو ، بەڵام بۆ پیاو پێویست ناکات ، وە (شافیعیەکان) بە پەسەندیان داناوە ئەو کارە بۆ ژن و پیاو بکرێت .

**دووەم: سوننەتە مردوو لای شوێن قاچیەوە بخرێتە ناو گۆڕەوە، جا ئەگەر وا ڕێ نەکەوت ئەوا لە لای قیبلەوە بخرێتە ناو گۆڕەوە:**

لە (ئەبی ئیسحاق) ی هەمەندانیەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أوصى الحارث أن يصلي عليه عبد الله بن يزيد ، فصلى عليه ، ثم أدخله القبر من قبل رجلي القبر ، وقال : هذا من السنة ))[٢٥٩]

---

* (المغني لإبن قدامة/ ج ٢، ص ٥٠١).

[٢٥٩] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في الميت يدخل من رجليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢١١) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من قال : يسل الميت من قبل رجل القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٤٥) ، هەروەها (ابن سعد) لە کتێبی (الطبقات الكبرى) دا ، لە ژێر ناونیشانی: (طبقات البدريين من الأنصار: ومن هذه الطبقة ممن

واتـە : (حاریـث) ڕایسپارد کـە (عبـدالله ی کـوڕی یەزیـد) نوێـژی لەسـەر بکـا ، جـا (عبدالله) کە نوێـژی لەسـەر کـرد لـە دامێنـی گۆڕەکـەوە دایهێلاّیـە نـاو گۆڕەکـەوە و فەرمووی: ئەمە سوننەتە .

(ئیبنوحـەزم) فەرموویـەتی: چـۆن لـوا وەهـا مـردوو دەخرێتـە نـاو گـۆڕەوە ، یـا لای قیبلەوە یا لەپاش قیبلەوە ، یا لای سەریەوە ، یـا لـەلای قاچیەوە ، چونکە دەقێك نەهاتووە لەو بارەیەوە .

**سێیەم: سوننەتە ئەوکەسەی مردووەکە دەخاتە ناو گۆڕ ئەم زیکـرە بڵـێ: (بسم الله وعلى سنة - أو ملة - رسول الله):**

لـە (ئیبنوعومـەر) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( أن النبي (ﷺ) كان إذا وضع الميت في القبر قال: بسم الله ، وعلى سنة رسول الله (ﷺ) ))[٢٦٠] واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەستووری وا بوو کاتێ مردوویەکی بخستایەتە ناو

---

ڕوی عن علي بن أبي طالب وعبد الحارث الأعور بن عبد الله بن كعب بن أسد بن خالد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٤١٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٣، ص ٢١٣، ح ٣٢١١)، و (تلخیص احکام الجنائز / ص٦٣) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

[٢٦٠] **صحیح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في الدعاء للميت إذا وضع في قبره) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢١٣)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقول إذا أدخل الميت القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٦)، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الکبری) دا لە کتابی (عمل اليوم والليلة)، بابی: (ما يقول إذا أدخل الميت في اللحد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٨٦)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في إدخال الميت القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٥٠)، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقال إذا أدخل الميت قبره) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٥١)، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٨٩).

گۆڕ دەیفەرموو: بەناوی خوا ، وە لەسەر میللەت و سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

**چوارەم: وا باشترە ئەوکەسەی مردووەکە دەکاتە ناو گۆڕ یەکێ لەمانە بێت: وەسێت بۆ کراو ، یاخود کەسە نزیکەکانی ، یاخود هەر موسوڵمانێکی تر.**

بەڵام ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو ئەوە وا باشە کە ڕەچاوی ئەم ڕیزبەندیە بکرێ: ١) ئەوانەی مەحرەمن پێی . ٢) مێردەکەی .

**پێنجەم: سوننەتە کاتێ مردوو دەخرێتە ناو گۆڕ لەسەر لای ڕاست بخرێتە ناوی و ، وە ڕوو لە قیبلە بێت:**

لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کەوا فەرمووی: (( - الكعبة - قبلتكم أحياء وأمواتا ))[261] واتە : کەعبە قیبلەتانە بە زیندوویی و بە مردوویش .

وە هیچ شتێ ناخرێتە ژێر سەری لە بەرد و لە خشت ، لەبەر ئەوەی هیچ فەرموودەیەکی ڕاست لەو بارەوە نەهاتووە ، وە نابێ دەم و چاوی ئاشکرا بکرێت ، مەگەر کاتێ ئەو مردووە لە ئیحرامدا بوو بێت . پاشان ئەو شوێنانەی کەلە (لەحەد) ە کەدا قلێشن و دیارن بە بەرد ئەیگرین ، وە کونی نێوان بەردەکانیش بە قوڕ دەیگرین.

**شەشەم: سوننەتە کاتێ مردوو دەخرێتە ناو گۆڕ هەموو یەکێ لەو موسوڵمانانەی کە حازرن لەوێدا سێ چنگ خۆڵ بکەنە ناو گۆڕەکەوە:**

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) ، صلى على جنازة ، ثم أتى قبر الميت ، فحثى عليه من قبل رأسه

---

[261] حسن - (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في استقبال القبلة بالموتى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣٤٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (إرواء الغليل / ص٦٩٠) دا فەرموویەتی : (حسن) ە.

ثلاثا ))[٢٦٢] واتـه: پێغەمبـەر (ﷺ) نوێـژی لەسـەر مردوویـەك كـرد و ، پاشـان كـە ناشتیان هاتە سەر گۆڕەكەی و لە لای سەری گۆڕەكەوە سێ مشت خۆڵی كرد بەسەر مردووەكەدا.

**پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) لەم بارەوە لە (الأذكار) دا فەرموویەتی* :**

سوننەتە بۆ ئەوكەسەی كەوا لەسەر گۆڕەكە وەستاوە سێ چنگ گڵ بخاتە ناو گۆڕەكە لەلای سەرییەوە.

جا كۆمەڵێ لە هاوەڵانمان فەرموویانە: موستەحەببە كەوا لەگەڵ فڕێدانی چنگی یەكەمـدا بڵێـت: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ﴾ وەلـە فڕێـدانی چـنگی دووەمـدا بڵێـت: ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾ ، وە لـە فڕێـدانی چـنگی سێیەمیـشدا بڵێـت: ﴿وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ﴾ (طه : ٥٥).

**حەوتەم: سوننەتە گۆڕەكە بە ئەندازەی بستێك بەرز بكرێتەوە بۆ ئەوەی بزانرێت كـە ئەوە گۆڕی مردووە و ئیهانە نەكرێت، وە با ئەو بەرزكردنەوەیە وەك شێوەی پشتی حوشتر وابێت:**

لــە (جــابر) ی كــوڕی (عبــدالله) وە (خــوای لیّ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە كــەوا فەرموویەتی: (( أن النبي (ﷺ) ألحد لـه لحد ، ... ورفـع قـبره مـن الأرض نحوا مـن شبر))[٢٦٣]

---

[٢٦٢] **صحیح** - (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في حثو التراب في القبر) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٥٦٥) ، هـەروەها لـە (تحفـة الأشـراف) دا بـە ژمـارە (١٥٤٠٢) هـاتووە ، هـەروەها شـێخ (ئــەلبانی) لــە (ســنن ابــن ماجــە / ج ١ - ص ٤٩٩ - ح ١٥٦٥) ، و (إرواء الغليــل / ح ٧٥١) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

* (نيل الأوطار بتخريج احاديث كتاب الأذكار/ ج ١ - ص ٣٧٧).

واتـه : پێغەمبـەر (ﷺ) (لەحـەد) یـان بـۆ کـرد و ... وە گۆڕەکەشیان بـه ئەنـدازەی بستێك بەرز کردەوە.

**پێشەوا (طەبەری) فەرموویەتی:** من حەز ناکەم کە گۆڕ لەم دوو واتایە تـێ بپـەڕێ: یـا تەخت بکرێ لەگـەڵ زەویـدا ، یـا وەك پـشتی وشـترێ لێ بکـرێ ئەوەنـدەی بـستێك ، وەك ئەوەی موسوڵمانانی ئەو کاتە لەسەری بوون .

جا زانایان سەبارەت بە تەخت کردنـی گۆڕو بەرزکردنـەوەی بـە ئەنـدازەی بـستێك جیاوازییان هەیە کە ئایا کامەیان چاکترە؟

**قازی (عیاض) لە بەشی زۆری زانایانەوە دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویانە:** چاکتر ئەوەیە کـە وەك پشتی وشترێ لێ بکرێ و ئەوەندەی بستێك بەرز بکرێتەوە ، چونکە (سوفیانی تەممار) بۆیگێڕاوەتەوە کەوا فەرموویـەتی: (( أنـه رأى قـبر الـنبي (ﷺ) مـسنما ))[٢٦٤]

واتە: گۆڕی پێغەمبەری (ﷺ) بینیوە وەك پشتی وشتر بووە .

ئەمەش ڕای ئیمـام (ئەبوحەنیفـە) و (مالیـك) و (ئەحمـەد) و (مـوزەننی) و بەشـی زۆری (شافیعیەکان) ە .

**بەڵام ئیمام (شافیعی)** بۆ ئەوە چووە کە تەخت کردنـی چاکترە ، بـەپێی ئـەوەی کـە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە تەخت کردنی .

---

[٢٦٣] **حسن** - (بەیهـەقی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی: (لا یـزاد في القـبر علـى اکثـر مـن ترابـە لـئلا یرتفـع) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٦٣٥٦) ، هـەروەها (ابـن حبـان) لـە کتـابی (التـاریخ) دا لـە ژێـر ناونیشانی: (ذکر وصف قـبر المـصطفى (ﷺ) وقـدر ارتفاعـه مـن) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٦٧٤٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (تلخیص أحکام الجنائز / ص ٦٤) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

[٢٦٤] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في قـبر الـنبي (ﷺ) ) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (١٣٩٠).

**هەشتەم: پاشان کێلێك دەخرێتە سەر گۆڕەکە بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئەوە گۆڕی مردووە و ئیهانە نەکرێت ، پاشان کێلەکە بە ئاو تەڕدەکرێ لەبەر ئەوەی لە سوننەتدا وا هاتووە*.**

**نۆیەم: وە نیشانەیەك لە لای سەری گۆڕەکەوە دا دەنرێ بۆ ئەوەی گۆڕی ئەوکەسەی پێ بناسرێتەوە، هەر بەو چەشنەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کردی لەسەر گۆڕی (عوسمانی کوڕی مەظعون) ی برای شیری (خوای لێ ڕازی بێت):**

لە (موتەلیبی ئەبی وەداعە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( لما مات عثمان بن مظعون ، أخرج بجنازته فدفن ، فأمر النبي (ﷺ) رجلا أن يأتيه بحجر ، فلم يستطع حمله ، فقام إليها رسول الله (ﷺ)، وحسر عن ذراعيه ، قال كثير: قال المطلب: قال الذي يخبرني ذلك: عن رسول الله (ﷺ) ، قال: كأني أنظر إلى بياض ذراعي رسول الله (ﷺ)، حين حسر عنهما ثم حملها فوضعها عند رأسه ، وقال: أتعلم بها قبر أخي ، وأدفن إليه من مات من أهلي ))[٢٦٥]

واتە: کاتێك کە (عوسمان) ی کوڕی (مەظعون) وەفاتی کرد - کە برای شیری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو - جەنازەکەیان دەرکرد و ناشتیان ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بە پیاوێك کرد کەوا بەردێکی بۆ بێنێ ، جا کابرا نەیتوانی هەڵی بگرێت ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی هەڵسا و هەردوو قۆڵی لێ هەڵکرد ،

---

* (الإرواء / ج ٣ - ص ٢٠٦).

[٢٦٥] **حسن** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في جمع الموتى في قبر والقبر يعلم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٦) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (إعلام القبر بصخرة أو علامة ما كانت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣٦٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود / ج ٣ - ص ٢١٣ - ح ٣٢٠٦) ، و (مشكاة المصابيح / ج ١ - ح ١٧١١ ) دا فەرموویەتی : سەنەدەکەی (حسن) ە .

(موتـەڵیب) - کەلـە فـەتحی مەککـەدا بـاوەڕی هێنـا - فـەرمووی : ئەوکەسـەی کەلـە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆی گێڕامەوە وتی: وەکو ئێستا تەماشـای سـپێتی هـەردوو باڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەم کاتێك هەڵی گرتبوو ، پاشان بەردەکەی هەڵگرت و خستیە سەر شانی و فەرمووی : بەم بەردە گۆڕی براکـەم دەبینمـەوە ، وە لـە لایـدا ژێر خاکی هەر کەسێك لە کەس و کارم بمرێت دەکەم.

**دەیەم و یانزەیەم: سوننەتە لەسەر گۆڕەکەی بوەستی و دوعای خێری بـۆ بکـەی و، داوا لە ئامادەبوانیش بکەی کەوا دوعای خێری بۆ بکەن:**

١- لـە (عوسمـان) ی کـوڕی (عـەففان) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( کان النبي (ﷺ) إذا فرغ من دفن الميت وقف عليه ، فقال: استغفروا لأخيكم ، وسلوا له التثبيت ، فإنه الآن يسأل ))[٢٦٦]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر کاتێك لە ژێر خاك کردنی مردوو ببوایەتەوە ، لـە سەری ڕادەوەسـتا و دەیفـەرموو : داوای لێخۆشـبوون بـۆ براکـەتان بکـەن ، وە داوای ئەوەی بۆ بکەن کە خـوای گـەورە جـێگیری بکـات ، چونکە ئێـستا ئـەو پرسـیاری لێ دەکرێت.

٢- لـە (عومـەیر) ی کـوڕی (سـەعید) ی نەخەعییـەوە (ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی (( كبر علي على يزيد بن المكفف أربعا ، وجلس على

[٢٦٦] صـحيح - (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (الاسـتغفار عنـد القـبر للميـت في وقـت الانصراف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢١) ، هـەروەها (بەیهەقی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی: (ما يقال بعد الدفن) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٦٦٥٨) ، هـەروەها (ابـن السنی) لـە کتێبـی (عمـل اليوم والليلة) دا ، بابی : (ما يقول إذا فرغ من دفن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٨٤) ، هـەروەها شـێخ (ئەلبانی) لـە (سـنن أبـي داود / ج ٢ - ص ٢١٥ - ح ٣٢٢١) ، و (صـحيح الجـامع الـصغير/ ح ٤٧٦٠) ، و (مشكاة المصابيح / ج ١ - ح ١٣٣) ، و (صـحيح الترغيـب والترهيـب / ج ٣ - ح ٣٥١١) دا فەرموويـەتی: (صحيح) ه.

القبر وهو يدفن قال: اللهم عبدك وولد عبدك ، نزل بك اليوم وأنت خير منزول به، اللهم وسع لـه في مدخله ، واغفـر لـه ذنبـه ، فإنـا لا نعلـم منـه إلا خـيرا وأنـت أعلـم بـه))[٢٦٧] واتـه : كاتـێ (یەزیـدی كـوڕی موكەففـەف) مـرد ، پێـشەوا (عـەلی) نوێـژی جەنازەی لەسەر كردو چوار (الله أكبر) ی لەسەر كرد ، وە كاتێ ناشتیان چوو لەسەر گۆڕەكەی وەستاو فەرمووی: خوایە ! ئەوە بەندەی خۆتـە و كـوڕی بەنـدەی خۆتـە ، ئەمڕۆ بۆتە میوانت ، وە تۆ چاكترین خاوەن ماڵیت ڕێز لە میوان دەگریت ، خوایە! شوێنەكەی بۆ فراوان بكە و ، وە لێی خۆش ببـە ، چـونكە بەڕاسـتی ئێمـە چاكە و پیاوەتی نەبێ هیچ شتێكی تری لەبارەوە نـازانین ، وە هـەر خـۆت زانـا و شـارەزایت بە حاڵی ئەو .

٣- لە (عبدالرحمن) ی كوڕی (عەلاء) ی كوڕی (لەجلاج) ە وە ئـەویش لـە باوكیـەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە كەوا لە سەرەمەرگا بـە كوڕەكـانی فـەرمووە: (( إذا أدخلتموني قبري فضعوني في اللحد ، وقولوا : باسـم الله وعلـى سـنة رسـول الله (ﷺ) ، وسنوا علي التراب سنا ، واقرءوا عند رأسي أول البقرة وخاتمتها ، فـإني رأيـت ابن عمر يستحب ذلك ))[٢٦٨]

---

[٢٦٧] (عبدالرزاق) لە (مصنف) ە كەيدا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (الدعاء للميت حين يفرغ منـه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٩٨) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە كەیدا لە كتابی (الجنائز)، بـابی : (في الـدعاء للميـت بعـدما يـدفن ويـسوى عليـه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١١٥٠٤) ، هـەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يستدل به على أن أكثـر الـصحابة اجتمعوا على أربع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٥٥).

[٢٦٨] (بەیهەقی) لە (الـسنن الكـبرى) دا لـە كتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا ورد في قـراءة القـرآن عنـد القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمـارە (٦٦٦٢) ، هـەروەها () لـە كتێبـی (شـرح أصـول الاعتقـاد) دا ، بـابی : (جماع الكلام في الإيمان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧٦٤) ، هەروەها (أبي بكر بـن الخـلال) لـە كتێبـی (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) دا ، بابی : (القراءة عند القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤٣).

ئەزەلدا جێگەی هەم لە بەهەشت و هەم لە دۆزەخدا نووسراوە ، هەروا نووسراوە کە بەدبەختە یا بەختەوەرە ، پیاوێکیش لە یاران فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! جا کەوایە بۆ بەو نووسراوەمان پشت نەبەستین و پشتی لێ نەدەینەوە و ئیتر واز لە کارو کردەوەی چاکە بهێنین ، ئێمە چی بکەین و چی نەکەین ، بێ سوودە ، چونکە جێگەمان لە بەهەشتا ، لە دۆزەخدا لە پێشدا ، لە ئەزەلەوە دیاریکراوە ، فەرمووی: ئێوە لە کاری چاکە سارد مەبنەوە و کارو کردەوەی خۆتان بکەن ، چارەنووس ڕازو نهێنیەکی خوایە ، هۆش و ئەقڵی ئێوە دەرکی حیکمەت و دانایی ئەو نهێنییە ناکات ، هەرکەسێ لە ئەزەلدا ، لە زانستی خوادا بۆ کوێ دروست کرابێ ، ڕێگەی ئەوێ دەگری ، جا لەسەر ئەم بنیاتە بەختیار ڕێگەی چاکە دەگرێ و ، بەدکار ڕێگەی خراپە (واتە: بەم پێیە کاری باش نیشانەی بەهەشت و خراپە نیشانەی دۆزەخە). ئنجا پێغەمبەر (ﷺ) لە بۆ پشتیوانی ئەم مەسەلەیە ، ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ (الليل/ ٥ - ٧) واتە: جا هەرکەسێ ماڵی خۆی لە ڕێگەی خوادا بدا و ، زەکات و سەرفیترە و بەشی بەشدارانی لێ بداو ، لە خوا بترسێ و خۆی لە گوناهو تاوان بپارێزێ ، ئەوە ئێمەش ئەوکەسە دەخەینە سەر ڕێگەی چاکە و ، ئامادەی دەکەین بۆ گەیشتن بە پلەی باش کە شادبوونە بە دیداری خوای مەزن و چوونە ناو بەهەشتی بەرینە !

## ٢) ئەوەی لەبارەی تەلقین دادانی مردووەوە هاتووە

**پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) لەم بارەوە لە (الأذكار) دا فەرموویەتی*:**

بێگومان کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵانمان بە موستەحەبیان داناوە، لەوانەش کە فەرمایشتی هاتووە لەسەر موستەحەبێتی تەلقین: قازی (حسێن) ە لە (تەعلیقە) کەیدا، وە هاوەڵەکەی (ئەبو سەعد) ی متەوەللی یە لە کتێبەکەی خۆیدا (التتمة)، وە هەروەها شێخ و پێشەوا و زاهید ئەبو فەتح (نەصر) ی کوڕی (ئیبراهیم) ی کوڕی (نەصر) ی مەقدیسی یە ، هەروەها ئەبو قاسمی ڕافیعی و، کەسانی تریش.

بەڵام سەبارەت بە لەفزەکەی: شێخ (نەصر) فەرموویەتی: کاتێ کۆتایی هات بە شارینەوەکەی ئەوە لەلای سەری مردووەکە ڕادەوەستێ و ، دەڵێت: **(يا فلان بن فلان! أذكر العهد الذي خرجت عليه من الدنيا، شهادة أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمدا عبده ورسوله، وأن الساعة آتية لا ريب فيها، وأن الله يبعث من في القبور، قل: رضيت بالله ربا، وبالإسلام دينا، وبمحمد (ﷺ) نبيا، وبالكعبة قبلة، وبالقرآن إماما، وبالمسلمين إخوانا، ربي الله لا إله إلا هو، وهو رب العرش العظيم)** واتە: ئەی فلانی کوڕی فلان! یادی ئەو پەیمانە بکەرەوە کەلە دونیادا لەسەری دەرچووی، کە ئەویش شەهادەتدانە بەوەی: کەوا هیچ پەرستراوێك نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوا کە تاك و تەنهایە و هیچ هاوبەشێکی نییە، وە (محمد) یش بەندە و نێردراوی ئەوە، وە بێگومان ڕۆژی قیامەت هەر دێت و گومانی تێدا نییە، وە بێگومان خوای گەورەش مردووی ناو گۆڕەکان زیندوو دەکاتەوە، وە بڵێ: ڕازیم بەوەی کە (خوا) پەروەردگارم بێت، وە (ئیسلام) ئایینم بێت، وە (محمد) یش پێغەمبەرم بێت ، وە (کەعبە) ش قیبلەم بێت، وە (قورئان) یش پێشەوام بێت ، وە

---

* (نيل الأوطار بتخريج أحاديث كتاب الأذكار / ج ١ - ص ٣٧٩).

(موسوڵمانان) یش برام بن ، پەروەردگارم تەنها خوایە و هیچ پەرستراوێكیش نییە شایانی پەرستن بێت جگە لەو، وە هەر ئەویش پەروەردگاری عەرشی مەزنە.

**پاشان (نەوەوی) دەفەرموێ:** ئەم لەفزە لەفزی شێخ (نەصر) ی مەقدیسی یە كە لە كتێبەكەیدا (التهذیب) ئاماژەی پێداوە، وە لەفزی ئەوانی تریش هەربەم شێوەیەیە، جا هەیانە وتویانە: (**یا عبدالله ابن أمة الله**) واتە: (ئەی بەندەی خوای كوڕی كەنیزەكی خوا)، وە هەشیانە وتوویانە: (**یا عبدالله بن حواء**) واتە: (ئەی بەندەی خوای كوڕی حەووا)، وە هەیانە وتوویانە: (**یا فلان - باسمه - ابن أمة الله**) واتە: (ئەی فلان - واتە بە ناوی خۆیەوە بانگی دەكات - كوڕی كەنیزەكی خوا)، یان (**فلان بن حواء**) واتە: (ئەی فلانی كوڕی حەووا)، وە هەمووشیان یەك واتا دەبەخشن .

**سەبارەت بە منالیش پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ:** بە هیچ شێوەیەك تەلقینی منال ناكرێت ، جا ئیتر هیچ جیاوازی نییە ئەو منالە شیرە خۆرە بێت یا گەورەتر بێت ، مادام بالغ نەبووە و تەكلیفی شەرعی نەكەوتۆتە سەر.

هەروەها (ابن حجر) ی عەسقەلانی ئەو باسەی لە (تلخیص) دا باسكردووە ، بەڵام بێدەنگ بووە لەسەری .

وە پێشەوا (تەبەرانی) لە حەدیسی (ئەبی ئومامە) ی باهیلییەوە دەگێڕێتەوە كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا مات أحد من إخوانكم ، فسويتم التراب على قبره ، فليقم أحدكم على رأس قبره ، ثم ليقل: يا فلان بن فلانة ، فإنه يسمعه ولا يجيب ، ثم يقول : يا فلان بن فلانة ، فإنه يستوي قاعدا ، ثم يقول: يا فلان بن فلانة ، فإنه يقول: أرشدنا رحمك الله ، ولكن لا تشعرون . فليقل: اذكر ما خرجت عليه من الدنيا: (شهادة أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا عبده ورسوله) ، وأنك رضيت بالله ربا ، وبالإسلام دينا ، وبمحمد نبيا ، وبالقرآن إماما ، فإن منكرا ونكيرا يأخذ

واحد منهما بيد صاحبه ويقول: انطلق بنا ما نقعد عند من قد لقن حجته ، فيكون الله حجيجه دونهما . فقال رجل: يا رسول الله ، فإن لم يعرف أمه ؟ قال: فينسبه إلى حواء ، يا فلان بن حواء ))[٢٧١]

واتە: ئەگەر كەسێكتان مردو گڵەكەتان كردەوە بەسەریدا ، با یەكێكتان لای سەری مردووەكە بوەستێت و بڵێت: ئەی فلانەكەسی كوڕی فلانەكەس بەناوی دایكیەوە ، چونكە مردووەكە دەی بیستێ ، بەلام وەلامی ناداتەوە ، پاشان بڵێتەوە: ئەی فلانی كوڕی فلان مردووەكە ڕاست دەبێتەوە ، پاشان بڵێتەوە: ئەی فلانی كوڕی فلان مردووەكە دەڵێت: ڕێنماییمان بكە ، خوا ڕەحم و میهرەبانیت بەسەرا بڕژێنێت ، بەلام ئێوە هەست ناكەن ، ئنجا با ئەو كەسە بڵێت: لە بیرت بێ لە دونیا لەسەر چی دەرچوویت ؟ ئەویش: (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله) ، وە بیرت بی كە تۆ ڕازی بوویت خوا پەروەردگارت بێت ، وە ئیسلام ئایینت بێت ، وە موحەممەد پێغەمبەرت (ﷺ) بێت ، وە قورئان پێشەوات بێت ، چونكە كە ئەمەی وت (مونكەرو نەكیر) دەستی یەك دەگرن و دەفەرموون: با بڕۆین چی دامان دەنیشێنێ لای كەسێك كە فێری وەلامەكەی كرابێت ، جا پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! ئەی ئەگەر دایكی نەناسێت چی ؟ فەرمووی: با بەناوی دایكە حەواوە بانگی بكات ، بڵێت: ئەی فلانی كوڕی حەووا .

---

[٢٧١] منكر- (تەبەرانی) لە (المعجم الكبير) دا ، بابی : (الصاد: ما أسند أبو أمامة - سعيد بن عبد الله الأودي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٨٦١) ، هەروەها لە كتێبی (الدعاء) دا ، بابی : (ما يقال عند قبر الميت بعدما يدفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١١٦) ، شێخ (ئەلبانی) لە (سلسلة الأحاديث الضعيفة/ ج ٢، ص ٦٤، ح ٥٩٩) دا فەرموویەتی: (منكر) ه.

**جا (ابن حجر) ی عەسقەلانی لە (تلخيص) دا فەرموویەتی:** ئیسنادەکەی (صالح) ە ، وە (ضياء) لە (أحكام) ە کەیدا بە بەهێز (قوي) داناوە ، وە لە ئیسنادەکەیدا (عاصمی کوڕی عبدالله) هەیە کە ئەویش لاواز (ضعيف) ە .

**وە (هەیثەمی) دوای هێنانی ئەو حەدیسە فەرموویەتی:** لە ئیسنادەکەیدا کۆمەڵێك هەیە نایان ناسم .

**وە پێشەوا (نەوەوی) فەرموویەتی:** ئەو حەدیسە هەرچەندە لاواز (ضعيف) ە ، بەڵام دڵ پێی خۆش دەبێت .

جا ئەهلی (شام) لەو سەردەمەوە هەتا ئێستا هەر لەسەر ئەو کارە بەردەوامن ، وە (مالیکیەکان) لە بۆچوونە بەناوبانگەکەیاندا و هەندێ لە (حەنبەلیەکان) بۆ ئەوە چوون: کە تەلقین کەراهەتی هەیە .

**(أثرم) لەم بارەیەوە دەفەرموێ:** بە (ئەحمەد) م وت: ئەوەی خەڵك دەیکەن کاتێك کەسێك دەنێژن ، یەکێکیان لە ژوور سەریەوە دەوەستێت و دەڵێت: ئەی فلانی کوڕی فلان ... ، چییە ؟ فەرمووی: کەسم نەبینیوە شتی وەها بکات خەڵکی شام نەبێت لەو کاتەوە (ئەبوموغیرە) مردووە .

وە لە (ئەبی بەکری کوڕی ئەبی مەریەم) ە وە دەگێڕنەوە ئەویش لە ماموستاکانیەوە کەوا شتی وەهایان کردووە .

**٣) ئەوانەی حەرامە لەلای گۆڕدا یاخود لەسەری بکرێت:**

**یەکەم: بەرزکردنەوەی لە ئەندازەی بستێك:**

١- لـە (ئـەبی هـەییاج) ئەسـەدییەوە (ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( قال لي علي بن أبي طالب: ألا أبعثك على ما بعثني عليه رسول الله (ﷺ)؟ أن لا تدع تمثالا إلا طمسته ولا قبرا مشرفا إلا سويته ))[٢٧٢]

واتە : (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب) فەرمووی پێم: بزانە ! لەسـەر ئـەو ڕێبـازە ڕاسـتە دەتنێـرم کـە کـاتی خـۆی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) منـی لەسـەر نـارد: کـە هەرچـی پەیکەرێکت دی کوێری بکەرەوە ، وە هەرچی گۆڕێکی قنج و قیتت دی تەختی بکە و متی بکە بە زەوییەکەوە .

٢- لـە (ثـومامــە) ی کـوڕی (شـوفەی) هەمەدانییـەوە (ڕەحمــەتی خـوای لێ بـێ) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كنا مـع فـضالة بـن عبيـد بـأرض الـروم بـرودس ، فتوفي صاحب لنا ، فأمر فضالة بـن عبيـد بقبره فـسوي ، ثـم قـال سمعت رسـول الله (ﷺ): يأمر بتسويتها ))[٢٧٣]

واتــە : لـە سـەفەرێکدا لـە وڵاتـی ڕۆم لـە شـوێنێ بـەناوی (ڕودیـس) لـە خزمـەتی (فەزاڵەی کوڕی عوبەید) دا بووین ، جا لەوێ یـەکێ لـە هاوەڵاکانمـان کۆچـی دوایـی

---

[٢٧٢] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (الأمـر بتـسوية القبر) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٢٣٩) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في تسوية القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢١٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (تسوية القبور إذا رفعت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣٠).

[٢٧٣] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (الأمـر بتـسوية القبر) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٢٣٩) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في تسوية القبر) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٣٢١٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (تسوية القبور إذا رفعت) گێڕاویەتەوە بـە ژمارە (٢٠٢٩).

کـرد ، جـا کاتـێ ناشـتمان (فەزالـەی کـوڕی عوبەیـد) فـەرمانی پـێ کـردین کـەوا گۆڕەکەی لەگەڵ زەویدا تەخت بکەین ، وە لە پاشا فـەرمووی: لـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) خۆیم بیستووە فەرمانی دەکرد بەوە کە گۆڕ تەخت بکرێ لەگەڵ زەویدا .

**پێشەوا (ترمذی) فەرموویەتی:** کار بەوە کراوە لەلایەن هەنـدێ لە زانایانـەوە ، وە بـە خراپیان داناوە کـە گـۆڕ لـە زەوییـەوە بـەرز بکرێتـەوە ، ئەوەنـدە نـەبێت کـە پێـی بزانرێت و بناسرێتەوە کە ئەوە گۆڕە و بەس ، بۆ ئەوەی کەس بەسـەریا نـەڕوات و کەس لەسەری دانەنیشێت .

**ئیمـام (شـافیعی) فەرموویـەتی:** مـن وا حەزدەکـەم گـۆڕ لـە گڵەکـەی خـۆی زیـاتری نەکرێت بەسەردا ، وە هەر ئەوەندەم پێ باشە کە بستێك لە زەوی بەرز بکرێتەوە.

**(شەوکانی) فەرموویەتی:** وا دەردەکەوێت بەرزکردنـەوەی گۆڕەکان زیـاتر لـەوەی کـە ڕوخسەت دراوە حەرامـە ، وە هـاوەڵانی ئیمـام (ئەحمـەد) و کۆمـەڵێك لـە هـاوەڵانی ئیمام (شافیعی) و هاوەڵانی ئیمام (مالیك) ، ئەمەیان بە صەراحەت فەرمووە .

وە زانایان فەتوایان داوە بە ڕوخانـدنی ئەو مزگەوتانە و ئەو گومەزانەی کە لەسـەر گۆڕەکان کراوە .

**وە (ابـن حجـر) لـە (الزواجـر) دا فەرموویـەتی:** پێویسـتە دەستپێـشکەری بکـرێ بـۆ ڕوخاندنی مزگەوت و گومەزی سەر گۆڕەکان ، چونکە لە مزگەوتی (ضرار) زیانیان زۆرترە ، وە لەبەر ئەوەی لەسەر پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دروستکراون، ئەمانەش کە دروستکراون هەر لەسەر پێـچەوانەی ئـەون (ﷺ) ، چونکە پێغەمبـەر (ﷺ) قەدەغەی لەوە کردووە و فـەرمانی داوە بـە ڕوخانـدنی گـۆڕە بـەرز بووەکـان ، هەروەها پێویستە هەموو ئەو چراو چراخانەی سەر گۆڕەکان لا ببرێت ، وە دروست نیە وەقف بکرێت یا نەزر بکرێت .

**دووەم و سێیەم: حەرامە گەچکاری گۆڕ بکرێت، یا بینای لەسەر بکرێ:**

١- لـە (جـابر) ی کـوڕی (عبـدالله) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( نهى رسول الله (ﷺ) أن يجصص القبر ، وأن يقعد عليه ، وأن يبنى عليه ))[٢٧٤] واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) قەدەغـەی کـردووە کـەوا گەچکاری گـۆڕ بکرێ، وە لە سەری دابنیشی ، وە بینای لەسەر بکرێت.

٢- لـە (جـابیر) ی کـوڕی (عبـدالله) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( نهى رسول الله (ﷺ) أن يبنى على القبر ، أو يزاد عليه ، أو يجصص. زاد سليمان بن موسى: أو يكتب عليه ))[٢٧٥]

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کردبوو کەوا گۆڕ خانووی بەسەرەوە بکرێ ، یان لێی زیاد بکرێ ، یان گەچکاری بکرێ . وە لەلای (سولەیمانی کوڕی موسا) ئەمەی لێ پترە: یان لەسەری بنووسرێ .

---

[٢٧٤] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النهي عن تجصيص القبر والبناء عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٤٢) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في البناء على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٦) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی: (ما جاء في كراهية تجصيص القبور والكتابة عليها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٢) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الزيادة على القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٢٦).

[٢٧٥] **صحيح** - (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الزيادة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٢٧) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٣) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (لا يزاد في القبر على أكثر من ترابه لئلا يرتفع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣٥٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٤، ص ٨٦، ح ٢٠٢٧) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٨٥) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە:**

**لەلای جومهوری زانایان:** ئەو قەدەغە کردنە بۆ کەراهەتە ، بەڵام (ئیبنوحەزم) بە حەرامی داناوە .

**وە وتراوە:** حیکمەت لەوەدا ئەوەیە کە گۆڕ بۆ لەناوچوونە نەك بۆ مانەوە ، وە گەچکاری کردنی ، جوانیەکی دونیایی یە ، ئەو مردووە هیچ پێویستی پێی نیە .

**ئیمام (شافیعی) فەرموویەتی:** من وا حەزدەکەم گۆڕ ... ، وە هەڵنەبەسرێت و گەچ کاری نەکرێت ، چونکە ئەوە بۆ جوانی و شانازی کردنە ، وە مردن جێی هیچ یەك لەم دوانە نیە ، وە گۆڕی هیچکام لە موهاجیرین و ئەنصارم نەبینیوە گەچکاری کرابێت .

وە هەندێك لە والیەکانم بینیوە کە بینای سەر گۆڕەکان تێکدەدەن ، وە نەشم بینیوە کە زانایان ڕەخنەیان لێ بگرن .

**چوارەم و پێنجەم: حەرامە لەسەر گۆڕدابنیشی، یا پاڵی پێوەبدەی:**

١- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لأن يجلس أحدكم على جمرة فتحرق ثيابه ، فتخلص إلى جلده ، خير له من أن يجلس على قبر ))[٢٢٦]

واتە : ئەگەر لەسەر پشکۆیە ئاگری سوور دابنیشن و جلەکانتان بسووتێنێ و بگاتە پێستان و چزەی لێ هەڵبستێنێ هێشتا ئەمەتان باشترە لەوە کە لەسەر گۆڕێ دابنیشن .

---

[٢٢٦] **صحيح** – (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النهي عن الجلوس على القبر والصلاة عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٤٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في كراهية القعود على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٨).

٢- لـە (ئـەبی مـەرثـەد) ی غەنەوییـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( لا تجلسوا علـى القبـور ، ولا تصلوا إليها ))[٢٣٧] واتە : لەسەر گۆڕ دامەنیشن ، وە لە نوێژیشا ڕووی تێ مەکەن .

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە:**

**لەلای جومهوری زانایان:** لەوانە: ئیمام (شافیعی) و (ئەحمەد) و (لیث) و (ئیبراهیمی نەخەعی) و (داودی طاهری): دانیشتن لەسەر گۆڕ کەراهەتی هەیە .

**ئیمام (نـەوەوی) فەرموویـەتی:** عیبارەتەکەی ئیمـام (شـافیعی) لـە (الأم) دا و بەشـی زۆری هـاوەڵانی شـافیعی دوای ئـەویش ئەوەیـە: کـە دانیـشتن کەراهـەتی هەیـە ، وە مەبەسـتیان کەراهـەتی تەنزیهـە ، وەك لـە بـەکارهێنانی زانایانـدا بەناوبانگـە ، وە زۆریان بە ڕاشکاوانە وتوویانە .

**هەروەها فەرموویەتی:** پاڵ پێوەدانیش هەر بەو شێوەیە کەراهەتی هەیە .

**بەڵام لەلای (ئیبنوحەزم)** دانیشتن لەسەر گۆڕ حەرامە ، وە فەرموویەتی: ئەمە قسەی کۆمەڵێکیشە لە پێشین (سەلەف) ، لەوانە: (ئەبوهورەیرە) (خوای لێ ڕازی بێت).

بەڵام (ئیبنوعومەر) لە هاوەڵان و ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) بۆ ئـەوە چـوون: کە دانیشتن لەسەر گۆڕ دروستە .

**ئیمام (مالیك) لە (الموطأ) دا دەفەرموێ:** ئەو قەدەغـە کردنـەی دانیـشتنی سـەر گـۆڕ (وەك ئێمە بـزانین) کـە مەبەسـتی دانیـشتنە بـۆ دەسـت بـە ئـاو گەیانـدن ، وە لـەو بارەیەوە حەدیسێکی لاوازی باس کردووە .

---

[٢٣٧] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النهي عن الجلوس على القبر والصلاة عليـه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٢٤٧) ، هـەروەها (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (في كراهيـة القعود على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٩) ، هەروەها (ترمذی) لە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (ما جاء في كراهية المشي على القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٠).

**بەڵام ئیمام (ئەحمەد)** ئەو لێكدانەوەیەی بە لاواز داناوە ، وە فەرموویەتی: ئەو قسەیە هیچ نیە . **وە ئیمام (نەوەوی) فەرموویەتی: ئەو لێكدانەوەیە لاوازە یا باتیڵە .**

وە (ئیبنوحەزم) یش بە باتڵی داناوە لە چەند ڕوویەكەوە .

**شەشەم: دروست نیە شتی لەسەر بنووسرێ:**

لە (جابر) ی كوڕی (عبدالله) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: (( نهى رسول الله (ﷺ) أن يكتب على القبر شيء ))[٢٧٨]

واتە : **پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی كردووە كەوا شت بنووسرێ لەسەر گۆڕ .**

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە:**

**(حاكم) ی نەیسابوری دوای تەخریج كردنی ئەو حەدیسەی كە باس لە قەدەغە كردنی نووسین لەسەر گۆڕ دەكا فەرموویەتی:** ئیسنادەكەی صەحیحە ، بەڵام كاری پێ ناكرێ، چونكە پێشەوا موسوڵمانەكان لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا ناویان نووسراوە لەسەر گۆڕەكانیان ، ئەمەش كارێكە بەرودوا لەیەكیان وەرگرتووە .

**ئیمام (ذهبي) بە دوای ئەودا دەفەرموێ:** ئەوە شتێكی تازە داهێنراو (بیدعە) یە و ، ئەوەیان پێ نەگەیشتووە كە قەدەغەیە .

**بۆچوونی (حەنبەلی) ئەوەیە:** كە ئەو قەدەغە كردنە بۆ كەراهەتە ، جا چ نووسینی قورئان بێت یا ناوی مردووەكە بێت یەكسانە .

---

[٢٧٨] **صحيح** – (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في البناء على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٦) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (الزيادة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٢٦) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في النهي عن البناء على القبور وتجصيصها والكتابة عليها ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٦٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجه / ج ١ - ص ٤٩٨ - ح ١٥٦٣) ، و (صحيح الجامع الصغير / ح ٦٨٤٣) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**(شافیعیەکان)** ڕێکەوتوون لەگەڵیاندا ، بەڵام فەرموویانە: ئەگەر گۆڕەکە گۆڕی زانایایەك بێت یا پیاوچاکێك ، پەسەندە کە ناوەکەی لەسەر بنووسرێ بۆ ئەوەی لە کەسانی تر جیا بکرێنەوە .

وە **(مالیکیەکان)** ڕایان وایە: نووسینەکە ئەگەر قورئان بێت حەرامە نووسینی ، بەڵام ئەگەر بۆ دیاری کردنی ناوی مردووەکە و بەرواری مردنەکەی بوو ئەوە کەراهەتی هەیە .

**(حەنەفیەکان) یش دەفەرموون:** نووسین لەسەر گۆڕ کەراهەتی تەحریمە ، بەڵام ئەگەر ترسی ون بوونی گۆڕەکەی هەبوو قەیناکە .

**(ئیبنوحەزم) یش فەرموویەتی:** ئەگەر ناوی مردووەکە لەسەر بەردێك هەڵبکەنرێت ئێمە بە خراپی نازانین ، وە لە فەرموودەکەدا قەدەغەی ئەوە دەکات کەلە گڵەکەی خۆی زیاتر بکرێ بەسەریا .

**حەوتەم: کەراهەتی هەیە کەوا دوو مردوو یا زیاتر لە یەك گۆڕدا بشاردرێتەوە ،** مەگەر لە کاتی زۆر پێویستدا ، بۆ نموونە: مردن زۆر بێ و کەسی واش نەبێ بیان شارێتەوە ، هەر وەك بۆ شەهیدانی (ئوحود) کرا ، وە لە نێوانی هەردوو کەسدا بەربەستێك لە خۆڵ دادەنرا.

لە (هیشام) ی کوڕی (عامیر) ی ئەنصارییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( جاءت الأنصار إلى رسول الله (ﷺ) يوم أحد ، فقالوا: أصابنا قرح وجهد ، فكيف تأمرنا ، قال: احفروا وأوسعوا ، واجعلوا الرجلين والثلاثة في القبر. قيل: فأيهم يقدم ؟ قال: أكثرهم قرآنا ))[٣٧٩]

---

[٣٧٩] **صحيح** – (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في تعميق القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢١٥) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجهاد) ، بابی : (ما جاء في دفن الشهداء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧١٣) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (دفن الجماعة في القبر الواحد)

واتـە : ڕۆژی غـەزای (ئوحـود) ئەنـصارییەكان هـاتن بـۆلای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وتيـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ! خـۆت دەزانـی مانـدوو و شـەكەتين و تووشـی شكـستەیی بـووين و زامـارو شەهيديـشمان زۆرە لەبـەر ئـەوە فرياناكـەوين كـە هـەر شـەهيدەی گـۆڕێكی سـەربەخۆی بـۆ هەڵكـەنين جـا تـۆ فـەرمانت بەچييە پێمـان ؟ فـەرمووی: گـۆڕی قـووڵی پـان و پـۆڕ هەڵكـەنن و دوو پيـاوو سـێ پيـاو بەيەكـەوە بيانخەنە ناو يەك گۆڕەوە ، وترا: كاميان بخەينە لای پێشەوە (واتە: بـەری قيبلـە)؟ فەرمووی: هەر كامێكيان كە قورئانی زۆرتر لەبەر بێ !

## بابەتێكی تايبەت

## قوڕدانی گۆڕ

**ئيمام (شافيعی) فەرموويەتی:** قوڕدانی گۆڕ قەيناكە .

**پێشەوا (ترمذی) فەرموويەتی:** هەندێ لە زانايان ڕێياندواە ، لەوانە: (حەسەنی بەصری) كە گۆڕ قوڕ بدرێ .

حا وەك چۆن زانايان دەفەرموون: هەڵبەستنی گۆڕ كەراهەتی هەيە ، ئاواش بە كەراهەتيان داناوە كە بەخشتی سوورو قسڵ يا تەختە دروست بكرێت ، يا ناشتنی

---

گێڕاويەتەوە بە ژمارە (٢٠١٥) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في حفر القبر) گێڕاويەتەوە بە ژمارە (١٥٦٠) ، هەروەها (بەيهەقی) لە (شعب الإيمان) دا لە ژێر ناونيشانی: (فصل في تنوير موضع القرآن وهذا لأنها مواضع تشهدها الملائكة فمن) گێڕاويەتـەوە بـە ژمارە (٢٥٦٧) ، هەروەها (ئەبی نوعەيم) لە كتێبی (معرفة الصحابة) دا ، بابی : (الهاء: من اسمه هشام - هشام بن عامر الأنصاري) گێڕاويەتەوە بە ژمارە (٥٩٤٠) ، هەروەها شێخ (ئـەلبانی) لـە (سـنن ابـی داود/ ج ٣، ص ٢١٤، ح ٣٢١٥) ، و (جـامع الترمـذي/ ج ٤، ص ٢١٣، ح ١٧١٣) ، و (سـنن النـسائی/ ج ٤، ص ٨٣، ح ٢٠١٥) ، و (سنن ابن ماجه/ ج ١، ص ٤٩٧، ح ١٥٦٠) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٢٠٢) ، و (مشكاة المصابيح / ج ١، ح ١٧٠٢) دا فەرموويەتی: (صحيح) ە.

مردووەکە بە تابووتەوە ئەگەر زەوییەکە شێدار و تەڕ نەبێت ، بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە بوو دروستە دروستکردنی گۆڕ و هەڵبەستنی بە قسڵ و چیمەنتۆ ، وە دروستیشە کە بە تابووتەوە بنێژرێ بۆ ئەوەی کەراهەتی هەبێ .

لە (ئیبراهیم) ی نەخەعییەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( کانوا یستحبون اللبن ، ویکرهون الآجر ، ویستحبون القصب ، ویکرهون الخشب ))[280] واتە : پێشینان حەزیان لە هەڵبەستن دەکرد بە خشتی قوڕ، بەڵام بە قسڵ لایان کەراهەتی هەبووە ، وە بە قامیش پەسەند بوو لایان و بە تەختە کەراهەتی هەبووە .

**هەشتەم: سەربڕینی ئاژەڵ لەلای گۆڕدا:**

لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا عقر في الإسلام ، قال عبد الرزاق: كانوا يعقرون عند القبر بقرة أو شاة ))[281]

واتە: لە ئیسلامدا (عەقر) نییە ، جا (عبدالرزاق ی کوڕی هەممام) لە واتای (عەقر)دا فەرمووی: لە لای گۆڕەکەیدا مانگایەك یان شەکێکیان سەر دەبڕی .

**شێخی ئیسلام (ئیبنوتەیمیە) (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) دەفەرموێ***: سەربڕین لەوێدا (واتە: لەلای گۆڕدا) قەدەغەی لێکراوە بە گشتی، هاوەڵەکانمان ( واتە: حەنبەلێکان)

---

[280] (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (في تجصيص القبر والآجر يجعل له) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٥٦٧).

[281] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كراهية الذبح عند القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٢) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كراهية الذبح عند القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٦٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٣، ص ٢١٦، ح ٣٢٢٢) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٧٥٣٥) ، و (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ٥، ص ٥٦٤، ح ٢٤٣٦) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

و کەسانی تریش باسیان کردووە ، لە بەر ئەم فەرموودەیە کە ئیمام (ئەحمەد) لە گێڕانەوەی (مروزی) دا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا عقر في الإسلام ))، کاتێك کە مردوویەکیان بمردایە وشتریان لە سەر گۆڕەکەی سەر دەبڕی ، جا پێغەمبەری خوایش (ﷺ) قەدەغەی لەوە کرد.

وە (أبو عبدالله)* خواردنی گۆشتەکەیشی بە باش نەزانیوە (هاوەڵەکانمان ووتویانە) هەروەك ئەوە وایە کەوا خەڵکێکی زۆری ئەم کاتەی خۆمان لای گۆڕا نان و خواردن دەکەنە خێر.

هەروەها ئیمام (نەوەوی) دەفەرموێ: سەربڕین و (عەقر) کردن لە لای گۆڕدا (ذم) کراوە ، لە بەر فەرموودەکەی (ئەنەسی کوڕی مالیك). ئەمە ئەگەر سەربڕینەکە بۆ خوا بوو ، بەڵام لەوێدا سەری ببڕن ، جا ئەگەربۆ گۆڕەکە بیکات بە مەبەستی ئەوەی خۆی لێ نزیك بکاتەوە و کارێکی بۆ جێ بە جێ بکات یا سوودێکی پێ بگەیەنێت یا زیانێکی لە سەر لا بدات ئەوە شیرکی گەورەیە و خاوەنەکەی بەر نەفرەتی خوای پەروەردگار دەکەوێت ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی: (( لعن الله من ذبح لغير الله ، ))[282] واتە: نەفرینی خوا لەوکەسەی کە حەیوان سەردەبڕێ بۆ غەیری خوا.

هەروەها (خطابي) فەرموویەتی: نەفامەکانی سەردەمی نەزانی وشتریان لەسەر گۆڕی پیاوچاك و سەخی سەردەبڕی و دەیان وت:پاداشتی کردەوەکەی دەدەینەوە ، چونکە

---

* (إقتضاء صراط المستقيم لشيخ الإسلام ابن تيمية/ ص ١٨٢).

* مەبەست پێی ئیمام (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) ە.

[282] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الأضاحي)، بابی: (تحريم الذبح لغير الله تعالى ولعن فاعله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٠٩٧)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الضحايا)، بابی: (من ذبح لغير الله عزوجل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤٣٤).

خۆی لە ژیاندا بۆ خەڵکی سەر دەبڕی و دەرخواردی میوانەکانی دەدا ، وە ئێمەش لەسەر گۆڕەکەی سەری دەبڕین بۆ ئەوەی دڕندە و باڵندە بیخۆن و خۆراك دەربێ دوای مردنیشی ، وەك چۆن لە ژیانیدا خواردنی دەدا .

جا هەندێکیان باوەڕیان وەهابوو ئەگەر وڵاخەکەی لەسەر گۆڕەکەی سەر ببڕێ ڕۆژی دوایی بە سواری دەچێ بۆ مەیدانی مەحشەر ، وە هەرکەس وڵاخەکەی سەر نەبڕڕا لەلای ، ئەوە بە پێ دەچێ بۆ ساحەی مەحشەر ، ئەمە لەلای ئەوکەسانەی کە باوەڕیان وابوو دوای مردن زیندوو بوونەوە هەیە .

**نۆیەم: نوێژکردن ڕوو بەرەو گۆڕ:**

لـە (ئـەبو مورثیـد) * ی غەنەوییـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (( لا تصلوا إلى القبـور ، ولا تجلسوا عليها ))[283] واتە : بەرەو گۆڕ نوێژ مەکەن و ، وە لەسەریشیان دامەنیشن .

**دەیەم: نوێژکردن لەلای گۆڕدا:**

١- لـە (عبـدالله) ی کـوڕی (عومـەر) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( اجعلـوا في بيـوتكم مـن صلاتكم، ولا تتخذوها قبورا ))[284]

---

* ناوی (کناز) ی کوڕی (حوصەین) ە.

[283] **صحیح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (النهي عن الجلوس على القبر والصلاة عليـه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٤٨) ، (ئەبوداود) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (في كراهيـة القعود على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٩) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (ما جاء في كراهية المشي على القبور والجلوس عليها والصلاة إليها) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٠٥٠) ، هـەروەها (نەسـائی) لـە (الـسنن الـصغرى) دا لـە کتـابی (القبلـة) ، بـابی : (النهـي عـن الـصلاة إلى القـبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٥٩) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا لە ژێر ناونیـشانی: (مـسند الشاميين : حديث ابي مرثد الغنوي) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٨٧٨).

واته : هەندێ لە نوێژەکانتان لە ماڵەوە بکەن ، وە ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان .

٢- لە (ئـەبو سـەعید) ی خودرییـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( الأرض كلها مسجد إلا الحمام والمقبرة ))[285] واتـە : سـەر زەوی هـەمووی مزگەوتـە جگـە لـە گۆڕسـتان و شـوێنی خۆشۆردن (حەمام).

شێخ (سید سابق) لە (فقه السنة) دا دەفەرموێ: قەدەغەکردنی گۆڕستان بـە مزگـەوت و نوێژکردن لەسەریان لەبەر ئەوەیە ئەوەکو زیادەڕەوی بکرێ لـە بـە گـەورەدانانی مردو و پەیدابوونی حەرام ، کەواتە ئەمـە لەبـەر بەربەست کردنـی ڕێگایـە بـەرەو حەرام .

**یانزەیەم: دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ:**

١- لـە دایکـە (عائیـشە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( قال رسول الله (ﷺ) في مرضه الذي لم يقم منه: لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا

---

[284] صحیح - (بوخاری) لـە کتـابی (الصلاة) ، بـابی : (کراهیـة الصلاة في المقابر) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (٤٣٢) ، هـەروەها (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الصلاة) ، بـابی : (صلاة الرجل التطوع في بيتـه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤٣).

[285] صحیح - (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الـصلاة) ، بـابی : (في المواضـع الـتي لا تجـوز فيهـا الـصلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٩٢) ، هەروەها (ترمذی) لـە کتـابی (الصلاة) ، بـابی : (مـا جـاء أن الأرض كلها مسجد إلا المقبرة والحمام) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣١٧) ، هـەروەها (ابـن ماجـه) لـە کتـابی (المساجد والجماعات) ، بـابی : (المواضع الـتي تكره فيهـا الـصلاة) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٧٤٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ١ ، ص ١٣٢ ، ح ٤٩٢) ، و (جامع الترمذي/ ج ٢ ، ص ١٣١ ، ح ٣١٧) ، و (سـنن ابـن ماجـه/ ج ١ ، ص ٢٤٦ ، ح ٧٤٥) ، و (مـشكاة المصابيح/ ج ١ ، ح ٧٣٧) دا فەرموویەتی : (صحیح) ە.

قبور أنبيائهم مساجد ))[٢٨٦] واته : نەفرینی خوا له میللەتی جوولەکه و نەصارا بێ، که چۆن گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووه بـه پەرستگا و ، وەك مزگـەوت عیبـادەتی تیادا دەکەن .

٢- لــه (جونــدوب) ی کــوڕی (عبــدالله) ی بەجەلییــەوه (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنەوه کەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( ... ، ألا وإن من كـان قبلكم كـانوا يتخذون قبـور أنبيـائهم وصـالحيهم مـساجد ، ألا فـلا تتخذوا القبور مساجد ، إني أنهاكم عن ذلك ))[٢٨٧]

واته : نەتەوەکانی پێش ئێوه گۆڕی پێغەمبـەرەکانیان دەکـرده مزگـەوت و شـوێنی نوێژ، ئێوه نەچن گۆڕەکان بکەنه مزگـەوت و شـوێنی نوێـژ ، چونکه بەڕاسـتی مـن ئەوەتان لێ قەدەغه دەکەم .

٣- له دایکه (عائیشه) وه (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوه کەوا فەرموویـەتی: (( أن أم سلمة ، ذكرت لرسول الله (ﷺ) كنيسة رأتها بأرض الحبشة يقال لها مارية ، فذكرت له ما رأت فيها مـن الـصور ، فقـال رسـول الله (ﷺ): أولئـك قـوم إذا مـات فـيهم العبـد الصالح ، أو الرجل الصالح ، بنوا على قبره مسجدا ، وصوروا فيـه تلك الـصور ، أولئـك شرار الخلق عند الله ))[٢٨٨] واته: (ئوم سەلەمه) باسـی کەنیـسەیەکی بـۆ پێغەمبـەری

---

[٢٨٦] **صحيح** - (بوخاری) لـه کتـابی (الجنـائز)، بـابی: (مـا يكـره مـن اتخـاذ المـساجد على القبـور) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٣٣٠)، هەروەها له هەمان کتابدا، بابی: (ما جاء في قبر النبي (ﷺ) وأبـي بكر وعمر رضي الله عنهما) گێڕاویەتەوه به ژماره (١٣٩٠)، هەروەها (موسلیم) له کتـابی (المـساجد ومواضع الصلاة)، بابی: (النهي عن بناء المساجد على القبور) گێڕاویەتەوه به ژماره (١١٨٤).

[٢٨٧] **صحيح** - (موسـلیم) لـه کتـابی (المـساجد ومواضـع الـصلاة) ، بـابی : (النهـي عـن بنـاء المـساجد) گێڕاویەتەوه به ژماره (١١٨٨).

[٢٨٨] **صحيح** - (بوخاری) له کتابی (مناقب الأنصار) ، بابی : (هجرة الحبشة) گێڕاویەتەوه به ژمـاره (٣٨٧٣) ، هەروەها (موسلیم) له کتابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بابی : (النهي عن بنـاء المـساجد)

خوا (ﷺ) دەگێڕایەوە کە بینیبووی لە (حەبەشە) پێیان دەوت (ماریە) ، جا باسی دەکرد چۆن وێنەی زۆریان تێدا کێشابوو ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەوانە نەتەوەیەکن ئەگەر بەندەیەکی چاکی خوا یا پیاوچاکێك لە ناویاندا بێت و بمرێت، لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتێك دروست دەکەن و ئەو وێنانەی لەسەر دەکێشن ، ئەوانە خراپترین خەڵکن لای خوا .

دایکە (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێ: (( ولولا ذلك لأبرزوا قبره (ﷺ) غير أني أخشى أن يتخذ مسجدا ))* واتە : دەی ئەگەر لەبەر ئەم مەترسییە نەبوایە گۆڕەکەی پێغەمبەریان (ﷺ) دەردەخست خانوویان بەسەرەوە نەدەکرد ، گەرچی من هەر مەترسی ئەوەم هەیە کە گۆڕەکەی بکرێت بە مزگەوت .

هەروەها تایبەت کردنی گۆڕ بەوەی نوێژی لەسەر بکرێت ، هەروەك خۆ نزیك کردنەوە و ڕێز لێنانی بتەکان وەهایە ، وە لە پێشا گێڕامانەوە کە سەرەتای بت پەرستی لە ڕێز لێنانی مردووەوە و دەست پێداهێنانیان و نوێژکردن لەسەریان پەیدا بووە .

**دوانزەیەم: داگیرساندنی گڵۆپ و چرا لەسەری:**

لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( لعن رسول الله (ﷺ) زائرات القبور ، والمتخذين عليها المساجد ، والسرج ))[289]

---

گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٨١) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی : (من كره زيارة القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٦١١).

* **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يكره من اتخاذ المساجد على القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٣٠) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (المساجد ومواضع الصلاة) ، بابی : (النهي عن بناء المساجد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٢٩).

[289] **حسن** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في زيارة النساء القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٣٦) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الصلاة) ، بابی : (ما جاء في كراهية أن يتخذ على القبر

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی کرد لەو ئافرەتانەی کەوا سەردانی گۆڕستان دەکەن ، وە هەروەها لەو کەسانەیش کەوا مزگەوتی لە سەر دروست دەکەن ، وە لەوانەیش کەوا چرای لە سەر دادەگیرسێنن.

وە پێویستە مرۆڤی موسوڵمان لەوە خۆی بە دوور بگرێ کە گۆڕ بە گەورە و مەزن تەماشا بکات ، هەروەها خۆی بە دوور بگرێ لە دەست لێدان و خۆپیاهەڵسوانی گۆڕ بۆ تەبەروك ، چونکە ڕەفتاری ئا لەو جۆرە لە هۆکارەکانی هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوا.

## چەند بابەتێکی تایبەت

### ١) حوکمی ئەوکەسەی کە لەناو کەشتی دەریادا دەمرێ

**ئیمام (شافیعی) فەرموویەتی:** دەخرێتە نێوان دوو لەوح و دەبەسترێ بۆ ئەوەی ئاو بیبات بۆ کەناری دەریا ، چونکە لەوانەیە دەست کۆمەڵێك بکەوێت و بینێژن ، وە ئەگەر بشیخەنە ناو ئاوەکەوە تاوانبار نابن ، بەڵام ئەو شێوەی یەکەم باشترە ، چونکە ئەو شاردنەوەی کە مەبەستە بەدەست دێت ، بەڵام بەستنەوەی لە نێوان دوو لەوح و تەختە لەوانەیە تێك بچێت و تووشی ئەتك بێت ، وە لەوانەیە لەسەر کەناری دەریاکە بە ڕوتی و ئەتك کراوی بمێنێتەوە ، وە لەوانەیە بکەوێتە دەستی کۆمەڵێك هاوبەشدانەر ، جا لەبەر ئەوە ئەوەی کە باسمان کرد باشترە .

**لە (المغني) دا هاتووە:** ئیمام (ئەحمەد) لەبارەی ئەوکەسەی کە لەناو کەشتی دەریادا دەمرێ فەرموویەتی: چاوەڕوانی دەکرێت بە هیوای ئەوەی شوێنێك بدۆزنەوە تێیدا بنێژن ، بەو شێوە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دەیهێڵنەوە ، ئەگەر ترسی تێکچوونی نەبوو ، جا ئەگەر جێگەیان نەدۆزیەوە دەشۆرێ و کفن دەکرێ و نوێژی لەسەر

---

مسجدا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠) ، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الصغری) دا لە کتابی (الجنائز) دا لە ژێر ناونیشانی : (التغلیظ في اتخاذ السرج علی القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٤٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (مشکاة المصابیح / ج ١ - ح ٧٤٠) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

دەکرێ و شتێکی قورس و گرانی پێوە دەبەسترێ و دەخرێنە ناو ئاوەکەوە ، ئەوەش قسەی (عەطا) و (حەسەنی بەصری) یە .

**(حەسەنی بەصری) فەرموویەتی:** لە سەبەتەیەکدا دا دەنرێت و دەخرێتە ناو دەریاوە.

## ٢ ) گەڵاو پەلکەدار خستنە سەر گۆڕ

لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( مر رسول الله (ﷺ) على قبرين فقال: أما إنهما ليعذبان وما يعذبان في كبير، أما أحدهما فكان يمشي بالنميمة ، وأما الآخر فكان لا يستتر من بوله ، قال فدعا بعسيب رطب فشقه باثنين ، ثم غرس على هذا واحدا وعلى هذا واحدا ثم قال: لعله أن يخفف عنهما ما لم ييبسا ))[٢٩٠]

واتە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی و فەرمووی: ئەم دوانە ئێستا سزا دەدرێن و لەسەر تاوانی گەورەش سزا نادرێن ، ئەمەیان قسەی دەهێنا و دەبرد لە نێوان خەڵکیدا ، وە ئەوەیان خۆی نەدەپاراست لە میز و خۆی خاوێن نەدەکردەوە ، جا لەپاشان داوای لقە هێشوویەکی خورمای تەڕی کرد ،

---

[٢٩٠] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الوضوء)، بابی: (ما جاء في غسل البول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨)، هەروەها لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الجريدة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٦١)، (موسلیم) لە کتابی (الطهارة)، بابی: (الدليل على نجاسة البول ووجوب الاستبراء منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٥)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الطهارة)، بابی: (الإستبراء من البول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الطهارة)، بابی: (ما جاء في التشديد في البول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٠)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الطهارة)، بابی: (التنزة عن البول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١)، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الطهارة وسننها)، بابی: (التشديد في البول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٤٧).

لقەکەی کرد بە دوو بەشەوە و هەر بەشێکی لەسەر گۆڕێك چاند و فەرمووی: بە ئومێدی ئەوەی خوا سزایان لەسەر سووك بکات ، هەتا ئەم شوولانە وشك دەبن .

**(خطابي) لەبارەی ئەم حەدیسەوە فەرموویەتی:** چاندنی نیوە شولکەکە و ئەوەی کە فەرموویەتی: (( بە ئومێدی ئەوەی خوا سزایان لەسەر سووك بکات هەتا وشك دەبن )) ئەوە لە ڕووی تەبەڕڕوك بە شوێنەواری پێغەمبەرەوە بووە (ﷺ)، وە هەروەها بە پاڕانەوەکەی کە لەسەریان سووك بێت ، وەك ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ماوەی تەڕێتی داناوە بۆ سنووری پاڕانەوەکەی کە لە ماوەی ئەوەندەدا خوای گەورە سزایان لەسەر سووك بکات .

نەك لەبەر ئەوەی لە پەلکی داری تەڕدا شتێك هەبێ کەلە پەلکی داری وشکدا نەبێت ، وە زۆربەی خەڵك لە زۆربەی وڵاتەکاندا دەچن گەڵا و پەلکەداری تەڕ ڕادەخەن لەناو گۆڕی مردووەکانیان ، من وا تێدەگەم کە بۆ ئەوە چووبن کە سزا لەسەر مردوو لابەرن ، بەڵام بە هیچ شێوەیەك وەها نیە و هیچ پەیوەندییەکی نیە بەسەر کارەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

وە ئەم کارە لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەگێڕدراوەتەوە کە شتی وایان کردبێ جگە لە (بورەیدەی ئەسلەمی) نەبێ کە (بوخاری) بۆمان دەگێڕێتەوە: (( وأوصى بريدة الأسلمي: أن يجعل في قبره جريدان))* واتە : بورەیدەی ئەسلەمی وەسێتی کرد کەوا کاتێ مرد دوو لق دار بخەنە ناو گۆڕەکەیەوە .

**(ابن حجر) ی عەسقەلانی لە (فتح) دا فەرموویەتی:** لەوە دەچی (بورەیدە) فەرموودەکەی لەسەر گشتێتی دانابێت ، وە ئەوەی بە تایبەت نەزانی بێت بەو دوانەوە .

---

* (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الجريد على القبر) گێڕاویەتەوە.

(ئیبنوڕوشد) فەرموویەتی: وا دەردەکەوێ لە تەصەڕوفی بوخارییەوە کە ئەوە تەنها تایبەت بووە بەو دوو کەسەوە ، لەبەر ئەوە بەدوای دا قسەکەی (ئیبنوعومەر) دەهێنێ: (( ورأى ابن عمر رضي الله عنهما ، فسطاطا على قبر عبد الرحمن ، فقال: انزعه يا غلام ، فإنما يظله عمله ))* واتە : جارێکیان (ئیبنوعومەر) بەلای گۆڕی (عبدالرحمن) دا تێپەڕی بینی فەرشێك لەسەر گۆڕەکەی ڕاخرابووو ، جا فەرمووی: کوڕە لێی بکەرەوە ، چونکە هەر کردەوەکانی دەبنە سێبەری.

۲ ) پەسەندێتی ناشتنی مردوو لە گۆڕستاندا

(ئیبنوقودامە) فەرموویەتی* : لەلای ئیمام (ئەحمەد) مردوو ناشتن لە گۆڕستاندا باشتر بووە لەوەی کەلە ماڵدا بنێژرێ ، چونکە زیانی کەمترە بۆ میراتگرە زیندووەکانی پاش خۆی ، وە گۆڕی گۆڕستان زیاتر لە خانەی ڕۆژی دوایی دەچێت ، وە زیاتر پاڕانەوەی بۆ دەچێت ، وە بەردەوام هاوەڵان و تابیعیەکان و کەسانی پاش ئەوانیش لە بیاباندا نێژروان .

هەروەها لەبەر ئەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵەکانی خۆی لە گۆڕستانی (بەقیع) دەناشت ، جا کردەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە پێشترە لە کەسانی تر ، وە هاوەڵەکانی ڕایان وابوو کە ناشتنی پێغەمبەر (ﷺ) لە ژوورەکەی دایکە (عائیشە) دا تایبەت بووە بە پێغەمبەر (ﷺ)* ، چونکە لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( لما قبض رسول الله (ﷺ) اختلفوا في دفنه ، فقال

---

* (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الجريد على القبر) گێڕاویەتەوە.

* (المغني لإبن قدامة/ ج ۲، ص ٥٦۳).

* (أحكام الجنائز/ ص ۱۷۳).

أبو بكر: سمعت من رسول الله (ﷺ) شيئا ما نسيته ، قال: ما قبض الله نبيا إلا في الموضع الذي يحب أن يدفن فيه ، ادفنوه في موضع فراشه ))[291]

واتە : كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) كۆچی دوایی كرد ، لەسەر جێگەی ناشتنەكەی قسەیان یەكی نەگرت ، تا (ئەبوبەكر) فەرمووی: لەم بارەیەوە شتێكم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستووە هەر لە یادم ماوە ، فەرمووی: خوای گەورە گیانی هیچ پێغەمبەرێ ناكێشێ ، مەگەر لەو شوێنەدا كە خۆی حەزی لێ بێ كە لەوێ بنێژرێ ، كەوابوو لە شوێنی نوێنەكەی خۆیدا بینێژن .

جارێكیان پرسیار كرا لە ئیمام (ئەحمەد) دەربارەی ئەو پیاوەی كە وەسیەت دەكا لە ماڵەكەی خۆیدا بینێژن ؟ فەرمووی: لە گۆڕستانی موسوڵمانانندا دەنێژرێ .

### ٤ ) قورئان خوێندن لەسەر گۆڕی مردوو

زانایان جیاوازییان هەیە لە حوكمی قورئان خوێندن لەسەر گۆڕی مردووان ، ئیمام (شافیعی) و (موحەممەدی كوڕی حەسەن) بە پەسەندیان داناوە بۆ ئەوەی ئەو مردووە لە پیرۆزییەتەكەی خێری دەست بكەوێ ، وە قازی (عیاض) و (قەڕافی) لە (مالیكیەكان) لەسەر ئەوەن ، وە ئیمام (ئەحمەد) یش ڕای وایە كە خراپ نیە .

بەڵام ئیمام (ئەبوحەنیفە) و (مالیك) بە كەراهەتیان داناوە ، چونكە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هیچ گێڕانەوەیە نەهاتووە تا ئەوە بسەلمێنێ .

---

[291] **صحيح** - (ترمذی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في دفن النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠١٨) ، هەروەها لە كتێبی (الشمائل المحمدية) دا ، بابی : (ما جاء في وفاة رسول الله صلى الله عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٣، ص ٣٣٨، ح ١٠١٨) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٦٤٩) ، و (مختصر الشمائل/ ح ٣٢٦) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٥٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

### ٥ ) هەڵدانەوەی گۆڕ و گواستنەوەی مردوو لە گۆڕێکەوە بۆ گۆڕێکی تر

١- لـە (جـابیر) ی کـوڕی (عبـدالله) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( دفن مع أبي رجل ، فلم تطب نفسي حتى أخرجته ، فجعلته في قبر على حدة ))[٢٩٢]

واتە : باوکم لە غەزای (ئوحود) دا شەهید بوو ، پیاوێکی تر لەگەڵ باوکما لەیەك گۆڕدا نێـژرابوون ، جـا دڵـم بـەرایی نـەدا تـا لاشـەکەیم دەرهێنـاو لـە گـۆڕێکی سەربەخۆدا ناشتمەوە .

لە گێڕانەوەی (ئەبوداود) دا ئەمەشی پێ‌وە: (( دفن مع أبي رجل ، فكان في نفسي من ذلك حاجة ، فأخرجته بعد ستة أشهر ، فما أنكرت منه شيئا ، إلا شعيرات كن في لحيته مما يلي الأرض ))[٢٩٣]

واتـە : لـەپاش شـەش مـانگ کاتێ کـە لاشـەکەیم دەرهێنـا هـیچ تێـك نەچووبوو ، هەروەك خۆی مابوو ، تەنیا چەند موویەکی ڕیشی نەبێ کە لە دیـوی زەوییەکـەوە بوون .

٢- لـە (ئەنـەس) ی کـوڕی (مالیـك) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: (( قدم النبي (ﷺ) المدينة ، وأمر ببناء المسجد ، فقال: يا بني النجار

---

[٢٩٢] صحيح - (بوخـاری) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (هـل يخـرج الميـت مـن القـبر واللحـد لعلـة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٥٢) ، (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (إخراج الميت مـن القـبر بعد ان يدفن فيه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٢١).

[٢٩٣] صحيح – (ئەبوداود) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (في تحويـل الميـت مـن موضعه للأمـر يحـدث) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣٢٣٢) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـە (سـنن أبـی داود/ ج ٢، ص ٢١٨، ح ٣٢٣٢) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

ثامنوني ، فقالوا: لا نطلب ثمنه ، إلا إلى الله ، فأمر بقبور المشركين ، فنبشت ثم بالخرب ، فسويت وبالنخل فقطع ، فصفوا النخل قبلة المسجد ))[٢٩٤]

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) كە تەشریفی هات بۆ مەدینە و فەرمانی پێكرا بە دروست كردنی مزگەوتەكە، فەرمووی: ئەی (بەنی نەجار) ! ئەم باخەی خۆتانم پێ بفرۆشن و نرخەكەیم پێ بڵێن: وتیان: نە بەخوا بە فرۆشتن نایدەین ، بەڵام بە خۆڕایی پێشكەشی دەكەین بە خوا و بەهاكەیمان هەر لەخوا دەوێ ! جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانیدا گۆڕی هاوبەش پەیداكەرەكانیان هەڵتەكاندو چاڵایی شوێن گۆڕەكانیان پڕ كردەوە و ، دارخورماكانیان بڕی و ، لەلای قیبلەی مزگەوتەكەوە ریزیان كردن .

٣- لە دایكە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( كسر عظم الميت ككسره حيا ))[٢٩٥]

واتە : شكاندنی ئێسكی مردوو وەك ئەوە وایە كە لە حاڵی ژیانیا بیشكێنی .

---

[٢٩٤] صحيح – (بوخاری) لە كتابی (فضائل المدينة) ، بابی (حرم المدينة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٦٨).

[٢٩٥] صحيح – (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في الحفار يجد العظم هل يتنكب ذلك المكان؟) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٧) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في النهي عن كسر عظام الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦١٦) ، هەروەها (ابن حبان) لە كتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی: (فصل في القبور - ذكر الإخبار عما يستحب للمرء من تحفظ أذى الموتى ولا سيما) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٢٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبی داود/ ج ٢، ص ٢١٢، ح ٣٢٠٧) ، و (سنن ابن ماجه/ ج ١، ص ٥١٦، ح ١٦١٦) ، و (إرواء الغليل/ ج ٣، ح ٧٦٣) ، و (صحيح الجامع الصغير/ح ٢١٤٣)، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٣، ح ٣٥٦٧) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە*:**

**زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەو شوێنەی موسوڵمانێکی تێدا نێژرا دەبێ بە شوێنی خۆی مادام گۆشت و ئێسقانی بمێنێ ، جا ئەگەر شتێکی کەمیشی بمێنێتەوە و بە تەواوی لەناو نەچێ ئەوە حەرامێتی ئەو شوێنە بۆ کەسێکی تر هەر بەردەوام دەبێت ، بەڵام لەناوچوو و ، وە بۆوە بە گڵ ئەوە دروستە لەو شوێنەدا مردوویەکی تر بنێژرێ ، یا سوود لە زەوییەکەی وەربگیرێ بۆ چاندن و خانوو لەسەر کردن و شتی تر ، جا ئەگەر گۆڕێک هەڵدرایەوە و پارچە ئیسکێکی تێدا مابوو نابێ هەڵکەندنەکەی تەواو بکرێ ، جا ئەگەر لە هەڵکەندنەکەی بوو بۆوە لە پاشاندا چەند پارچە ئێسقانێکی دییەوە دەبێ کۆی بکاتەوە لەلایەکی گۆڕەکەوە دای بنێت ، ئنجا دروستە مردوویەکی تری تێدا بنێژرێ ، وە ئەگەر کەسێك پێش ئەوەی نوێژی لەسەر بکرێ لە گۆڕ خرا ، ئەگەر گڵی بەسەردا نەکرابوو دەردەهێنرێتەوە نوێژی لەسەر دەکرێ ، بەڵام ئەگەر گڵی بەسەردا کرابوو بەلای (حەنەفیەکان) و (شافیعیەکان) و گێڕانەوەیەك لە ئیمام (ئەحمەد) ە وە: حەرامە گۆڕەکەی هەڵکەندرێتەوە ، وە هەر بەو شێوەیە نوێژی لەسەر دەکرێ ، بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تر لە ئیمام (ئەحمەد) ە وە: گۆڕەکەی هەڵدەکەنن و لە دەرەوە نوێژی لەسەر دەکرێ .**

**هەر سێ پێشەوای ئیسلام (واتە: ئیمام مالیك و شافیعی و ئەحمەد) بە دروستی دادەنێن کە گۆڕ هەڵبدرێتەوە لەبەر مەبەستێکی صەحیح ، وەك ئەوەی شتێك لە گۆڕەکەدا بەجێ مابێ هەڵبدرێتەوە بۆ دەرهێنانی ، یان ئەگەر مردووەکە ڕووی نەکرابووە قیبلە هەڵدەکەندرێتەوە و ڕووی دەکرێتە قیبلە ، یا شۆردنی ئەوەی نەشۆرابێت ،**

* (فقه السنة لسيد سابق / ج ١، ص ٢٩٤ - ٢٩٥).

یا بۆ چاك كردنی كفنەكەی ، مەگەر ترسی لێك هەڵوەشانی هەبێت ، ئەوە وازی لێ دەهێنرێ .

**وە لای (مالیكیەكان):** دروستە مردوو لە گۆڕێكەوە بگوێزرێتەوە بۆ گۆڕێكی تر پێش ناشتن و دوای ناشتنی ، وەك ئەوەی ترسی هەبێت ئەو گۆڕە ئاو دای بپۆشێ ، یا دڕندە مردووەكە بخوات ، یا بۆ ئەوەی نزیكی بكاتەوە و كەسوكاری بتوانن سەردانی بكەن ، یا بۆ ئەوەی ببرێتە گۆڕستانی كەسوكاریەوە ، یا بە هیوای پیرۆزی ئەو شوێنەی كە بۆی دەگوێزرێتەوە ، جا ئەگەر بەو شێوەیە بوو ئەوە گواستنەوەی دروستە بە مەرجێ نەبێتە هۆی ئەوەی زیان بە لاشەكەیان بگات و ئەتكیان پێ بكرێت ، وەك ئەوەی بتەقێت ، یا تێك بچێت ، یا ئێسقانەكانی بشكێت .

**بەلام (حەنەفیەكان)** پێچەوانەی ئەمانن لە هەڵدانەوەی گۆڕدا بۆ ئەو شتانە و ، بە ئەتك كردنی دادەنێن ، وە ئەتك كردنیش لە ئیسلامدا قەدەغەیە .

**(ئیبنوقودامە) فەرموویەتی:** ئەتك كردن تەنها بۆ كەسێكە كە تێكچووبێت ئەوەش هەڵنادرێتەوە .

**وە فەرموویەتی:** ئەگەر بەبێ كفن نێژرابوو دوو لایەنی هەیە: یەكەمیان: وازی لێ دەهێنرێ ، چونكە مەبەست لە كفن كردن داپۆشرانیەتی ، ئەو مەبەستەش بە خۆڵەكە بەجێ هاتووە ، دووەمیان: هەڵدەدرێتەوە ، چونكە كفن كردنی مردوو پێویستە ، وەك شۆردن وایە .

**ئیمام (ئەحمەد) فەرموویەتی:** ئەگەر گۆڕ هەڵكەن خاكەنازەكەی لە گۆڕەكەدا بەجێ مابوو دروستە هەڵیبداتەوە بۆی ، وە دەربارەی شت كەوتنە ناو گۆڕ وەك: پاچ و پارە ، فەرموویەتی: هەڵدەدرێتەوە بۆ ئەو شتانە ئەگەر نرخیان هەبوو . وتیان: ئەی ئەگەر خاوەن مردووەكە حەقی ئەو شتانەی دا بەوكەسە؟ فەرمووی: جا ئیتر كابرا چی تری دەوێت !؟

### ٦) هەڵدانەوەی گۆڕ بۆ مەبەستێکی دیاریکراو

لـە (عبـدالله) ی کـوڕی (عـەمر) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنــەوە کـەوا فەرموویـەتی: جارێکیـان لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) دەرچووین بـەرەو (تائیف) ، جا تێپەڕین بەلای گۆڕێکدا و ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( هذا قبر أبي رغال ، وكان بهذا الحرم يدفع عنه ، فلما خرج أصابته النقمة التي أصابت قومه بهذا المكان ، فدفن فيه ، وآية ذلك أنه دفن معه غصن من ذهب ، إن أنتم نبشتم عنه أصبتموه معه ، فابتدره الناس فاستخرجوا الغصن ))[٢٩٦]

واتە: ئەوە گۆڕی (ئەبو ڕوغالە) ، کە لەم حەرەمەدا دەپارێزرا ، کاتێ لێی دەرچوو تووشی ئەو بەلایە بوو کە خەڵکی ئەم شوێنە تووشی بوون لـەم شـوێنەدا ، وە هـەر لێرەش نێژراوە ، نیشانەکەشی ئەوەیـە کـە پارچـەیەك ئـاڵتوون لەگـەڵیا نێـژراوە ئەگـەر هـەڵی بدەنـەوە دەی دۆزنـەوە ، دەڵێ: خێـرا خەڵکەکـە دەسـتیان کـرد بـە هەڵدانەوەی و پارچەکەیان دەرهێنا.

**(خطابي) فەرموویەتی:** ئەو فەرموودەیە دەبێتە بەڵگەی ئـەوەی کـە دروسـتە گـۆڕی بێ بڕوایان هەڵبدرێتەوە ئەگەر شتێکی تێدا بێ موسوڵمانان سوودی لێ وەربگـرن ، چونکە حورمەتیان وەك حورمەتی موسوڵمانان نیە .

---

[٢٩٦] حسن بشواهده - (ئەبوداود) لە کتابی (الخراج والإمارة والفيء)، بـابی: (نـبش القبور العادية يكون فيها المال) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٨٨)، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يوجد منه مدفونا في قبور أهل الجاهلية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٢٠٠)، هـەروەها (تەبـەڕانی) لـە (معجم الأوسط)، بابی: (الألف - من اسمه إبراهيم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٤٤).

**٧ ) گواستنەوەی مردوو لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر**

**لای (حەنەفیەکان)** کەراهەتی هەیە مردوو لە شارێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ شارێکی تر و ، پەسەندە هەر کەسە لە کوێدا مرد لە گۆڕستانی ئەو شارە بنێژرێ، وە خراپ نیە پێش ناشتنی ماوەی میلێك یا دوو میل بگوێزرێتەوە ، چونکە جاری وایە ماوەی نێوان شارو گۆڕستان ئەوەندە دەبێت ، وە حەرامە گواستنەوەی دوای ناشتن لەبەر هۆیەك نەبێت .

**بەلاّم لای ئیمام (شافیعی)** حەرامە مردوو لە شارێکەوە ببرێ بۆ شارێکی تر مەگەر ئەو شوێنە نزیك بێت لە مەککە و مەدینە و قودسەوە ، ئەو کاتە دروستە ببرێ بۆ یەکێ لەم سێ شوێنە لەبەر پیرۆزییان .

بەلاّم ئەگەر ئەوکەسە وەسیەتی کردبوو کە ببرێ بۆ شوێنێکی تر جگە لەو سێ شوێنە ، ئەوە نابێ ڕاسپاردەکەی بەجێ بێت ، چونکە دەبێتە هۆی دواکەوتنی ناشتنی و تێکچوونی لاشەکەی .

**وە ئیمام (ئەحمەد) دەربارەی گوستنەوەی مردوو لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر فەرموویەتی:** هیچ بە خراپی نازانم .

# بەشی پێنجەم
## دڵدانەوەوەی کەس و کاری مردوو ( تەعزیە )

### یەکەم: ئارام گرتن و خۆڕاگری لەکاتی مردنی کەسە نزیك و خۆشەویستەکانتدا

١- لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( مر النبي (ﷺ) بامرأة تبكي عند قبر ، فقال: اتقي الله واصبري. قالت: إليك عني ، فإنك لم تصب بمصيبتي ، ولم تعرفه ، فقيل لها: إنه النبي (ﷺ)، فأتت باب النبي (ﷺ)، فلم تجد عنده بوابين ، فقالت: لم أعرفك ، فقال: إنما الصبر عند الصدمة الأولى ))[٢٩٧]

واتە: ڕۆژێکیان ئافرەتێ لەسەر گۆڕی مناڵێکی خۆی دەگریا، جا پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەوە ڕەت بوو پێی فەرموو: لە خوا بترسە و دان بە خۆتا بگرە و ئارام بگرە لەبەر باری خوادا ، ژنەکەیش نەیناسی کە ئەوە پێغەمبەرە (ﷺ)، وتی: بەولاوە ! تۆ ئاگات لە دەردی من نیە ، لە پاشا پێیان وت: کە ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) بوو ،

---

[٢٩٧] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (قول الرجل للمرأة عند القبر: اصبري) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥٢)، هەروەها لە هەمان کتابدا، بابی: (زيارة القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٨٣)، هەروەها لە هەمان کتابدا، بابی: (الصبر عند الصدمة الأولى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٢)، هەروەها لە کتابی (الأحکام)، بابی: (ما ذكر أن النبي لم يكن له بواب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٥٤)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في الصبر على المصيبة عند الصدمة الأولى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٦)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصبر عند الصدمة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٢٤)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء أن الصبر في الصدمة الأولى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٨٨)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإحتساب والصبر عند نزول المصيبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٦٨).

ژنەکەش چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوانی دەرکەوانی لێ نیە ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێم مەگرە کە ئەو قسە زەق و ڕەقەم لە ڕووی تۆدا کرد ، چونکە نەم ناسیت ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی ئەو صەبرو ئارام و خۆڕاگرتنەی کە خوا پێی خۆشە دەشێ لەسەرەتای خورپە لێ کەوتنەوە بێ !

٢- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ما یصیب المؤمن من شوکة فما فوقها إلا رفعه الله بها درجة ، أو حط عنه بها خطیئة ))[٢٩٨]

واتە : هەرچی تووشی ئیماندار دەبێ لە دڕکێکەوە بیگرە تا زیاتر ، بێگومان کە خوا دەیکا بە مایەی پایەی بەرزیی بۆی و دەیکا بەهۆی هەڵوەرینی تاوان و گوناهەکانی .

## دووەم: پرسە و سەرەخۆشی کردن

پرسە و سەرەخۆشی کردن ئەوەیە کە بە چەند وشەیەك بە کەسوکاری مردوو هەندێ لە ئازارو ماتەمیان کەم بکرێتەوە و هەوڵبدرێ و وایان لێ بکرێ کە ئارام بگرن لەسەر ئەوەی کە تووشی بوون .

١- لە (محمد) ی کوڕی (عەمر) ی کوڕی (حەزم) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( ما من مؤمن یعزي أخاه بمصیبة ، إلا کساه الله سبحانه من حلل الکرامة یوم القیامة ))[٢٩٩]

---

[٢٩٨] **صحیح** – (موسلیم) لە کتابی (البر والصلة والآداب) ، بابی : (ثواب المؤمن فیما یصیبه من مرض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٧٣) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في ثواب المریض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٦٥).

[٢٩٩] **حسن لغیره** – (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في ثواب من عزی مصابا) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٠١)، هەروەها (بەیهەقی) لە (شعب الإیمان) دا ، لە ژێر ناونیشانی: (فضل في إدمان تلاوة القرآن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٣٠)، هەروەها (عبد بن حمید) لە

واتە: هەر باوەڕدارێ لە هۆی گرفتاری و موسیبەتێکەوە سەرخۆشی بکا لە برای ئیمانداری ، مسۆگەر کە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەستێ جل و بەرگی لە کاڵای ڕوو سووری و سەربەرزی لەبەر دەکا.

٢- لە (عبدالله) ی کوڕی (جەعفەر) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی: (( ليعز المسلمين في مصائبهم ، المصيبة بي ))[٣٠٠] واتە : کاتێ موسوڵمانان تووشی وەیەك ، دەردێ ، بەڵایەك ، دەبن با فەرامۆشی خۆیان بەو کۆست کەوتنە بدەنەوە کە بەهۆی مەرگی منەوە لێیان کەوتووە !

**ئەو قسەو زاراوەیەی کە بۆ پرسە و سەرەخۆشی بەکاردەهێنرێ:**

لە (ئوسامە) ی کوڕی (زەید) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أرسلت ابنة النبي (ﷺ) إليه إن ابنا لي قبض ، فأتنا، فأرسل يقرئ السلام ، ويقول: إن لله ما أخذ ، وله ما أعطى ، وكل عنده بأجل مسمى ، فلتصبر، ولتحتسب ، فأرسلت إليه تقسم عليه ليأتينها ، فقام ومعه سعد بن عبادة ، ومعاذ بن جبل ، وأبي بن كعب ، وزيد بن ثابت ورجال ، فرفع إلى رسول الله (ﷺ) الصبي ونفسه تتقعقع - قال: حسبته أنه قال كأنها شن - ففاضت عيناه ، فقال سعد: يا

---

موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی: (مسند عمرو بن حزم الأنصاري رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٨).

[٣٠٠] مرسل صحيح – (مالیك) لە کتێبی (موطأ) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (جامع الحسبة في المصيبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٥٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٤٥٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

رسول الله ، ما هذا ؟ فقال: هذه رحمة جعلها الله في قلوب عباده ، وإنما يرحم الله من عباده الرحماء ))[٢٠١]

واتە: کچێکی پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بە دوای پێغەمبەردا (ﷺ) کەوا منداڵێکی لە سەرەمەرگدایە ، تەشریفت بێنە بۆ لامان، (ئوسامە) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کەسێکی نارد بۆلای کە سەلامی لێ بکات و پێی بڵێت: ئەوەی کە براوەتەوە هی خوایە و، ئەوەش کە بەخشراوە هەر هی خوایە، هەموو شتێکیش لای خوا کاتێکی دیاری کراوی هەیە، دە با ئارام بگرێت و، چاوەڕوانی پاداشتی خوا بکات، دوای ئەوە ناردیەوە فەرمووی پێی ڕابگەیەنن کە سوێندی لەسەر خواردووی، کە دەبێت ئامادە ببیت ، جا پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و، وە (سەعدی کوڕی عوبادە) و (موعازی کوڕی جەبەل) و (ئوبەی کوڕی کەعب) و (زەیدی کوڕی ثابت) و هەندێ پیاوی تریش لە خزمەتیدا ڕۆیشتن ، جا کوڕەکەیان بەرزکردەوە بۆ باوەشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و، گیانی تێکچوو بوو هەناسە برکێ ی بوو، وردە وردە خەریك بوو دەمرد، لەو کاتەدا چاوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) پڕبوون لە فرمێسك، (سەعد) یش پێی وت: ئەمە چی یە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: بەڕاستی ئەمە بەزەییەکی خوایە دەیخاتە دڵی هەر کەسێك کە بیەوێت لە بەندەکانی، بەڕاستی خوا لەناو بەندەکانی خۆیدا تەنیا ڕەحم و بەزەیی بەوانەیان دەکا، کە بە بەزەیی و میهرەبانن.

---

[٢٠١] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (قول النبي (ﷺ): يعذب الميت ببعض بكاء أهله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٨٤)، هەروەها لە کتابی (المرض) ، بابی: (عيادة الصبيان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٥٥)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٢)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٢٥)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإحتساب والصبر عند نزول المصيبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٦٧)، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في البكاء على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٨٨).

**ئەگەر هاتوو بڵێ:** ( أعظم الله أجرك ) ، یاخود ( أحسن الله عزاك ) ، هیچ خراپیەکی تێدا نیە .

**وە زانایان فەرموویانە:** جا ئەگەر سەرەخۆشی لە موسوڵمانێك كرد بەهۆی مردنی موسوڵمانێك ، با پێی بڵێ: (أعظم الله أجرك ، وأحسن عزاءك ، و غفر لميتك) واتە: خوا پاداشتت بداتەوە و ئارامیت پێ ببەخشێت و لە مردووەکەتان خۆش بێت .

## سێیەم: نیشاندانی ماتەمینی

دروستە بۆ کەس و کاری مردوو کەوا تازیە باری نیشان بدات ، بەوەی کەوا: واز لە کڕین و فرۆشتن بێنێت ، یا بچێتە دەرەوەی ماڵ بۆ دڵنەوایی خۆی و سارێژبوونی ئەوەی کەلە دەستی داوە ، ئەم حاڵەتەش تەنها بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دروستە بەردەوام بێت ، ئەگینا دروست نیە .

مەگەر ئافرەتێ کە مێردەکەی مردبێ ، ئەوە دەتوانێ بۆ ماوەی چوار (٤) مانگ و (١٠) ڕۆژ تازیە بگرێت ، ئەمە لە کاتێکدا کە سکی پڕ نەبێ بەو پیاوە ، بەڵام ئەگەر هاتوو سکی پڕ بێت ئەوە تازیە بار دەبێت تا ئەوکاتەی منداڵەکەی دەبێت.

لە (ئوم عەطییە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لا تحد المرأة فوق ثلاث إلا على زوج ، فإنها تحد عليه أربعة أشهر وعشرا ، ولا تلبس ثوبا مصبوغا ، إلا ثوب عصب ، ولا تكتحل ، ولا تمس طيبا إلا أدنى طهرتها إذا طهرت من محيضها بنبذة من قسط ، أو أظفار ))[٣٠٢]

---

[٣٠٢] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الحيض) ، بابی : (الطيب للمرأة عند غسلها من الحيض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٢) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الطلاق) ، بابی : (وجوب الإحداد في عدة الوفاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧٢٠) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الطلاق) ، بابی : (فيما تجتنبه المعتدة في عدتها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٠٢) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە

واتە : نابێ هیچ ژنێك لە سێ ڕۆژ زیاتر بۆ مردوویەکی ماتەمینی بگرێت جگە لە مێرد کە دەبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ ماتەمینی بۆ بگرێت ، لەو ماوەیەدا نابێت پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر بکات جگە لە بوردی یەمانی ، وە نابێت چاوی برێژێت، و بۆن لە خۆی بدات و ، خەنە بگرێتە سەری و ، شانەی قژی بکات ، کاتی پاك بوونەوە لە بێ نوێژی نەبێت ، کە بۆی هەیە کەمێك بۆنی خۆش بەکاربهێنێ بۆ لابردنی بۆنی ناخۆش .

ئەمەش بۆیە لەسەر ژنی مێرد مردوو پێویست کراوە لە ماوەی عیددەکەیدا لەبەر وەفای بەرامبەر بە مێرد و چاودێری مێرد .

## چوارەم: خواردن دروست کردن بۆ کەسوکاری مردووەکە

سوننەتە خواردن ئامادە بکرێ و بنێردرێ بۆ کەس و کاری مردووەکە ، لەبەر ئەوەی نایان پەرژێتە سەر نان دروست کردن بۆ خۆیان.

لە (عبدالله) ی کوڕی (جەعفەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( لما جاء نعي جعفر ، قال النبي (ﷺ): اصنعوا لأهل جعفر طعاما ، فإنه قد جاءهم ما يشغلهم ))[٣٠٢]

---

کەیدا ، لە ژێرناونیشانی: (أول مسند البصريين - حديث أم عطية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٢٦٢) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الطلاق) ، بابی : (ما تجتنب الحادة من الثياب المصبغة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٥٣٦) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الطلاق) ، بابی : (هل تحد المرأة على غير زوجها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٨٧).

[٣٠٢] حسن - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (صنعة الطعام لأهل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٣٢) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الطعام يصنع لأهل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٩٨) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الطعام يبعث إلى أهل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦١٠) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە

واته : كه پـەيامی مـەرگی (جەعفـەر) گەيـشت بـه پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: نـان دروست بکـەن ، بـۆ خێزانەکـەی جەعفـەر ، چونکه ئـەوان ئێستا تووشـی خـەم و خەفەت بوون و نایان پەرژێتە سەر نان و ئاو .

**پێشەوا (شافیعی) فەرموویەتی:** من وام پێ خۆشە کەوا خزمەکانی مردووەکە خواردن دروست بکەن بۆ خێزان و کەسی مردووەکە بۆ ماوەی شەوو ڕۆژێك ، خواردنێکی وابێت تێریان بکات ، چونکە ئەوە سوننەتە و کاری ئەهلی چاکەیە.

**زانایان** لایان پەسەندە زۆر بکرێت لە کەسوکاری مردووەکە کەوا خواردن بخۆن بۆ ئەوەی لاواز نەبن ، جا لە ڕوویان نەیەت خواردن بخۆن ، یا لەبەر زۆری خەم و پەژارە خواردنیان بۆ نەخورێت.

**وە فەرموویانە:** دروست نیە خواردن بۆ ئەو ئافرەتانە بکرێت کە شیوەن دەکەن لەبەر ئەوەی دەبێتە یارمەتی دانیان بۆ ئەو سەرپێچی یە.

**کەراهەتی هەیە بۆ کەس و کاری مردوو کەوا خواردن دروست بکەن بۆ خەڵکی:**

پێشەوایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێکن: کە کەراهەتی هەیە خاوەن مردوو خواردن بۆ خەڵك دروست بکات تا کۆببنەوە لەسەری ، چونکە دەبێتە هۆی زیاد کردنی

---

کتـابی (الجنـائز) دا گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٣١١) ، (ئەحمـەد) لـە (مـسند) ە کەیـدا ، لـە ژێـر ناونیشانی: (مسند أهل البیت رضوان الله علیهم أجمعین - حدیث عبد الله بن جعفر بن ابي طالب رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٨٥) ، هەروەها (عبدالرزاق) لە کتابی (الجنـائز) ، بابی : (الطعام علی المیت) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٦٤٥٥) ، هـەروەها (دارەقوتنی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بابی : (الصلاة علی القبر) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (١٦١٥) هـەروەها شێخ (ئـەلبانی) لـە (سـنن أبـی داود/ ج ٣، ص ١٩٥، ج ٣١٣٢) ، و (جامع الترمذي/ ج ٣، ص ٣٢٣، ح ٩٩٨) ، و (سـنن ابـن ماجـە/ ج ١، ص ٥١٤، ح ١٦١٠) ، و (تلخـیص احکـام الجنـائز/ ص ٧٤) ، و (صـحیح الجـامع الـصغیر/ ح ١٠١٥) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

موصیبەتەکە و سەرقاڵ کردنیان سەرەڕای کاروباری خۆیان ، هەروەها ئەو کارە لە کاری سەردەمی نەفامی و جاهیلی دەچێت، ئەویش لەبەر ئەو فەرمایشتەی هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) کەوا فەرموویانە: (( کنا نعد صنع الطعام ، والإجتماع لأهل الميت من النياحة ))[٢٠٤] واتە: بەڕاستی ئێمە دروستکردنی خواردن و کۆبوونەوە لە دەوری کەس و کاری مردوو بە گریان و شیوەن لەسەر مردوو دەمان ژمارد - واتە: بە یەکێ لەو گوناهانەمان تەماشا دەکرد کە بۆ مردوو دەکرێ کە یەکێکیان شیوەن و ڕۆڕۆ کردنە لەسەر مردوو - .

**(ئیبنوقودامە) فەرموویەتی:** ئەگەر خواردن دروست کردن زۆر پێویست بوو ، ئەوە دروستە ، چونکە لەوانەیە کەسانێك لە گوندەکان و دوورییەوە هاتبن و لایان بمێننەوە ، جا لەو کاتەدا چار نیە دەبێ میوانداری بکرێن.

**هەروەها کەراهەتی هەیە کەوا شوێنێ دیاری بکەن بۆ تەعزیە و سەرەخۆشی کردن:**

بڕوانە فەرمایشتەکەی پێشووی هاوەڵان: (كنا نعد صنع الطعام ، والإجتماع لأهل الميت من النياحة).

**پێشەوا (نەوەوی) دەفەرموێ**[*]: دانیشتن بۆ تەعزیە (شافیعی) و دانەری کتێبی (مهذب)[*]- کە خۆی (مەجموع) ی لە شەرحیدا داناوە - وە هاوەڵان[*]، دەقیان پێدا

---

[٢٠٤] **صحیح** - (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند عبد الله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٩٠٥) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في النهي عن الاجتماع إلى أهل الميت وصنعة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦١٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجه / ج ١ - ص ٥١٤ - ح ١٦١٢) ، و (تلخيص أحكام الجنائز/ ص ٧٣) دا فەرموویەتی : (صحیح) ە.

[*] (المجموع شرح المهذب لإمام النووي / ج ٥ - ص ٣٠٦).

[*] کە ناوی ئەبی ئیسحاق (ئیبراهیم) ی کوڕی (عەلی) کوڕی (یوسف) ی شیرازییە .

ناوە کە مەکروهە ، فەرموویانە: مەبەست بە دانیشتن ئەوەیە کەسوکاری مردووەکە لە شوێنێکدا دانیشن ، وە ئەوانەیشی دەیانەوێت سەرخۆشییان لێ بکەن ڕوو بکەنە ئەو شوێنە ، فەرموویانە: بەڵکو دەبێت هەر کەسێك بۆ ئیش و کاری خۆی بڕوات ، جا هەر کەسێك پێیان گەیشت سەرەخۆشییان لێ دەکات ، وە جیاوازی نییە ، لە نێوان پیاو و ئافرەتدا لە کەراهەتی دانیشتندا.

وە مەبەستی پێشەوا (نەوەوی) بەدەقی (شافیعی) ئەوەیە کە لە کتێبی (الأم)* دا دەیفەرموێ: **(وأكره المأتم، وهي الجماعة وإن لم يكن لهم بكاء، فإن ذلك يجدد الحزن ويكلف المؤنة مع ما مضى فيه من الأذر)** واتە: مەئتەم بە باش نازانم، ئەویش ئەو کۆبوونەوەیە کە بۆ کەس و کاری مردوو دەکرێت تا خەڵکی سەر خۆشییان لێ بکات ، با گریانیشی لە گەڵدا نەبێت ، چونکە ئەوە دڵ تەنگیەکە تازە دەکاتەوە و ئەرکیش لە سەریان دروست دەکات ، لە گەڵ ئەو ئەسەرانەی پێشوویش کە لە بارەیەوە هاتووە .

وە **پێشەوا (نەوەوی) دەفەرموێ:** دانەرو کەسانی تریش بەڵگەیەکی تریشی بۆ دەهێننەوە - لە سەر کەراهەتی- ئەویش ئەوەیە کەوا شتێکی داهێنراوە و بیدعەیە.

**(موحامیلی)** دانی بەوەدا ناوە و لە دەقی (شافیعی) یەوە نەقڵی دەکات (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) ، وە ئەوەش کەراهەتی تەنزیهە ، ئەگەر شتی تازە پەیدابووی تێدا نەبوو ، بەڵام ئەگەر شتی تری لەگەڵدا وەك ئەو بیدعەتانەی کە حەرامن (وەك بەزۆری ڕوو دەدات) ئەو کاتە دانیشتنەکەش حەرامێکە لە حەرامە خراپەکان ، چونکە شتێکی تازە داهێنراوە ، وەك لە فەرموودەشدا هاتووە: واتە: هەموو داهێنراوێکی تازە لە ئاییندا بیدعەیە ، وە هەموو بیدعەیەکیش گومڕایی یە .

---

* واتە: هاوەڵانی شافعی.

* (الأم/ ج ١، ص ٢٤٨).

ئیمام (ئەحمەد) و بەشی زۆری زانایانی (حەنەفی) ئەوە ڕاو بۆچوونیانە .

بەڵام (حەنەفیە) پێشینەکان بۆ ئەوە چوون: کە دانیشتنی سێ ڕۆژ قەیناکە ، بە نەرمێ لە مزگەوتدا نەبێت و حەرامیشی تێدا نەکرێ .

(سید سابق) لە (فقه السنة) دا لەم بارەیەوە دەڵێ*: بەڵام ئەوەی ئێستا دەکرێت لە تەعزیەدا کە سێ ڕۆژ کۆ دەبنەوە لە مزگەوتدا (لە هەندێ وڵاتدا دوو ڕۆژ) یا چادرو دەوار هەڵدەدەن و فەرش ڕادەخەن و پارەو پوڵێکی زۆر بۆ شانازی و خۆ هەڵکێشان خەرج دەکەن ئەوە لە کارە تازە داهێنراوەکانە کە پێیان دەڵێن: بیدعە ، جا پێویستە لەسەر موسوڵمانان خۆی لێ بپارێزن ، ئەو کارەش حەرامە لەسەریان ، بە تایبەتی کەدەبینن زۆر شتی تێدا دەکرێ پێچەوانەی قورئان و سوننەتەکانی تری پێغەمبەرن (ﷺ)، بەڵکو پەیڕەوی خوڕەوشتی سەردەمی نەفامی دەکرێ وەك: قورئان خوێند بە گۆرانییەوە و ، پەیڕەوی نەکردن بە ئادابی قورئان خوێندن و ، گوێ نەگرتن لێی و ، خۆ خەریك کردن بە قسەکردن و جگەرە کێشان و گەلێ شتی تر ، وە ئەوکەسانەی کە خاوەن هەواو ئارەزوون بەمەشەوە نەوەستاون و زۆر لەوەش تێپەڕیون دەبینن خەڵکەکە بەو سێ ڕۆژە وازناهێنن لە ڕۆژی چل هەمینیشدا ئەو بەزمە تازە دەکەنەوە و ئەو بیدعە و خراپەیە دووبارە دەکەنەوە ، لە پاشاندا سالگەری بۆ دادەنێن بە بۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر مردنیدا ، بەم جۆرە شتی وەها دەکرێ کە نە عەقڵ و نە شەرع وەری ناگرێ .

---

* (فقه السنة لسيد سابق/ ج ١ - ص ٢٩٨).

# بەشی شەشەم

# ئەوەی مردوو سوودی لێ وەردەگرێ

## یەکەم: خێرو خێرات کردن

لەم بارەیەوە پێشەوا (نەوەوی) ئیجماعی هەموو زانایان لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە ، کە خێر بری مردوو دەکەوێت و پاداشتەکەشی پێ دەگات ، چ لە کوڕەوە بێ یا لە کەسێکی ترەوە ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی لای (ئەبوهورەیرە):

١- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رجلا قال للنبي (ﷺ): إن أبي مات وترك مالا ، ولم يوص ، فهل يكفر عنه أن أتصدق عنه ؟ قال: نعم ))[٢٠٥] واتە : جارێ پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و پێی وت: باوکم مردووە و سامانی بەجێ هێشتووە و وەسیەتی نەکردووە ، ئایا لەجێی ئەو خێر لەو سامانە بکەم بۆی دەبێ و دەبێتە کەفارەت بۆی ؟ فەرمووی: بەڵێ .

٢- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رجلا أتى النبي (ﷺ) فقال: يا رسول الله (ﷺ) ! إن أمي افتلتت نفسها ولم توص ، وأظنها لو تكلمت تصدقت ، أفلها أجر ، إن تصدقت عنها ؟ قال: نعم ))[٢٠٦]

---

[٢٠٥] صحيح - (موسلیم) لە کتابی (الوصية) ، بابی : (وصول ثواب الصدقات إلى الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٩٥) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الوصايا) ، بابی : (فضل الصدقة عن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٥٤).

[٢٠٦] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الوصايا) ، بابی : (ما يستحب لمن توفي فجاءة أن يتصدقوا عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧٦٠) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الزكاة) ، بابی : (وصول ثواب الصدقة عن الميت إليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٢٤) ، هەروەها لە کتابی (الوصية) ، بابی :

واتـه : پیـاوێ هاتـه خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ! دایکم لەناکاو مرد ، فریانەکەوت کە ڕاسپێری و وەسێت بکا ، تا خێری بۆ بکەین ، وەها دەزانم ئەگەر مەودای قسەکردنی ببوایە خێرێکی بڕیار دەدا بۆ خۆی ، جا ئایا خێری دەگا ئەگەر من لە جیاتی خۆی خێری بۆ بکەم ؟ فەرمووی: بەڵێ .

٣- لـه (ئیبنوعـەبباس) ەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی:

(( أن سعد بن عبادة رضي الله عنه توفيت أمه وهو غائب عنها ، فقال: يـا رسـول الله (ﷺ) ! إن أمي توفيت وأنا غائب عنها ، أينفعها شيء إن تصدقت به عنها ؟ قال: نعم، قال: فإني أشهدك أن حائطي المخراف صدقة عليها ))[٢٠٧]

واته : (سەعدی کوڕی عوبادە) کاتێ دایکی دەمرێ ، خـۆی لـەوێ نابـێ ، وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! کە داسکم مرد خۆم بە دیاریـەوە نـەبووم ، جا ئایا ئەگەر ئێستا من شتێکی بۆ بکەم بەخێر سوودی دەبێ بـۆی ؟ فـەرمووی: بـەڵێ ، وتـی: دە تۆ بە شایەت بە کەوا ئەو باخەم کرد بە خێر بۆی .

---

(وصول ثواب الصدقات إلى الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٩٧) ، هـەروەها (ابـن ماجـه) لـه کتـابی (الوصايا) ، بابی : (من مات ولم يوص هل يتصدق عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧١٧).

[٢٠٧] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الوصايا) ، بابی : (إذا قال : أرضي أو بستاني صدقة لله عـن أمـي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧٦٢) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتـابی (الوصـايا) ، بـابی : (مـا جـاء فـيمن مات عن غير وصية يتصدق عنه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٨٨٢) ، هـەروەها (ترمـذی) لـە کتـابی (الزكاة) ، بابی : (ما جاء في الصدقة عن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٩) ، هـەروەها (نەسـائی) لە کتابی (الوصايا) ، بابی : (فضل الصدقة عن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٥٥).

٤- لە (سەعد) ی کوڕی (عوبادە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( يا رسول الله (ﷺ) ! إن أم سعد ماتت ، فأي الصدقة أفضل؟ ، قال: الماء ، قال : فحفر بئرا ، وقال: هذه لأم سعد ))[٢٠٨]

واتە : وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! دایکم مردووە کام خێرە خێرترە تا بۆی بکەم بەخێر ؟ فەرمووی: ئاو . (ڕاوی) دەڵێ: جا (سەعد) یش بیرێکی لێ داو فەرمووی: ئەمە وەقف بێ بۆ ڕۆحی دایکم .

وە (ئیبنوقەییم) یش فەرموویەتی: خواپەرستی دوو بەشە: ماڵی و بەدەنی ، وە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردووینەوە کە لەناو هەموو عیبادەتە سامانیەکاندا پاداشتی صەدەقە بە مردوو دەگات ، وە لەناو هەموو عیبادەتە بەدەنییەکاندا پاداشتی ڕۆژوو بە مردوو دەگات ، وە پێی ڕاگەیاندووین کە پاداشتی حەج کە عیبادەتێکی ماڵی و بەدەنییە بە مردوو دەگات ، جا ئەم سێ جۆرە سابت بوون بە دەق و ئیعتیبار .

---

[٢٠٨] **حسن** - (ئەبوداود) لە کتابی (الزكاة) ، بابی : (في فضل سقي الماء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٨١) ، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الصغرى) دا لە کتابی (الوصايا) ، بابی : (ذكر الاختلاف على سفيان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٦٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الأدب) ، بابی : (فضل صدقة الماء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٨٤) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند الأنصار - حديث سعد بن عبادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨٦٢) ، هەروەها (سعيد بن منصور) لە (سنن) ە کەیدا لە کتابی (الوصايا) ، بابی: (هل يقضي الحي النذر عن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٠٦) ، هەروەها (الشاشي) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند سعد بن أبي وقاص رضي الله عنه - ما رواه سعيد بن المسيب عن سعد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ٢، ص ١٣٠، ح ١٦٨١) ، و (سنن النسائي/ ج ٦، ص ٢٥٤، ح ٣٦٦٤) ، و (سنن ابن ماجه/ ج ٢، ص ١٢١٤، ح ٣٦٨٤) دا فەرموویەتی: (حسن) ە. بەڵام لە (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ١، ح ٩٦٢) دا فەرموویەتی: (حسن لغيره) یە.

**هەروەها فەرموویەتی:** دەڵێن چاکترین شت ئەوەیە کەلە خۆیدا سوودی زۆرتر بێت ، بۆ نموونە: بەندە ئازادکردن لە بری مردوو ، پاشان خێرو صەدەقە چاکترە لە ڕۆژووگرتن بۆی ، وە چاکترین صەدەقەش ئەوەیە کە ڕێ بکەوێت لەگەڵ پێویستی خێر پێکراوەکە و بەردەوام و هەمیشەیی بێت ، لەم بارەیەوە:

لە (سەعد) ی کوڕی (عوبادە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( قلت: يا رسول الله (ﷺ) ، أي الصدقة أفضل ؟ قال: سقي الماء ))[٢٠٩]

واتە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! کام خێر پاداشتی چاکتر و زۆرە ؟ فەرمووی: چاکترین صەدەقە خێراوە .

ئەمەش لە شوێنێکدا دەبێت کە ئاوی کەم و ڕێبواری تینووی زۆر پێدا بڕوات ، ئەگینا خێراو لە شوێنێکی پڕ ئاودا چاکتر نابێت لە خواردن بەخشین بۆ ئەوکەسانەی پێویستیان پێیەتی ، هەروەها پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوون بۆی چاکترە ئەگەر ئەوکەسە بەدڵ و مل کەچییەوە بۆی بپاڕێتەوە ، چونکە لە شوێنی خۆیدا لە صەدەقە چاکترە بۆی ، هەروەك نوێژکردن لەسەری کاتێ جەنازەیە و نەنێژراوە چاکترە لە وەستان بۆ دوعاو پاڕانەوە بۆی لەسەر گۆڕەکەی .

---

[٢٠٩] **حسن** - (نەسائی) لە (السنن الصغرى) دا لە کتابی (الوصايا) ، بابی : (ذكر الاختلاف على سفيان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٦٥) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الأدب) ، بابی : (فضل صدقة الماء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٨٤) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الزکاة) ، بابی : (صدقة التطوع - ذكر البيان بأن من أفضل الصدقة للمرء المسلم سقي الماء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٤٠٧) ، هەروەها (ابن شاهين) لە کتێبی (الترغيب في فضائل الأعمال وثواب ذلك) دا ، بابی : (فضل سقي الماء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧٨) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٦، ص ٢٥٤، ح ٣٦٦٥) ، و (سنن ابن ماجە/ ج ٢، ص ١٢١٤، ح ٣٦٨٤) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

## بابەتێکی تایبەت
## بەخشینی پاداشت بە پێغەمبەر (ﷺ)

**(ئیبنوقەییم) فەرموویەتی:** دەڵێن: لە زانایانی ئەم دواییەدا هەیە کە دە فەرموێ: پەسەندە ، وە هەشیانە بە پەسەندی نازانێ و بە بیدعەی دەزانێ ، چونکە هاوەڵان شتی وایان نەدەکرد ، وە پێغەمبەر (ﷺ) پاداشتی هەموو ئەو خێرانەی پێ دەگات کە ئوممەتی ئیسلامی دەیکەن بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان هیچ کەم بێتەوە ، چونکە هەر ئەو بوو کە هەموو خێرێکی نیشان ئوممەتەکەی دا ، وە بانگی کردن بۆی ، وە هەرکەس بانگەواز بکات بۆ ڕێی هیدایەت ئەوەندەی خێری شوێن کەوتوانی پێ دەگات ، بێ ئەوەی لە پاداشتیان کەم بێتەوە ، جا هەموو ڕێنمایی و زانستییەکی ئوممەتەکەی هەر لەسەر دەستی ئەوەوە پێیان گەیشتووە ، لەبەر ئەوە ئەوەندەی پاداشتی ئەوان خێری پێ دەگات ، پێی ببەخشرێ یا پێی نەبەخشرێ .

### دووەم: نزاو پاڕانەوەی باوەڕداران

زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) یەکڕان لەسەر ئەوەی کەوا نزا و پاڕانەوە بۆ مردووان بە سوودە و، وە پێشیان دەگات ، بەڵگەشیان ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کەوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ (الحشر/ ١٠)

واتە: کەسانێکیش کە بەشوێن کۆچ کەران و یارمەتی دەرانـدا هاتن و دێن - تا کۆتایی دونیا ئەمە پاڕانەوەی بەردەوامییانە - کە ئەڵێن: ئەی خوای پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان خۆش ببە و هەروەها لەو برایانەشمان خۆش ببە

**كە لە پێش ئێمەوە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر - و بە ئیمانەوە ژیان و بە ئیمانەوە مردن - .. وە لە ڕووی واتاوە لەم بارەوە گەلێ ئایەتی زۆرمان هەیە.**

**وە لە فەرموودە بەناوبانگەكانیش بریتین لە:**

**١- لە دایكە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی:**

**(( كان رسول الله (ﷺ) - كلما كان ليلتها من رسول الله (ﷺ) - يخرج من آخر الليل إلى البقيع ، فيقول: السلام عليكم دار قوم مؤمنين ، وأتاكم ما توعدون غدا ، مؤجلون ، وإنا ، إن شاء الله ، بكم لاحقون ، اللهم اغفر لأهل بقيع الغرقد ))[٢١٠]**

**واتە: هەموو جارێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نۆرەشەوی (عائیشە) دا، لە كۆتایی شەودا دەردەچوو بۆ گۆڕستانی (بەقیع) و، دەیفەرموو: (السلام عليكم دار قوم مؤمنين، وأتاكم ما توعدون غدا، مؤجلون، وإنا، إن شاء الله، بكم لاحقون، اللهم، اغفر لأهل بقيع الغرقد) سەلامتان لێ بێت ئەی باوەڕدارانی ئەم مەنزلگایە، ئێمە و ئێوەش بۆ ئەوەی بەڵێنمان پێدراوە دواخراوین، (إن شاء الله) خوا حەزكا ئێمەش بە ئێوە دەگەین ، خوایە لە خەڵكی گۆڕستانی (بقيع الغرقد) خۆشبە .**

**٢- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی:**

**(( صلى رسول الله (ﷺ) على جنازة ، فقال: اللهم اغفر لحينا ، وميتنا ، وصغيرنا، وكبيرنا، وذكرنا وأنثانا، وشاهدنا وغائبنا ، اللهم من أحييته منا فأحيه على الإيمان ، ومن توفيته منا فتوفه على الإسلام ، اللهم لا تحرمنا أجره ، ولا تضلنا بعده ))[٢١١]**

---

**[٢١٠] صحيح - (موسلیم) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقال عند دخول القبور والدعاء لأهلها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٥٢)، هەروەها (نەسانی) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإستغفار للمؤمنين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٢٨).**

**[٢١١] صحيح - (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (الدعاء للميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠١)، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقول في الصلاة على الميت) گێڕاویەتەوە بە**

واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) نوێـژی لەسـەر تـەرمێ کـرد و فـەرمووی: خوایـە لـە زینـدوو مـردوو، گـەورە و بـچووك و، نێـر و مـێ و، ئامـادە بـوو ئامـادە نـەبوومان خۆشببە ، خوایە ئەوەمان کە بە زیندوویی هێلاوتەتەوە لەسەر ئیمان بیهێڵیتـەوە، وە ئەوەشمان کە دەمرێنی لەسەر ئیسلام بیمرێنە ، خوایە لە پاداشتی ئەم مـردووە بێ بەشمان مەکە ، و لە دوای ئەوەش گومڕامان مەکە.

٣- لە (صەفوان) ی کوڕی (عبدالله) ی کوڕی (صەفوان) ی قوڕەشیەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( قدمت الشام ، فأتيت أبا الدرداء في منزله ، فلم أجده ووجدت أم الدرداء ، فقالت: أتريد الحج العام ، فقلت: نعم ، قالت: فادع الله لنا بخير ، فإن النبي (ﷺ) كان يقول: دعوة المرء المسلم لأخيه بظهر الغيب مستجابة ، عند رأسه ملك موكل كلما دعا لأخيه بخير ، قال الملك الموكل به: آمين ، ولك بمثل ، قال: فخرجت إلى السوق فلقيت أبا الدرداء ، فقال لي مثل ذلك يرويه ، عن النبي (ﷺ) ))[٣١٣] واتە : چوومە (شام) ، چووم بۆلای (ئەبودەرداء)، خۆی لە ماڵ نەبوو (ئوم دەرداء) ی خێزانی لە ماڵ بوو ، (ئوم دەرداء) فەرمووی: ئەم ساڵ دەچیت بۆ حەج ؟ وتم: بەڵێ ، فەرمووی: نزای باشمان بۆ بکە لەلای خوا ، چونکە

---

ژمـارە (١٠٢٤)، هـەروەها (نەسـائی) لـە (عمـل اليـوم والليلـة) دا گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٠٨٠)، هـەروەها (ابـن ماجـه) لـە کتـابی (الجنـائز)، بـابی: (مـا جـاء في الـدعاء في الـصلاة علـى الجنـازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٩٨)، هەروەها (ابن حبـان) لـە کتـابی (الجنـائز ومـا يتعلق بها مقدما أو مؤخرا)، لە ژێر ناونیشانی: (فصل في الصلاة على الجنازة - ذكر ما يـدعو المـرء بـه في الـصلاة علـى الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣١٢٥)، هەروەها (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز)، بـابی: (الـدعاء في صلاة الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٧١).

[٣١٣] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الـذكر والـدعاء) ، بـابی : (فـضل الـدعاء للمـسلمين بظهـر الغيـب) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٦٨٦٦) ، هـەروەها (ابـن ماجـه) لـە کتـابی (الحـج) ، بـابی : (فـضل الـدعاء الحجاج) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٩٥).

گەڵێ جار پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: نزای موسوڵمان بۆ برای موسوڵمانی لە پاشملە گیرایە ، لە ڕاسەری مەلائیکەیە هەیە ڕاسپێرراوە ، هەر چەند موسوڵمان نزای باش بۆ برای خۆی دەکا ئەو مەلائیکەتەش دەفەرموێ: ئامین ، وێنەی نزاکەی خۆت بۆ تۆش بێ.

## سێیەم: هەدیەکردنی پاداشتی قورئان خوێندن

**پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ:** زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) جیاوازن لە گەیشتنی پاداشتی قورئان خوێندن بۆ مردوو، جا ئەوەی بەناوبانگە لەلای مەزهەبی (شافیعی) و کۆمەڵێك ئەومیە کەوا ئەو پاداشتە ناگات .

وە پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) و، کۆمەڵێ لە زانایان و، کۆمەڵێکیش لە هاوەڵانی (شافیعی) بەرەو ئەوە ڕۆیشتوون کەوا پاداشتی قورئان خوێندن دەگات بە مردوو.

**هەروەها دەفەرموێ:** ئەوکەسەی قورئانەکە دەخوێنێت با لە پاش کۆتایی هاتن بە خوێندنەکە بڵێت: **(اللهم أوصل ثواب ما قرأته إلى فلان)** ، **(والله أعلم).**

واتە: (خوایە پاداشتی ئەم قورئان خوێندنەم بگەیەنە بە فلانە کەس)، (وە خواش زاناترە بە هەموو شت).

وە **(ئیبنوقودامە) لە (المغنى) دا فەرموویەتی:** ئیمام (ئەحمەد) فەرموویەتی: مردوو هەرچی شتێکی خێری بۆ بکرێ پێی دەگات ، بەپێی ئەو فەرموودانەی کە لەو بارەیەوە هاتووە ، هەروەها موسوڵمانان لە هەموو وڵاتێکدا کۆ دەبنەوە و قورئان دەخوێنن و هەدییەی دەکەن بە مردووان بێ ئەوەی کەس نکوڵی ئەوە بکات ، ئەمەش بوو بە (إجماع).

**بەڵام ئەوانەی کە دەفەرموون:** پاداشتی قورئان خوێندن بە مردوو دەگات ، دەفەرموون: بە مەرجێك پێی دەگات کە ئەو قورئان خوێنە کرێی لەسەر

وەرنەگرێ ، چونکە ئەگەر ئەوکەسە کرێی وەرگرت لەسەر ئەو خوێندنە ، ئەوە حەرام دەبێت لەسەر خوێنەرو کرێدەر ، وە ئەو خوێنەرە کە کرێکەی وەرگرت ئیتر پاداشتی نامێنێ لەسەر خوێندنەکە هەتا پێش کەشی بکات بە مردووەکە ، ئەویش بە بەڵگەی: لە (عبدالرحمن) ی کوڕی (شیبل) ی کوڕی (عەمر) ی ئەنصارییەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (( اقرءوا القرآن - واعملوا بە - ، ولا تجفوا عنە ، ولا تغلوا فیە ، ولا تأكلوا بە ، ولا تستكثروا بە ))[٣١٣]

واتە : قورئان بخوێنن و کردەوەی پێ بکەن ، وە لێی دوور مەکەونەوە ، وە ڕۆمەچن تیایدا و زیادەڕەوی تێدا مەکەن ، وە بە قورئان خۆتان مەژێنن و خۆتان دەوڵەمەند مەکەن .

---

[٣١٣] **صحیح** - (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند المكيين - زيادة في حديث عبد الرحمن بن شبل رضي الله تعالى عنە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٢٣٢) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (صلاة التطوع والإمامة) ، بابی : (في الرجل يقوم بالناس في رمضان فيعطى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٦٢٩) ، هەروەها (ابن أبي عاصم) لە کتێبی (الآحاد والمثاني) دا ، لە ژێر ناونیشانی : (عبد الرحمن بن شبل رضي الله عنە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٥٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الصلاة) ، بابی : (وجوب تعلم ما تجزئ به الصلاة من التكبير والقرآن والذكر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٠٣) ، هەروەها (عبد بن حميد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (حديث عبد الرحمن بن شبل رضي الله عنە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٥) ، هەروەها (ئەبی یەعلا) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (عبد الرحمن بن شبل الأنصاري) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٨٣) ، هەروەها (القاسم بن سلام) لە کتێبی (فضائل القرآن) دا ، بابی : (القارئ يستأكل بالقرآن ويرزا عليه الأموال وما في ذلك من) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٧) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ١، ص ٥٢٢، ح ٢٦٠) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ١١٦٨) ، و (فقه السيرة) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

## چوارەم : دانەوەی قەرزەکانی

١- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( نفس المؤمن معلقة بدينه حتى يقضى عنه))[٢١٤] واتە : ڕۆحی موسوڵمان لەپاش مردنی بەندو گیرۆدەی ئەو قەرزەیە کە لەسەریەتی ، هەروا دەمێنێ و پایەی بەرێزی خۆی لێ قەدەغەیە تا قەرزەکەی بۆ دەدەنەوە .

ئەمە بۆ کەسێکە کە ماڵی بەجێماوی هەبوو ، ئەوە لەو ماڵەی خۆی قەرزەکەی بۆ بدرێتەوە ، بەڵام ئەگەر کەسێك ماڵی بەجێماوی نەبوو ، وە لە ژیاندا نیازی دانەوەی ئەو قەرزەی هەبوو ، ئەوە سابت بووە کە خوای گەورە قەرزەکەی بۆ دەداتەوە .

٢- لە (ئەبوهورەیرە)وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من أخذ أموال الناس يريد أداءها أدى الله عنه ، ومن أخذ

---

[٢١٤] **صحيح** – (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء عن النبي (ﷺ) أنه قال) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٨) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الصدقات) ، بابی : (التشديد في الدين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤١٣) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی: (فصل في الصلاة على الجنازة - ذكر العلة التي من أجلها كان لا يصلي النبي صلى الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٦) ، هەروەها (دارەمی) لە کتابی (البيوع) ، بابی : (ما جاء في التشديد في الدين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٤٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٢، ص ٢٨٩، ح ١٠٧٨) ، و (سنن ابن ماجه/ ج ٢، ص ٨٠٦، ح ٢٤١٣) ، و (إرواء الغليل/ ج ٣، ح ٧٦٣) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٦٧٧٩) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٢، ح ١٨١١) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ٢، ح ٢٩١٥) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

يريد إتلافها أتلفه الله ))[٣١٥] واته : هەرکەس ماڵی کەسێکی وەرگرت بە نیازی دانەوەی ئەوە خوای گەورە قەرزەکەی بۆ دەداتەوە ، وە هەرکەس وەری بگرێت بە نیازی لەناوبردن و تیاچوونی ئەوە خوای گەورە لەناوی دەبات .

**وە ئەگەر هاتوو ئەو مردووە قەرزاربوو، وە کەسیش نەبوو قەرزەکەی بۆ بداتەوە ئەوە لەو حاڵەتەدا پێویستە لە (بيت المال) قەرزەکەی بۆ بدرێتەوە:**

لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( أنا أولى بالمؤمنين من أنفسهم ، فمن مات وعليه دين ولم يترك وفاء فعلينا قضاؤه ، ومن ترك مالا فلورثته ))[٣١٦]

واتە : من بۆ باوەڕداران لە خۆیان لە خۆیان بۆ پێشترم ، جا هەرکەس بمرێت و قەرزێکی بەسەرەوە بێت و هیچی بەجێ نەهێشتبێت بۆ دانەوەی ، ئەوە ئێمە بۆی دەدەینەوە ، وە هەرکەس ماڵێکی بەجێ هێشت دانەوەی بۆ میرات بەرەکانی دەبێت.

---

[٣١٥] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (في الاستقراض وأداء الديون والحجر والتفليس) ، بابی : (من أخذ أموال الناس يريد أداءها أو إتلافها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٨٧) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الصدقات) ، بابی : (من ادان دينا لم ينو قضاءه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤١١).

[٣١٦] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الفرائض) ، بابی : (قول النبي (ﷺ): من ترك مالا فلأهله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٣١) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الفرائض) ، بابی : (من ترك مالا فلورثته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٣٣) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الفرائض) ، بابی : (في ميراث ذوي الأرحام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٩٩) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الصلاة على المديون) گێڕاویەتەوە بە ژمارە () ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على من عليه دين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٦٣) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الصدقات) ، بابی : (من ترك دينا أو ضياعا فعلى الله وعلى رسوله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤١٥).

حا کەواتە بەپێی ئەم فەرموودەیە بێ هەرکەس لە موسوڵمانان بە قەرزاری بمرێ و کەس نەبێ قەرزەکەی بۆ بداتەوە و ، وە خاوەن قەرزەکەش لێی خۆش نەبێ ، ئەوە ئەو مردووە مافی خۆیەتی کە لە خانەی دارایی موسوڵمانان (بیت المال المسلمین) قەرزەکەی بۆ بدرێتەوە ، چونکە یەکێکە لە موسوڵمانان و پێویستی سەرشانیانە کەوا ئەو قەرزەی بۆ بدەنەوە.

## پێنجەم: گرتنەوەی ڕۆژوویەك کە نەیگرتبێ

١- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( من مات وعليه صيام ، صام عنه وليه ))[٢١٧] واتە : هەرکەسێك بمرێت و ڕۆژوو قەرزار بێت ئەوە سەرپەرشتی کەرەکەی بۆی بگرێتەوە .

٢- لە (ئیبنوعەبباس) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن امرأة أتت رسول الله (ﷺ) فقالت: إن أمي ماتت وعليها صوم شهر ، فقال: أرأيت لو كان عليها دين أكنت تقضينه ؟ قالت: نعم ، قال: فدين الله أحق بالقضاء ))[٢١٨]

---

[٢١٧] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی : (الصوم) ، بابی : (من مات وعليه صوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٢) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی : (الصيام) ، بابی : (قضاء الصيام عن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٨٧) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی : (الصوم) ، بابی : (فيمن مات وعليه صيام) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤٠٠).

[٢١٨] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی : (الصوم) ، بابی : (من مات وعليه صوم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٥٣) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی : (الصيام) ، بابی : (قضاء الصيام عن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٨٨) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی : (الأيمان والنذور) ، بابی : (ما جاء فيمن مات وعليه صيام صام عنه وليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٣١٠) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی : (الصوم) ، بابی : (ما جاء في الصوم عن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٦).

واته : ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! دایکم کۆچی دوایی کردووه و مانگێ ڕۆژووی لەسەره ، ئایا من بۆی بگرمەوه؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەر بوایە بۆت دەداوه ؟ وتی: بەڵێ ، فەرمووی: دەی قەرزی خوا لە پێشتره بدرێتەوه .

**پێشەوا (نەوەوی) دەفەرموێ:** ئەو قسەیە ڕاست و هەڵبژاردەیە ، وه ئێمەش باوەڕمان پێی هەیە ، وه هەرئەو قسەیەیە کە لێکۆڵەرەوەکان لە هاوڕێکانمان بە ڕاستیان داناوه ، ئەوانەی کە لە نێوان (فقه) و (حدیس) دا ڕێکخستن دەکەن ، بە پێی ئەو فەرمووده (صحیح) و (صریحان) ە .

**هەروەها شێخی ئیسلام (ابن تیمیة) لە (الإختیارات) دا دەفەرموێ:** ئەگەر کەسێك لە بری کەسێك کە نەتوانێ بە ڕۆژوو بێت لەبەر پیری یان شتی تر ، یان لە جیاتی مردوویەك بە ڕۆژوو بێت ، وه ئەو دوانە پیرەکە و مردووەکە دەستیان کورت بوو بۆ کەفارەتدان ئەوه ڕۆژوو گرتن لە جیاتی ئەوان ڕێی تێ دەچێ کە دروست بێت ، چونکە ئەمیان لە قەرزدانەوەی ماڵ لە پێشتر و نزیکتره .

## شەشەم : بەجێ هێنانی نەزرێ کە بەجێی نەهێنابێ

لە (ئیبنوعەبباس) ە وه (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوه کەوا فەرموویەتی: (( أن سعد بن عبادة رضي الله عنه استفتى رسول الله (ﷺ)، فقال: إن أمي ماتت وعليها نذر ، فقال: اقضه عنها ))[٣١٩]

---

[٣١٩] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (الوصایا) ، بابی : (ما یستحب لمن توفي فجاءة أن یتصدقوا عنه) گێڕاویەتەوه بە ژماره (٢٧٦١) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الأیمان والنذور) ، بابی : (في قضاء النذر عن المیت) گێڕاویەتەوه بە ژماره (٣٣٠٧) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (النذور والأیمان) ، بابی : (ما جاء في قضاء النذر عن المیت) گێڕاویەتەوه بە ژماره (١٥٤٦) ، هەروەها (نەسائی) لە

واتە : سەعدی کوڕی عوبادە (خوای لێ ڕازی بێت) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردو وتی: دایکم مرد و نەزری ڕۆژووی لەسەربوو (ئایا چی بکەم) ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامیا فەرمووی: بیگێڕەوە بۆی .

## حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم: کردەوەیەکی چاکی بەردەوامی خۆی ، سوودگەیاندن بە زانستەکەی بە خەڵکانی تر ، بەجێ هێشتنی منداڵێکی صالح لەدوای خۆی کە بۆی بپاڕێتەوە

ئەوەی زانایان لەسەری ڕێکەوتوون ئەوەیە: کە مردوو سوود لەو کارە خێرانە وەردەگرێ کە خۆی هۆیەك بووە لە دنیادا بۆ دروست بوونیان .

١- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا مات الإنسان انقطع عنه عمله إلا من ثلاثة: إلا من صدقة جارية ، أو علم ينتفع به ، أو ولد صالح يدعو له ))[٣٢٠]

واتە : کاتێ ئادەمیزاد دەمرێ ، هەموو کردەوەیەکی کۆتایی دێ ، تەنها ئەم سێ شتە نەبێ: یەکەم: خێرێکی نەبڕاوە - وەکو: دروست کردنی مزگەوت و بیر و کارێز و پرد و نەخۆشخانە و خوێندنگا و شتی وەقف - ، دووەم: زانینی بە سوود - وەکو : نووسینی کتێبی بە نرخ و پێگەیاندنی فەقێ و قوتابی و شاگردی بە سوود و بە

---

کتابی (الأيمان والنذور) ، بابی : (من مات وعليه نذر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٦٠) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الكفارات) ، بابی : (من مات وعليه نذر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٢).

[٣٢٠] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الوصية) ، بابی: (ما يلحق الإنسان من الثواب بعد وفاته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٩٩) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الأحكام) ، بابی: (في الوقف) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٧٦) ، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الصغرى) دا لە کتابی (الوصايا) ، بابی: (فضل الصدقة عن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٦٥٣).

کەڵك بۆ موسوڵمانان - ، سێیەم: منداڵ و وەچەیەکی باش کە دوعا و نزای باشی بۆ بکا.

٢- لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إن مما يلحق المؤمن من عمله وحسناته بعد موته: علما علمه ونشره ، وولدا صالحا تركه ، ومصحفا ورثه ، أو مسجدا بناه ، أو بيتا لابن السبيل بناه ، أو نهرا أجراه ، أو صدقة أخرجها من ماله في صحته وحياته، يلحقه من بعد موته ))[٣٢١]

واتە : ئەوەی دەگات بە باوەڕدار لە کردارو چاکەکانی پاش مردنی ، زانستێکە فێری بووبێت و بڵاوی کردبێتەوە ، یا کوڕێکی باشی بەجێ هێشتبێت ، یا قورئانێکی نووسیبێتەوە و بەجێی هێشتبێ بۆ میراتگرەکانی ، یا مزگەوتێك کە خۆی دروستی کردبێ ، یا خانوویەك خۆی دروستی کردبێ بۆ ڕێبواران ، یا ڕوبارێکی هەڵبەستبێ ، یا خێرێك کەلە ژیانیدا لەو سامانەی بوویەتی جیای کردبێتەوە و دوای خۆی کرابێت بە خێر ، ئەویش پێی دەگات لە دوای مردنەکەی.

٣- لە (جەریر) ی کوڕی (عبدالله) ی بەجەلییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( من سن في الإسلام سنة حسنة ، فله أجرها ، وأجر من عمل بها بعده ، من غير أن ينقص من أجورهم شيء ، ومن سن في الإسلام سنة سيئة ، كان عليه وزرها ووزر من عمل بها من بعده ، من غير أن ينقص من أوزارهم

---

[٣٢١] حسن - (ابن ماجه) لە (المقدمة) دا ، بابی : (ثواب معلم الناس الخير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٤٢) ، هەروەها (ابن خزيمة) لە کتابی (الصدقات والمحبسات) ، بابی : (فضائل بناء السوق لأبناء السابلة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣١٩) ، هەروەها (بەیهەقی) لە کتێبی (شعب الإيمان) دا ، لە ژێر ناونیشانی : (الاختيار في صدقة التطوع) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٨٧) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن ابن ماجە/ ج ١، ص ٨٨، ح ٢٤٢) ، و (صحیح الجامع الصغیر/ ح ٢٢٣١) ، و (صحیح الترغیب والترهیب/ ج ١، ح ٧٧) ، و (مشكاة المصابیح / ج ١، ح ٢٥٤) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

شيء))[222] واتە : هەركەس لە ئیسلامدا ڕەفتارێكی چاك دابنێ ، ئەوە خێری ئەو كارەی بۆ هەیە و ، هەروەها خێری ئەوكەسانەی كە لەسەر ئەو ڕەفتارە دەڕۆن ، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوانی تر كەم بكات ، وە هەركەس لە ئیسلامدا ڕەفتارێكی خراپ دابنێ ، ئەوە تاوانی ئەو كارەی لەسەرە ، لەگەڵ تاوانی ئەوكەسانەی كە لەسەری دەڕۆن ، بێ ئەوەی لە تاوانی ئەمان كەم بكاتەوە .

## دەیەم: مردنی منالی نەبالقی خۆی

١- لە (ئەنەس) ی كوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ما من الناس من مسلم ، يتوفى له ثلاث لم يبلغوا الحنث ، إلا أدخله الله الجنة بفضل رحمته إياهم ))[223] واتە : هەر موسوڵمانێ سێ منالی بمرن باڵغ نەبووبن ، بێگومان خوای گەورە لەبەر خاتری ئەو منداڵانە دەیباتە بەهەشت.

٢- لە (ابوذر) ی غیفارییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە كەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ما من مسلمين يموت بينهما ثلاثة أولاد لم

---

[222] **صحيح** - (موسلیم) لە كتابی (الزكاة)، بابی: (الحث على الصدقة ولو بشق تمرة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٤٨)، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الزكاة)، بابی: (التحريض على الصدقة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٥٣)، هەروەها (ابن ماجه) لە (المقدمة) دا ، بابی: (من سن سنة حسنة أو سيئة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣).

[223] **صحيح** - (بوخاری) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (فضل من مات له ولد فاحتسب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٤٨) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (من يتوفى له ثلاثة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٧٣).

يبلغوا الحنث إلا أدخلهما الله بفضل رحمته إياهم الجنة ، قال: يقال لهم: ادخلوا الجنة ، فيقولون: حتى يدخل آباؤنا ، فيقال: ادخلوا الجنة أنتم وآباؤكم ))[٣٢٤]

واتە : ئەو دوو موسوڵمانەی کە سێ منالی نە بالغیان بمرێ ، بێگومان خوای گەورە لەبەر خاتری مندالەکانیان خۆشیان دەباتە بەهەشت ، فەرمووی: پێیان دەڵێن: بچنە بەهەشتەوە ، دەڵێن: بەبێ باوك و دایکمان ناچین ! ئەوجا پێیان دەڵێن: باشە خۆتان و باوك و دایکتان پێکەوە بچنە بەهەشتەوە !

## چەند بابەتێکی تایبەت

### ١) مندالانی نە بالق دەچنە بەهەشتەوە

هەر منداڵێ کە بالغ نەبووبێ و بمرێ ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە ، بە بەڵگەی ئەوەی (بوخاری) لە (عەد) ی کوڕی (سابت) ی ئەنصاریيەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( أنه سمع البراء رضي الله عنه ، قال: لما توفي إبراهيم عليه السلام ، قال رسول الله (ﷺ): إن له مرضعا في الجنة ))[٣٢٥] واتە : گوێم لە (بەڕڕاء) ی کوڕی (عازیب) بووە کەوا فەرموویەتی: کاتێ (ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) ) مرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: لە بەهەشتا دایەنێکی بۆ دانراوە ، شیری دەداتێ .

---

[٣٢٤] **صحيح** - (نەسائی) لە (السنن الصغری) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من يتوفى له ثلاثة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٧٦) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في ثواب من أصيب بولده) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٠٥) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٤، ص ٢٥، ح ١٨٧٦) ، و (سنن ابن ماجه/ ج ١، ص ٥١٢، ح ١٦٠٥) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٧٨١) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٢، ح ١٩٩٥) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[٣٢٥] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما قيل في أولاد المسلمين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٨٢).

**(ابن حجر ) ی عەسقەلانی لە (فتح الباري) دا دەفەرموێ:** ئیمام (بوخاری) ئەوەی بۆیە کردووە بە بابێك ، چونکە وای دەرخستووە کە منداڵانی موسوڵمانان ئەگەر مردن دەچنە بەهەشتەوە .

کەواتە منداڵانی بێ بڕوا و هاوبەشدانەرانیش وەك منداڵانی موسوڵمانن لە چوونە بەهەشتدا ، هەر بۆیە **ئیمام (نەوەوی) فەرموویەتی:** ئەوە نەزهەبی ڕاست و هەڵبژێراوە لەلایەن لێکۆڵەوەرانی ئیسلامەوە بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کەوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ (الإسراء/ ١٥) واتە: ئێمە سزادەری کەس نین هەتا پێغەمبەری بۆ نەنێرین .

جا ئەگەر خوای گەورە سزای باڵغ و خاوەن بیرو هۆش نەدات هەتا نێرراوی بۆ نەنێرێ ، ئیتر چۆن سزای کەسێکی بێ ئاوەز دەدات کە ئازار نەدانی ئەم لە پێشترە.

هەروەها بەپێی ئەوەی ئیمام (ئەحمەد) لە (حەسناء) ی کچی (موعاویە) ی کوڕی (سولەیم) ی صورمیمیەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا پووری* فەرموویەتی: (( قلت للنبي (ﷺ): من في الجنة ؟ قال: النبي (ﷺ) في الجنة ، والشهيد في الجنة ، والمولود في الجنة ، والوئيد في الجنة ))[٣٣٦]

واتە : وتم بە پێغەمبەر (ﷺ): کێ دەچێتە بەهەشتەوە ؟ فەرمووی: پێغەمبەران دەچنە بەهەشتەوە ، و شەهیدان دەچنە بەهەشتەوە ، و منداڵانی نە باڵغ دەچنە بەهەشتەوە ، و کچە زیندە بەچاڵەکانیش دەچنە بەهەشتەوە.

---

* ناوی: (ئەسلەم) ی کچی (سولەیم) ە.

[٣٣٦] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجهاد) ، بابی : (في فضل الشهادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٢١) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (أول مسند البصريين - حديث رجل من الأنصار) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٠٦٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ٣، ص ١٥، ح ٢٥٢١) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ٢، ح ٣٨٥٦) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

## ٢ ) ستایش کردنی مردوو بە چاکە

**موستەحەبە کەوا ستایشی مردووەکە بکەیت و، باسی چاکەی بکەیت:**

أ- لـە (ئەنـەس) ی کـوڕی (مالیـك) ە وە (خـوای لیٚ ڕازی بێـت) دەگێڕنــەوە کـەوا فەرموویەتی: (( مروا بجنازة ، فأثنوا عليها خيرا ، فقال النبي (ﷺ): وجبت ، ثم مروا بأخرى فأثنوا عليها شرا ، فقال: وجبت ، فقال عمر بن الخطاب رضي الله عنه: ما وجبت؟ قال: هذا أثنيتم عليه خيرا ، فوجبت له الجنة ، وهذا أثنيتم عليه شرا ، فوجبت له النار ، أنتم شهداء الله في الأرض ))[٣٢٧]

واتە: تەرمێك بـە لای پێغەمبـەردا (ﷺ) تێپـەڕی ، جا خەڵکەکە بـە چاکە باسیان لێوە کرد ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بۆی مسۆگەر بوو ، دواتر تەرمێکی تر تێپـەڕ بـوو، بـەڵام ئـەمجارەیان خەڵکەکـە بـە خراپـە باسـیان لێـوە کـرد، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: بۆی مسۆگەر بوو ، جا (عومەری کوڕی خـەتتاب) (خـوای لیٚ ڕازی بێـت) فەرمووی: چی مسۆگەر بـوو؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ئەمـەیان ئێـوە بـە چاکە باستان لێـوە کـرد ، ئـەوە بەهەشـتی بـۆ مـسۆگەرە ، وە ئەوەشـیان ئێـوە بـە خراپـە باستان لێـوە کـرد ، ئـەوەش ئـاگری دۆزەخـی بـۆ مـسۆگەرە ، چـونکە ئێـوە گـەواهی دەری خوای پەروەردگارن لە زەویدا .

ب- لە (ئەبول ئەسوەد) ە وە (خـوای لیٚ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کەوا فەرموویـەتی: (( قدمت المدينة وقد وقع بها مرض ، فجلست إلى عمر بن الخطاب رضي الله عنـه ،

---

[٣٢٧] **صحیح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ثناء الناس على الميت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٣٦٧)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (فيمن يثنى عليـه خيرا أو شـرا مـن المـوتى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٩٧)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الثنـاء) گێڕاویـەتـەوە بە ژمارە (١٩٣١).

فمرت بهم جنازة ، فأثني على صاحبها خيرا ، فقال عمر رضي الله عنه: وجبت ، ثم مر بأخرى فأثني على صاحبها خيرا ، فقال عمر رضي الله عنه: وجبت ، ثم مر بالثالثة فأثني على صاحبها شرا ، فقال: وجبت ، فقال أبو الأسود: فقلت: وما وجبت يا أمير المؤمنين؟ قال: قلت كما قال النبي (ﷺ): أيما مسلم ، شهد له أربعة بخير، أدخله الله الجنة ، فقلنا: وثلاثة، قال: وثلاثة، فقلنا: واثنان ، قال: واثنان، ثم لم نسأله عن الواحد ))[٣٢٨]

واته: هاتمه شاری مەدینەوه ، لەو کاتەدا نەخۆشییەکی تێدا بڵاوبوو بۆوه، منیش لە لای (عومەری کوڕی خەتتاب) (خوای لێ ڕازی بێت) دانیشتم ، لەو کاتەدا تەرمێکیان هێنا، بە چاکە باس لە مردووەکە کرا، جا (عومەر) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: بۆی مسۆگەر بوو ، پاشان تەرمێکی تر تێپەڕ بوو، هەر بە چاکە باس لە مردووەکە کرا، جا (عومەر) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: بۆی مسۆگەر بوو، پاشان تەرمی سێیەم تێپەڕبوو، بە خراپە باس لە مردووەکە کرا، (عومەر) فەرمووی: بۆی مسۆگەر بوو ، جا (أبو الأسود) دەڵێ: منیش وتم: چی مسۆگەر بوو ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ فەرمووی: ئەوەم وت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێك چوار موسوڵمان شایەتی بۆ بدەن بە چاکە ، خوای پەروەردگار دەیخاتە بەهەشتەوه ، جا وتمان: ئەی سێ کەس؟ فەرمووی: سێ کەسیش ، وە وتمان: ئەی دوو کەس؟ فەرمووی: دوو کەسیش ، پاشان پرسیارمان لە بارەی شایەتیدانی یەك کەسەوە لێ نەکرد .

[٣٢٨] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ثناء الناس على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٦٨)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في الثناء الحسن على الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٩).

### ٣ ) قەدەغە کراوە لە جنێودان بە مردوو

أ- لـە دایکـە (عائیـشە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( لا تـسبوا الأمـوات ، فإنهم قد أفضوا إلى مـا قدموا ))[٣٢٩]

واتـە: جنێـو بـە مـردووان مـەدەن ، چـونکە ئـەوان ڕووبـەڕوو بوونەتـەوە لەگـەڵ کردەوەی پێـشووی خۆیـان - چ چـاك چ خـراپ ، وە بـە پێـی ئـەوە پاداشـتی خۆیـان وەردەگرن- .

ب- لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( رأیت عمرو بن عامر الخزاعي یجر قصبه في النار، وكان أول من سیب السیوب ))[٣٣٠] واتە: (عەمری کوڕی عامیری) خوزاعیم دی ،

---

[٣٢٩] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما ینهی من سب الأموات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٩٣)، هەروەها لە کتابی (الرقاق)، بابی: (سکرات الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦١٦٠)، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الصغری) دا لە کتابی (الجنائز)، لە ژێر ناونیشانی: (النهي عن سب الأموات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٣٥)، هەروەها (دارەمی) لە کتابی (السیر)، بابی: (في النهي عن سب الأموات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥١١)، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (الجنائز)، لە ژێر ناونیشانی: (فصل في الموت وما یتعلق به من راحة المؤمن - ذكر بعض العلة التي من أجلها زجر عن هذا الفعل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٧٥)، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٥٦).

[٣٣٠] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (التفسیر)، بابی: (﴿ما جعل الله من بحیرة ولا سائبة ولا وصیلة ولا حام﴾ ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٦٢٣)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنة وصفة نعیمها وأهلها)، بابی: (النار یدخلها الجبارون والجنة یدخلها الضعفاء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٣٢).

لە نـاو ئـاگری دۆزەخـدا بـوو ، ڕیخۆڵـەی خـۆی بـەناو ئاگرەکـەدا بـە کـێش دەکـرد ، چونکە ئەو یەکەم کەسێ بوو کە (سائیبە)* ی داهێناوە.

**پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ * :**

زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) دەفەرموون: جنێودان بە مردووی موسوڵمان کە فاسـقێتییەکەی ئاشـکرا نـەبووبێ حەرامـە ، بـەڵام بـێ بـڕوا و موسـوڵمانێ کـە فاسـقێتییەکەی ئاشـکرایە ، لـەلای پێـشینان جیـاوازی هەیـە ، وە خولاصەکەشـی ئەمەیە کەوا سابت بووە بە دەق کە قەدەغە کراوە لە جنێودان بە مردووان .

بـەڵام ئەگـەر بـۆ وریاکردنـەوەی موسـوڵمانان بـێ لـە هەڵـە و لادان و بیدعـەیان و بەرژەوندی تێدابێ ئەوە قەیناکا ، بەڵام ئەگەر هیچ بەرژەوەندی تێدا نـەبوو ئـەوە دروست نیە باس بکرێن .

## ٤) نەفرین کردن بە گشتی

**پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەم بارەوە لە (الأذكار) دا فەرموویەتی* :**

ئەوە بزانە بە ئیجماعی هەموو موسوڵمانان نەفرین کـردن لـە موسوڵمان حەرامـە، بەڵام دروستە نەفرین بکرێ لەو کەسانەی کە بە سیفەتێکی قێزەون ناسراون، وەك بـوترێ: نـەفرینی خـوا لـە سـتەمکاران بێـت، نـەفرینی خـوا لـە بـێ بڕوایـان بێـت، نـەفرینی خـوا لـە گـاور و جوولەکـە بێـت، نـەفرینی خـوا لـە ڕێگەدەرچـوان بێـت، نەفرینی خوا لە وێنەگران بێت.. هتد.

---

* **(سەعیدی کوڕی موسەییب) دەفەرموێ:** (سائیبە) بـەو وشـترە دەڵێن کـە هەنـدێ کـەس نەخۆش دەکەوت دەیوت: ئەگەر خوا لەم نەخۆشینە چاکی کردمەوە فیسارە، وشتر (سائیبە) بێ، واتە: مەرەخەس و بەرەڵابێ بۆ خوداوەندەکانییان، ئیتر نە سواری دەبوون و نەباریان لێ دەنا.

* (نيل الأوطار بتخريج احاديث كتاب الأذكار/ ج ١ - ص ٢٨٨).

* (نيل الأوطار بتخريج احاديث كتاب الأذكار / ج ٢ - ص ٧٥٧ - ٧٥٨).

بەڵام ئەگەر ئەم نەفرینە بوترێ بە کەسێکی دیاریکراو لەوانەی کە لەو جۆرە سیفەتە قێزەونانەیان هەیە وەك: جوولەکە، گاور، داوێن پیس، وێنەگر، دز، سووخۆر، ئەوە زاهیری فەرموودەکان وا دەردەخات کە حەرام نە بێت.

**بەڵام پێشەوا (غەزالی)** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئاماژە بە نادروستی و حەرام بوونی دەکات ، مەگەر بۆ کەسێ زانیبێتمان لەسەر کوفرو بێ بڕوایی مردووە ، ئەویش وەك: ئەبو لەهەب ، ئەبوجەهل ، فیرعەون ، هامان ، .. وە شێوەی ئەوانە

**پاشان دەفەرموێ:** چونکە نەفرین کردن دوورخستنەوەی کەسەکەیە لە ڕەحمەتی خوا و، هەروەها هیچ زانیاریەکیشمان نییە لە بارەی خاتیمەی کردەوەی ئەو فاسقە یان ئەو بێ بڕوایەوە

**هەروەها دەفەرموێ:** بەڵام ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی لێکردوون ، ئەوە دروستە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) زانیویەتی کە لەسەر بێ بڕوایی دەمرن .

# بەشی حەوتەم

# سەردانی گۆڕستان

## یەکەم: حیکمەت و سوودەکانی سەردانی گۆڕستان

### ١) پاڕانەوە بۆ مردووەکان:

لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان رسول الله (ﷺ) - كلما كان ليلتها من رسول الله (ﷺ) - يخرج من آخر الليل إلى البقيع ، فيقول: ... ، اللهم اغفر لأهل بقيع الغرقد ))[٣٣١]

واتە: هەموو جارێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نۆرەشەوی (عائیشە) دا، لە کۆتایی شەودا دەردەچوو بۆ گۆڕستانی (بەقیع) و، دەیفەرموو: ... ، خوایە لە خەڵکی گۆڕستانی (بقيع الغرقد) خۆشبە .

### ٢) پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرتن:

چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إني كنت نهيتكم عن زيارة القبور ، فزوروها ، فإنها تذكركم الآخرة ))[٣٣٢] واتە: لە پێشدا نەهیم لێکردن کەوا سەردانی

---

[٣٣١] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقال عند دخول القبور والدعاء لأهلها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٥٢)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإستغفار للمؤمنين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣٨).

[٣٣٢] **صحيح** - (ئەحمەد) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند الخلفاء الراشدين - مسند علي بن أبي طالب رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٩٢) ، هەروەها (نەسائی) لە (السنن الصغرى) دا لە کتابی (الأشربة) ، بابی : (الإذن في شيء منها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٦٥٢) ، هەروەها (عبدالرزاق) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في زيارة القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٤٩٦)، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الكبير) دا ، بابی : (الباء : بلال بن الحارث المزني - بريدة

گۆڕستان بکەن ، بەڵام لەمەو دوا سەردانی بکەن ، چونکە بەڕاستی دوارۆژتان بیردەخاتەوە.

لە گێڕانەوەی (ترمذی) دا دەفەرموێ: (( قد كنت نهيتكم عن زيارة القبور ، فقد أذن لمحمد في زيارة قبر أمه ، فزوروها فإنها تذكر الآخرة ))[٢٣٣]

واتە : لەمەوپێش جاران قەدەغەم لێ دەکردن لە دەیدەنی گۆڕستان ، بەڵام ئەوا ڕێگەی من دراوە کە دیدەنی گۆڕی دایکم بکەم ، کەوابوو ئێوەش لەمەودوا دیدەنی گۆڕستان بکەن ، چونکە دیمەنی گۆڕو گۆڕستان یادی قیامەت تازە دەکاتەوە !

---

بن الحصيب الأسلمي يكنى أبا عبد الله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٣٨) ، هەروەها (ئەبویەعلا) لە موسنەدەکەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند علي بن أبي طالب رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٨ ، ص٣١٠ ، ج ٥٦٥٢) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٢٤٧٥) ، و (صحيح السيرة النبوية/ ص ٢٣) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[٢٣٣] صحيح - (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الرخصة في زيارة القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٥٤) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الأشربة والحد فيها) ، بابی : (الرخصة في الأوعية بعد النهي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٢٥٦) ، هەروەها (ئەبی حەنیفە) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (روایتە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩١) ، هەروەها (ابن الجعد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (قيس بن الربيع الأسدي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٨١) ، هەروەها (محمد بن الحسن) لە کتێبی (الآثار) دا ، بابی : (زيارة القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٢، ص ٣٧٠، ح ١٠٥٤) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٣، ح ٣٥٤٤) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٤٢٧٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

**٣) یادی مردن تازە دەکاتەوە:**

لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( ... ، فزوروا القبور فإنها تـذكر الموت ))[٢٣٤] واتـە : جا ئێوەش دیـدەنی گۆڕسـتان بکەن ، چونکە یادی مردن تازە دەکاتەوە .

**بەڵام سەبارەت بە ئافرەتان مەکروهە کەوا سەردانی گۆڕستان بکەن:**

لـە (ئیبنوعـەبباس) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( لعن رسول الله (ﷺ) زائرات القبـور ))[٢٣٥] واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) نـەفرینی کرد لەو ئافرەتانەی کەوا سەردانی گۆڕستان دەکەن.

لەبەر ئەوەی تەحەممولیان کەمە ، بێگومان دەکەونە ناو شتە حەرامەکانـەوە ، بـە تایبەتی کەسێ لە خۆی بـدا و شیوەن و زاری بکـات ، ئـەوە دەبێتـە هـۆی فیتنـە و دوور کەوتنەوە لە ئەصڵی مەبەست کە بیرکردنەوەیە لە ئاخیرەت.

**پێشەوا (قـرطبي) فەرموویـەتی:** ئـەو نەفرینـە کـە کـراوە لـە فەرموودەکـەدا بـۆ ئـەو ئافرەتانەیە کـە زۆر دەچـنە سـەر گۆڕسـتان ، لەبـەر ئـەوەی زاراوەی حەدیـسەکە وا

---

[٢٣٤] **صـحیح** - (موسـلیم) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (اسـتئذان الـنبي (ﷺ) ربـە عـز وجـل في) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٥٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في زیارة القبـور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٣٤) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (زیارة قبر المشرك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في زیـارة قبور المشرکین) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٧٢).

[٢٣٥] **حسن** - (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في زیارة النساء القبور) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٣٢٣٦) ، هەروەها (ترمذی) لە کتـابی (الصلاة) ، بـابی : (مـا جاء في کراهیـة ان یتخـذ علـی القبر مـسجدا) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣٢٠) ، هـەروەها (نەسـائی) لـە (الـسنن الـصغری) دا لـە کتـابی (الجنائز) دا لـە ژێـر ناونیـشانی : (التغلیـظ في اتخاذ الـسرج علـی القبـور) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٠٤٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (مشكاة المصابیح / ج ١ - ح ٧٤٠) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

دەگەیەنێت . وە لەوانەشە هۆکەی ئەوە بێت ئەو ئافرەتە ئەگەر ئەوەندە بچێتە سەر گۆڕستان خۆی دەڕازێنێتەوە و مافی مێردەکەی دەفەوتێنێ ، هەروەها لەو شین و شەپۆڕەی کە ئافرەت دەیکات ، وە زۆر شتی تر ، وە وتراوە: ئەگەر چوونە سەر گۆڕستان لەوانە دووربوون ، ئەوە ئیتر لاری لە ڕێ دانیان نیە ، چونکە یادی مردن بۆ ئافرەت و پیاو پێویستە .

**ڕای زانایان لەم بارەیەوە:**

**ئیمام (مالیك) و هەندێ لە (حەنەفیەکان) و گێڕانەوەیەکیش لە ئیمام (ئەحمەد) و بەشی زۆری زانایان:** ڕێیانداوە کە ئافرەت بچێتە سەر گۆڕستان بەپێی حەدیسەکەی دایکە (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت) کەوا فەرمووی: (( قلت: كيف أقول لهم يا رسول الله (ﷺ)؟ ))[٢٣٦] واتە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! ئەگەر چووم بۆ سەردانی مردووان پێیان بڵێم چی؟

هەروەها لە (عبدالله) ی کوڕی (ئەبی مەلیکە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن عائشة أقبلت ذات يوم من المقابر فقلت لها: يا أم المؤمنين ، من أين أقبلت ؟ قالت: من قبر أخي عبد الرحمن بن أبي بكر ، فقلت لها: أليس كان رسول الله (ﷺ) نهى عن زيارة القبور ؟ قالت: نعم ، كان قد نهى ، ثم أمر بزيارتها))[٢٣٧] واتە : ڕۆژێکیان دایکە عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) لە گۆڕستان

---

[٢٣٦] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقال عند دخول القبور والدعاء لأهلها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٥٣)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإستغفار للمؤمنين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣٦)، هەروەها لە کتابی (عشرة النساء)، بابی: (الغيرة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٩٧٣) و (٣٩٧٤).

[٢٣٧] **صحيح** - (حاکم) لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٢٧) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما ورد في دخولهن في عموم قوله فزوروها)

دەهاتەوە ، وتم: ئەی دایکی باوەڕداران لە کوێ هاتیتەوە ؟ فەرمووی: لەسەر گۆڕی (عبدالرحمن ی کوڕی ئەبوبەکر) ی برام بووم ، دەڵێ: منیش پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوونە سەر گۆڕستانی قەدەغە نەکردبوو ؟ فەرمووی: با ، لە پێشەوە قەدەغەی کردبوو ، بەڵام دوایی فەرمانی دا بە چوونە سەر گۆڕ .

## دووەم: سوننەتەکانی سەردانی گۆڕو گۆڕستان

### ١) ئەوەی دەوترێ لە کاتی سەردانی کردنی گۆڕستاندا:

أ- لە دایکە (عائیشە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی:

(( كان رسول الله (ﷺ) - كلما كان ليلتها من رسول الله (ﷺ) - يخرج من آخر الليل إلى البقيع ، فيقول: السلام عليكم دار قوم مؤمنين ، وأتاكم ما توعدون غدا ، مؤجلون ، وإنا، إن شاء الله ، بكم لاحقون ، اللهم اغفر لأهل بقيع الغرقد ))[٢٣٨]

واتە: هەموو جارێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نۆرەشەوی (عائیشە) دا، لە کۆتایی شەودا دەردەچوو بۆ گۆڕستانی (بەقیع) و، دەیفەرموو: **(السلام عليكم دار قوم مؤمنين، وأتاكم ما توعدون غدا، مؤجلون، وإنا، إن شاء الله، بكم لاحقون، اللهم، اغفر لأهل بقيع الغرقد)** سەلامتان لێ بێت ئەی باوەڕدارانی ئەم مەنزڵگایە ، ئێمە و ئێوەش بۆ ئەوەی بەڵێنمان پێدراوە دواخراوین ، **(إن شاء الله)** خوا حەزکا ئێمەش بە ئێوە دەگەین ، خوایە لە خەڵکی گۆڕستانی **(بقيع الغرقد)** خۆشبە .

---

گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٧٨٨) ، هەروەها (ئەبی یەعلا) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند عائشة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٧٤٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (تلخيص احكام الجنائز/ ص ٧٩) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[٢٣٨] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقال عند دخول القبور والدعاء لأهلها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٥٢)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإستغفار للمؤمنين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣٨).

ب- له دایکه (عائیشه) وه (خوای لیّ ڕازی بیّت) دەگیّڕنەوه کەوا پیّغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( أتاني جبريل فقال: إن ربك يأمرك أن تأتي أهل البقيع فتستغفر لهم ، قالت: قلت: كيف أقول لهم يا رسول الله (ﷺ)؟ قال: قولي: السلام على أهل الديار من المؤمنين والمسلمين ، ويرحم الله المستقدمين منا والمستأخرين ، وإنا إن شاء الله بكم للاحقون))[239]

واته: (جوبرەئیل) هات بۆ لام فەرمووی: پەروەردگارت فەرمانت پیّ دەکا که بچیت بۆ لای گۆڕنشینەکانی گۆڕستانی (بەقیع) و بۆشیان بپاڕێیتەوه و داوای لیّ خۆشبوونیان بۆ بکەی ، (عائیشه) دەفەرمویّ: وتم: ئەی پیّغەمبەری خوا (ﷺ)! ئەگەر چووم بۆ سەردانی مردووان پیّیان بڵیّم چی؟ فەرمووی: بڵیّ: **(السلام على أهل الديار من المؤمنين والمسلمين، ويرحم الله المستقدمين منا والمستأخرين، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون)** سڵاو له خەڵکی ئەم مەنزلگایه، له باوەڕداران و موسوڵمانیان، وه ڕەحمەتی خوا له پیّشینان و پاشینانمان، ئیّمەش خوا حەزکا هاکا نیشتین پیّتانەوه و هاتین بۆلاتان !

ج- له (ئەبوهورەیره) وه (خوای لیّ ڕازی بیّت) دەگیّڕنەوه کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) أتى المقبرة ، فقال: السلام عليكم دار قوم مؤمنين ، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون ))[240]

---

[239] **صحيح** - (موسلیم) له کتابی (الجنائز)، بابی: (ما يقال عند دخول القبور والدعاء لأهلها) گێڕاویەتەوه به ژماره (٢٢٥٣)، هەروەها (نەسائی) له کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإستغفار للمؤمنين) گێڕاویەتەوه به ژماره (٢٠٣٦)، هەروەها له کتابی (عشرة النساء)، بابی: (الغيرة) گێڕاویەتەوه به ژماره (٣٩٧٣) و (٣٩٧٤).

[240] **صحيح** - (موسلیم) له کتابی (الطهارة)، بابی: (استحباب إطالة الغرة والتحجيل في الوضوء) گێڕاویەتەوه به ژماره (٥٨٣)، هەروەها له (تحفة الأشراف) دا به ژماره (١٤٠٠٨) هاتووه.

واتـه: جارێکیـان پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هاتـه سـەردانی گۆڕسـتان و فـەرمووی: **(السلام عليكم دار قوم مؤمنين، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون)** سەلامتان لێ بێت ئـەی باوەڕدارانی ئەم مەنزلگایە ، ئێمـەش خـوا حـەزکا هاکا نیـشتین پێتانـەوە و هـاتین بۆلاتان !

د- له (سولەیمان) ی کوڕی (بورەید) ە وە ئەویش لە باوکییەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان رسول الله (ﷺ) يعلمهم إذا خرجوا إلى المقابر، فكان قائلهم يقول - في رواية أبي بكر: السلام على أهل الديار، - وفي رواية زهير: السلام عليكم أهل الديار من المؤمنين والمسلمين، وإنا إن شاء الله للاحقون، أسأل الله لنا ولكم العافية ))[٢٤١]

واته: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری دەکردن کاتێك دەردەچوون بۆ گۆڕستان کە بڵێن: **(السلام عليكم أهل الديار من المؤمنين والمسلمين، وإنا، إن شاء الله للاحقون، أسأل الله لنا ولكم العافية)** سڵاوتان لێ بێ ئەی دانیشتوانی ئەم مەنزلگایە ، لـە بـاوەڕداران و موسڵمانتـان ، ئێمەش خوا حەزکا هاکا نیـشتین پێتانـەوە و هـاتین بۆلاتـان، داوای ئاسوودەیی و خێر و خۆشی لە خوا دەکەم، بۆ خۆشمان و بۆ ئێوەش.

**پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ [*] :**

موستەحەببە بۆ ئەوکەسەی سەردانی گۆڕستان دەکات کـەوا قورئـان زۆر بخوێنـێ و زیکری خوا زۆر بکات ، وە زۆر بپاڕێتەوە بۆ ئـەهلی ئـەو گۆڕسـتانە و، وە سـەرجەم مردووی موسوڵمانان بە گشتی .

---

[٢٤١] صحيح - (موسليم) لـه كتـابی (الجنـائز)، بـابی: (مـا يقـال عنـد دخـول القبـور والـدعاء لأهلها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٥٤)، هـەروەها (نەسـائی) لـە كتـابی (الجنـائز)، بـابی: (الأمـر بالإسـتغفار للمؤمنين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣٩)، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء فيما يقال إذا دخل القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٤٧).

[*] (نيل الأوطار بتخريج احاديث كتاب الأذكار / ج ١ - ص ٣٩٤).

وە موستەحەببە کەوا سەردانی گۆڕستان زۆر بکات و ، وە زۆر لەلای گۆڕی پیاوچاکان و ئەهلی فەزڵدا ڕابوەستێ و بمێنێتەوە.

**٢) قەدەغەکردن لەو شتانەی کە کردنیان گوناهە:**

أ- لە (ئەنەس) ی کوڕی (مالیك) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( مر النبي (ﷺ) بامرأة تبكي عند قبر ، فقال: اتقي الله واصبري ..))[٣٤٢] واتە: ئافرەتێ لەسەر گۆڕی منالێکی خۆی دەگریا ، جا پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەوە ڕەت بوو پێی فەرموو: لە خوا بترسە و دان بە خۆتا بگرە و ئارام بگرە لەبەر باری خوادا .

ب- لە (بەشیر) ی کوڕی (مەعبەد) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( بنا أماشي رسول الله (ﷺ).. فأتى على قبور المشركين فقال: لقد سبق هؤلاء خيرا كثيرا ، ثم أتى على قبور المسلمين فقال: لقد أدرك هؤلاء خيرا

---

[٣٤٢] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (قول الرجل للمرأة عند القبر: اصبري) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥٢)، هەروەها لە هەمان کتابدا، بابی: (زيارة القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٨٣)، هەروەها لە هەمان کتابدا، بابی: (الصبر عند الصدمة الأولى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٠٢)، هەروەها لە کتابی (الأحكام)، بابی: (ما ذكر أن النبي لم يكن له بواب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٥٤)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (في الصبر على المصيبة عند الصدمة الأولى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٦)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الصبر عند الصدمة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٢٤)، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء أن الصبر في الصدمة الأولى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٨٨)، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز)، بابی: (الأمر بالإحتساب والصبر عند نزول المصيبة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٦٨).

كثيرا، فإذا رجل عليه سبتيتان يمشي بين القبور، فقال: يا صاحب السبتيتين ، ألق سبتيتك ، فخلع نعليه ))[٢٤٣]

واتە: جارێكیان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ڕێم دەكرد ، پاشان ڕۆیشت بۆ لای گۆڕی بێ باوەڕ و هاوبەش پەیداكەران ، فەرمووی: ئا ئەمانە خێر و چاكەیەكی زۆریان لە دەستچووە ، پاشان هات بۆ لای گۆڕی باوەڕداران و فەرمووی: ئا ئەمانە چاكەیەكی گەورەیان دەست كەوتووە ، (بەشیر) دەڵێ: لەو كاتەدا كە ڕێی دەكرد چاوی كەوت بە پیاوێك بە ناو گۆڕەكاندا ڕێی دەكرد نەعلەكانیشی لە پێدایە ، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: ئەی ئەوكەسەی كە نەعلی (سبتیت)* لە پێدایە نەعلەكانت دابنێ ، كابراش دەستبەجێ نەعلەكانی داكەند و فڕێیدان .

لەلای ئیمام (ئەحمەد) هاتووچۆ كردن بەناو گۆڕستاندا بە پێڵاوی (سەبتی) یەوە كەراهەتی بووە .

**(خطابی) فەرموویەتی:** لەوە دەچێت پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر خۆ بەزلزانینی ئەوكەسە پێی ناخۆش بووبێ ، چونكە پێڵاوی سەبتی ئەوانەی كە لە دونیادا ئەهلی ڕابواردن و خۆش گوزەرانی بوون لەپێیان دەكرد ، پاشان فەرموویەتی: لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) حەزی كردووە كە بچێتە ناو گۆڕستانەوە بە پۆشاكی مام ناوەندو جلی ئەوكەسانەی كە خۆ بەكەم دەگرن .

---

[٢٤٣] **صحيح** - (بوخاری) لە (الأدب المفرد) دا، بابی: (زحم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٧٥)، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (المشي في النعل بين القبور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٣٠)، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (كراهية المشي بين القبور في النعال السبتية) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٩٤٧)، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز)، بابی: (ما جاء في خلع النعلين في المقابر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٦٨).

* **(سەبتی)** جۆرێك نەعلە كەلە پێستە دروست دەكرێت و پێستەكەی بەجۆرێك (گەڵای دار دەباغ) دەكرێت.

وە کەراهەتەکەی ئیمام (ئەحمەد) بۆ کەسێکە کە بەبێ بەهانە لە پێیان بکات و بچێتە ناو گۆڕستانەوە ، کەواتە ئەگەر کەسێك بەهانەی هەبوو ئەوە ئەو کەراهەتە نامێنێ .

وە هەندێ نەزان و نەفام لەکاتی سەردان کردنی گۆڕی مردووەکانیاندا دەست دەهێنن بە گۆڕەکەدا و ماچی دەکەن و بە دەوریدا دە سوڕێنەوە ، بەڕاستی ئەم کارەیان لە بیدعە خراپەکانە و حەرامە ، هەر بۆیە پێویستە لەسەر ئەوکەسەی کە سەردانی گۆڕستان دەکا قەدەغە لەم جۆرە کارانە بکاو نەیەڵێ زیارەتکار ئەم کارە ئەنجام بدات ، چونکە ئەو کارە تەنها بەرامبەر کەعبەی پیرۆز دەکرێ ، وە نابێ گۆڕی هیچ کەسی تری لەسەر پێوانە بکرێت .

**جا (ئیبنوقەیم) لەباسی جیاوازی نێوان سەردانی کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ گۆڕستان و هاوبەشدانەراندا فەرموویەتی:** پێغەمبەر (ﷺ) کە بچوایە سەر گۆڕستان بۆ ئەوە دەچوو بپاڕێتەوە بۆ مردووەکان و بەزەیی بە حاڵیان بێتەوە و داوای لێبووردنیان بۆ بکات ، بەڵام هاوبەشدانەرەکان بە پێچەوانەوە بوون ، بۆ ئەوە دەچوونە سەر گۆڕستان کە لێیان بپاڕێنەوە و سوێندیان پێ بخۆن و داوای بەجێ هێنانی کاریان لێ بکەن و پەنایان بۆ ببەن و ڕوویان تێ بکەن ، پێچەوانەی ڕێ و شوێنی ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە ڕێ و ڕەوشتی ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) ڕێی یەکتاپەرستی و چاکە کردنە لەگەڵ مردوواندا ، بەڵام ڕێ و شوێنی ئا ئەوانە هاوبەش دانانە بۆ خواو خراپە کردنە لەگەڵ خۆیان و مردوواندا .

**٣) گریان و ترسان لە کاتی تێ پەڕین بە لای گۆڕی ستەمکار و گوناهباراندا:**

لە (عبدالله) ی کوڕی (عومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( أن رسول الله (ﷺ) قال لأصحابه: لا تدخلوا على هؤلاء المعذبين إلا أن تكونوا باكين ، فإن لم تكونوا باكين فلا تدخلوا عليهم ، لا يصيبكم ما

أصابهم))[٢٤٤] واته: پێغەمبەری خوا (ﷺ) و یارانی ، کاتێ - دەگەنە خاکی (حیجر) ، کە ناسراوە بە وڵاتی (ئەموود) ی هۆزی صاڵح پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێ) - بە یارانی دەفەرموێ: بە گریانەوە نەبێ مەچنە ناو ئەم سزابارانەوە ، تەنانەت ئەگەر گریانتان نەدەهات ئەوە مەڕۆنە ناویان ، نەبادا ئێوەش بە دەردی ئەوان بچن .

**کەواتە ئەوانەی بۆ سەردانی کردنی گۆڕستان دەچن چەند جۆرێکن:**

**یەکەم:** دەچن بۆ ئەوەی بۆ مردووەکە بپاڕێنەوە .

**دووەم:** یا دەچن بە خاتری مردووەکە دەپاڕێنەوە .

**سێیەم:** یا دەچن لای مردووەکە دەپاڕێنەوە ، لەبەر ئەوەی وا دەزانن کە پاڕانەوە لای ئەو مردووە چاکترە لە پاڕانەوەی ناو مزگەوت و شوێنەکانی تر .

---

[٢٤٤] **صحیح** - (بوخاری) لە کتابی (الصلاة)، بابی: (الصلاة في مواضع الخسف والعذاب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٣٣)، هەروەها لە کتابی (أحادیث الأنبیاء)، بابی: (قول الله تعالی ﴿وإلی ثمود أخاهم صالحا﴾) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٣٨٠)، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الزهدوالرقائق)، بابی: (لا تدخلوا مساکن الذین ظلموا أنفسهم، إلا أن تکونوا باکین) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٣٨٩).

## چەند بابەتێکی تایبەت

### یەکەم: سەردانی پێغەمبەر (ﷺ) لە گۆڕی دایکی

لە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( زار النبي (ﷺ) قبر أمه ، فبكى وأبكى من حوله ، فقال: استأذنت ربي في أن أستغفر لها فلم يؤذن لي ، واستأذنته في أن أزور قبرها فأذن لي ، فزوروا القبور فإنها تذكر الموت))[٢٤٥]

واتە : ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت بۆ سەردانی گۆڕی دایکی ، لەوێ گریاو ئەو کەسانەشی لـە دەوری بـوون هێنانیـە گریـان ، جـا فـەرمووی: داوام لـەخوا کـرد کـە ڕێگەم بدات بۆ دایکم بپاڕێمـەوە بـەڵام ڕێگـەی ئـەوەی نـەدام ، وە داوام لێکـرد کـە دیدەنی گۆڕەکەی بکەم بۆ ئەمە ڕێگەی دام ، جا ئێـوەش دیـدەنی گۆڕسـتان بکـەن، چونکە یادی مردن تازە دەکاتەوە .

---

[٢٤٥] صحيح - (موسـليم) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (استئذان النبي (ﷺ) ربـه عـز وجـل في) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٥٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في زيارة القبـور) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٣٤) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (زيارة قبر المشرك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٣٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في زيارة قبور المشركين) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٧٢).

## دووەم: لێپرسینەوە و سزای ناو گۆڕ حەقە

ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەت لەسـەر ئـەوە ڕێکـن کـە هـەموو مرۆڤێـك لێـی دەپرسێتەوە دوای مردنی ، جا ئەوکەسە بخرێتە گۆڕەوە یان نەخرێتـە گـۆڕ ، هەتا ئەگەر درندەش خواردبێتی یا سووتابێ و بووبێ بە خۆڵـەمێش یـا بـە هـەوادا بـڵاو بووبێتەوە ، یـا خنکابـێ و لـە ئـاودا بێـت ، هـەر پرسیاری لێ دەکرێتـەوە دەربـارەی کردەوەکانی و پاداشتی دەدرێتەوە بەخێر ئەگـەر خێـری کردبـێ و بـە شـەڕ ئەگـەر خراپەی کردبێ ، وە سزادان و پاداشت دانەوە لەسەر ڕۆح و لاشە دەبێت بەیەکەوە، نەك وەك (قادیانیەکان) دەڵێن: تەنها ڕۆحە .

١- لـە (بـەڕڕاء) ی کـوڕی (عازیـب) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إذا اقعد المؤمن في قبره أتـي ، ثم شهد أن: لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ، فذلك قوله: ﴿يثبت الله الـذين آمنـوا بالقول الثابت﴾ ))[٢٤٦]

واتــە : موســوڵمان کاتــێ دەینێــژن و خەڵکەکـە بـەجێی دەهـێڵن لـە گۆڕەکـەیا دایدەنیشێنن و دوو مەلائیکە بۆ تاقیکردنەوە دێنە سەری ، ئـەویش خـوای گـەورە تەوفیقی دەداو دەڵێ: (لا إلـه إلا الله وأن محمـدا رسـول الله) شایەتی دەدەم کـە هـەر خـوا خوایــە و هــیچ پەرســتراوێکی نیــە جگــە لــە (الله) ، وە شـایەتی دەدەم کـە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ، جا مەبەست ئـەم پرسـیارو وەڵامەیـە ، کـە خـوای گەورە لە قورئانا دەفەرموێ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ

---

[٢٤٦] صحيح – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في عذاب القبر) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (١٣٧٤).

﴿ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ﴾ (إبـراهيم/ ٢٧) واتـە: خـوای گـەورە ئەوانـەی باوەڕیـان هێناوە پایەدار دەكات لەسـەر گوفتـاری بـەجێ و دروسـتیان لـە ژیانی دونیـادا ، لـە سەرەمەرگ و قیامەتیشدا (باوەڕی دامەزراو فریایان دەكەوێت) و گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بە ئیمانەوە دەمرن .

لـە گێڕانـەوەی (موسـلیم) و (نەسـائی) دا دەفـەرموێ: (( ﴿يثبـت الله الـذين آمنـوا بالقول الثابت﴾ ، قال: نزلت في عذاب القبر ، فيقال له: من ربك ؟ فيقول: ربي الله ، ونبيي محمد (ﷺ) ، فذلك قوله عز وجل: ﴿يثبت الله الذين آمنوا بـالقول الثابـت في الحياة الدنيا ، وفي الآخرة﴾ ))[٣٤٧]

واتـە: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ﴾ ، فەرمووی: ئەم ئایەتە سەبارەت بە سزای ناو گۆڕ هاتە خوارەوە ، موسـوڵمان كاتـێ دەمرێ و دەینێژن ، دوو مەلائیكە بۆ تاقیكردنەوە ، دێنە سەری و دایدەنیشێنن و لێی دەپرسـن: خـوات كـێ یـە؟ پێغەمبـەرت كـێ یـە؟ لەسەرچی ئـایینێكی ؟ خـوای گەورەیش ئاڕاستـەی دەكاو دەڵێ: خوای من (الله) یە و ، (موحەممـەد) پێغەمبـەرمـە ، جا مەبەست ئەم پرسیارو وەڵامەیـە ، كـە لـە قورئانـدا دەفـەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ﴾ (إبراهيم/ ٢٧)

٢- لـە (ئەنـەس) ی كـوڕی (مالیـك) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە كـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (( إن العبـد إذا وضـع في قـبره

---

[٣٤٧] صحيح - (موسليم) لە كتـابی (الجنـة وصفة نعيمها وأهلها) ، بـابی : (عـرض مقعـد الميت مـن الجنة أو النار عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٤٨) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز) ، بـابی: (عذاب القبر) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٢٠٥٦) ، هـەروەها (ابـن ماجـە) لـە كتـابی (الزهـد) ، بـابی : (ذكر القبر والبلى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٦٩).

وتولى عنه أصحابه ، وإنه ليسمع قرع نعالهم ، أتاه ملكان فيقعدانه ، فيقولان : ما كنت تقول في هذا الرجل لمحمد (ﷺ) ، فأما المؤمن ، فيقول: أشهد أنه عبد الله ورسوله ، فيقال له: انظر إلى مقعدك من النار قد أبدلك الله به مقعدا من الجنة ، فيراهما جميعا - قال قتادة: وذكر لنا: أنه يفسح له في قبره ، ثم رجع إلى حديث أنس - قال: وأما المنافق والكافر فيقال له: ما كنت تقول في هذا الرجل ؟ فيقول: لا أدري كنت أقول ما يقول الناس ، فيقال: لا دريت ولا تليت ، ويضرب بمطارق من حديد ضربة ، فيصيح صيحة يسمعها من يليه غير الثقلين ))[٢٤٨]

واته : بەندە کاتێ دای دەنێن لەناو گۆڕەکەیدا و هاوڕێکانی بەرەودوا دەگەڕێنەوە هێشتا گوێی لە چرپەی پێڵاوەکانیانە ، کە دوو مەلائیکە دەگەنە سەری و دای دەنیشێنن و پێی دەڵێن: باوەڕت چییە دەربارەی ئەم پیاوە (واتە: محمد) (ﷺ)؟ فەرمووی: جا ئەوەی ئیماندارێ پێی دەڵێ: ئاگادارم کە ئەم پیاوە بەندەو پێغەمبەری خوایە ، ئەوجا دەوترێ پێی: ئا ئەوە جێگەی تۆ بوو لەناو ئاگری دۆزەخدا سەیریکە خوا بۆی گۆڕیویتەوە بەو شوێنە خۆشە لە بەهەشتا ، جا ئەویش هەردوو جێگەکە بە چاوی خۆی دەبینێ ، بەڵام بێ بڕوا یا فەرمووی: ناپاك و دووڕوو کە هەمان پرسیاری لێ دەکەن دەڵێ: ئاگام لە هیچ نیە ، ئەوەندە هەیە سەیری دەمی خەڵکم کردووە ، ئەوان چییان وتووە ئەوەم وتووە ! ئەوجا دەڵێن: دەك هەر نەزانیت ! ئیتر یەك گورزی ئاسنینی لێ دەدەن ، ئەوسا یەك قیژە

---

[٢٤٨] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في عذاب القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٧٤) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنة وصفة نعيمها وأهلها) ، بابی : (عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٤٨) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (السنة) ، بابی: (في المسألة في القبر وعذاب القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٧٥٢) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (مسألة الكافر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٤٩).

دەکا هەرچی لە دەورو بەریەتی دەیبیستێ ، تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبێ ، نایبیستن !

٣- لە (بەڕڕاء) ی کوڕی (عازیب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( خرجنا مع النبي (ﷺ) ، في جنازة رجل من الأنصار ، فانتهينا إلى القبر ، ولما يلحد ، فجلس رسول الله (ﷺ) ، وجلسنا حوله ، كأن على رءوسنا الطير ، وفي يده عود ينكت في الأرض ، فرفع رأسه ، فقال: استعيذوا بالله من عذاب القبر مرتين ، أو ثلاثا ، ثم قال: إن العبد المؤمن إذا كان في انقطاع من الدنيا وإقبال من الآخرة ، نزل إليه ملائكة من السماء بيض الوجوه ، كأن وجوههم الشمس ، معهم كفن من أكفان الجنة ، وحنوط من حنوط الجنة ، حتى يجلسوا منه مد البصر ، ثم يجيء ملك الموت ، عليه السلام ، حتى يجلس عند رأسه ، فيقول: أيتها النفس الطيبة، اخرجي إلى مغفرة من الله ورضوان . قال: فتخرج تسيل كما تسيل القطرة من في السقاء ، فيأخذها ، فإذا أخذها لم يدعوها في يده طرفة عين حتى يأخذوها ، فيجعلوها في ذلك الكفن ، وفي ذلك الحنوط ، ويخرج منها كأطيب نفحة مسك وجدت على وجه الأرض ، قال: فيصعدون بها ، فلا يمرون ، يعني بها ، على ملإ من الملائكة، إلا قالوا: ما هذا الروح الطيب ؟ فيقولون: فلان بن فلان ، بأحسن أسمائه التي كانوا يسمونه بها في الدنيا ، حتى ينتهوا بها إلى السماء الدنيا ، فيستفتحون له ، فيفتح لهم فيشيعه من كل سماء مقربوها إلى السماء التي تليها ، حتى ينتهى به إلى السماء السابعة ، فيقول الله عز وجل: اكتبوا كتاب عبدي في عليين ، وأعيدوه إلى الأرض ، فإني منها خلقتهم ، وفيها أعيدهم ، ومنها أخرجهم تارة أخرى . قال: فتعاد روحه في جسده ، فيأتيه ملكان ، فيجلسانه ، فيقولان له: من ربك ؟ فيقول: ربي الله ، فيقولان له: ما دينك ؟ فيقول: ديني الإسلام ، فيقولان له: ما هذا الرجل الذي بعث فيكم؟ فيقول: هو رسول الله (ﷺ)، فيقولان له: وما علمك؟ فيقول: قرأت كتاب الله ، فآمنت به وصدقت ، فينادي مناد في السماء: أن صدق عبدي ، فأفرشوه من الجنة ،

وألبسوه من الجنة ، وافتحوا له بابا إلى الجنة . قال: فيأتيه من روحها ، وطيبها ، ويفسح له في قبره مد بصره . قال: ويأتيه رجل حسن الوجه ، حسن الثياب ، طيب الريح ، فيقول: أبشر بالذي يسرك ، هذا يومك الذي كنت توعد ، فيقول له: من أنت؟ فوجهك الوجه يجيء بالخير ، فيقول: أنا عملك الصالح ، فيقول: رب أقم الساعة حتى أرجع إلى أهلي ، ومالي . قال: وإن العبد الكافر إذا كان في انقطاع من الدنيا وإقبال من الآخرة ، نزل إليه من السماء ملائكة سود الوجوه ، معهم المسوح ، فيجلسون منه مد البصر ، ثم يجيء ملك الموت ، حتى يجلس عند رأسه ، فيقول: أيتها النفس الخبيثة ، اخرجي إلى سخط من الله وغضب . قال: فتفرق في جسده ، فينتزعها كما ينتزع السفود من الصوف المبلول ، فيأخذها ، فإذا أخذها لم يدعوها في يده طرفة عين حتى يجعلوها في تلك المسوح ، ويخرج منها كأنتن ريح جيفة وجدت على وجه الأرض ، فيصعدون بها ، فلا يمرون بها على ملأ من الملائكة ، إلا قالوا: ما هذا الروح الخبيث؟ فيقولون: فلان بن فلان بأقبح أسمائه التي كان يسمى بها في الدنيا ، حتى ينتهى به إلى السماء الدنيا ، فيستفتح له ، فلا يفتح له ، ثم قرأ رسول الله (ﷺ): ﴿لا تفتح لهم أبواب السماء ولا يدخلون الجنة حتى يلج الجمل في سم الخياط﴾ ، فيقول الله عز وجل: اكتبوا كتابه في سجين في الأرض السفلى ، فتطرح روحه طرحا . ثم قرأ : ومن يشرك بالله ، فكأنما خر من السماء فتخطفه الطير أو تهوي به الريح في مكان سحيق ، فتعاد روحه في جسده ، ويأتيه ملكان ، فيجلسانه ، فيقولان له: من ربك ؟ فيقول: هاه هاه لا أدري ، فيقولان له: ما دينك؟ فيقول: هاه هاه لا أدري ، فيقولان له: ما هذا الرجل الذي بعث فيكم؟ فيقول: هاه هاه لا أدري ، فينادي مناد من السماء أن كذب ، فافرشوا له من النار ، وافتحوا له بابا إلى النار ، فيأتيه من حرها ، وسمومها ، ويضيق عليه قبره حتى تختلف فيه أضلاعه ، ويأتيه رجل قبيح الوجه ، قبيح الثياب ، منتن الريح ، فيقول: أبشر

بالذي يسوءك ، هذا يومك الذي كنت توعد ، فيقول: من أنت؟ فوجهك الوجه يجيء بالشر ، فيقول: أنا عملك الخبيث ، فيقول: رب لا تقم الساعة ))[٣٤٩]

واته: لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەرچووین بە شوێن جەنازەی پیاوێك لە (ئەنصار)، جا كە گەیشتینە لای گۆڕەكەی هێشتا شەق (لەحەد) نەكرابوو ، جا پێغەمبەری خوا ( ﷺ) دانیشت و ئێمەیش بە دەروبەریدا دانیشتین ، وەكو باڵندە بە سەر سەرمانەوە نیشتبێتەوە ، وە دارێكی بە دەستەوە بوو لە زەوی دەدا ، جا سەری بەرز كردەوە و فەرمووی: پەنا بگرنە خوا لە سزای ناو گۆڕ ، دووجار یان سێ جار ئەم فەرمایشتەی دووبارە كردەوە ، پاشان فەرمووی: بەڕاستی بەندەی باوەڕدار ئەگەر لە دنیا ببڕێت و ڕوو لە دوا ڕۆژ بكات ، چەند مەلائیكەیەكی لە ئاسمانەوە بۆ لا دادەبەزێت، دەم وچاویان سپییە و ڕوویان وەكو خۆر وایە ، كفنیان

---

[٣٤٩] **صحيح** - (ئەحمەد) لە (مسند) ە كەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (أول مسند الكوفيين - حديث البراء بن عازب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨١٧٣) ، هەروەها (حاكم) لە (مستدرك) دا لە كتابی (الإيمان) ، بابی : (اما حديث معمر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٤) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە كەیدا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في نفس المؤمن كيف تخرج ونفس الكافر؟) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٨٤٧) ، هەروەها (الروياني) لە (مسند) ە كەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (زاذان عن البراء) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٨٦) ، هەروەها (بیهەقی) لە (شعب الإيمان) دا ، لە ژێر ناونیشانی: (فصل في عذاب القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٠) ، هەروەها (ابن المبارك) لە كتێبی (الزهد والرقائق) دا ، بابی : (فضل ذكر الله عز وجل) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٠٥) ، هەروەها (عبد الله بن أحمد) لە كتێبی (السنة) دا ، لە ژێر ناونیشانی: (سئل عن عذاب القبر وفتنة القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣١٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود/ ج ٤، ص ٢٣٩، ح ٤٧٥٣) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ١٦٧٦) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ١، ح ١٣١) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٣، ح ٣٥٥٨) ، و (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ج ٦، ص ٢٦٢، ح ٢٦٢٨) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

پێیە لە کفنی بەهەشتە ، وە (حنوط) یان پێیە لە (حنوط)* ی بەهەشت ، هەتا لە لایدا دادەنیشن چەند چاوو بڕ بکات ، پاشان مەلائیکەی گیان کێشان (سەلامی خوای لێ بێت) دێت تا لە لای سەریەوە دادەنیشێت و دەفەرموێ: ئەی ڕوح و گیانی پاك ، دەربچۆ بۆ لێبوردن و ڕەزامەندی خوا ، فەرمووی: جا دەردەچێت وەکو چۆن قەترە ئاوێك لە دەمی پەرداخێك بەردەبێتەوە ، جا دەیبات ، وە ئەگەر بردیشی یەك چاوتروکاندن بەری نادات تا دەیبەن و دەیخەنە ناو ئەو کفن و ئەو(حنوط) ە وە ، وە دەردەچێت لێیەوە وەك خۆشترین بۆنی میسك بینراو بێت لە سەر رووی زەویدا ، فەرمووی: جا بەرزی دەکەنەوە و تێ ناپەڕن بە لای هیچ کۆمەڵێکدا* (ئیللا) دەڵێن: ئەم ڕۆحە پاکە کێیە؟ ئەوانیش دەڵێن: فلانی کوڕی فلانە ، بە جوانترین ناوەکانی کە بانگیان پێی دەکرد لە دونیادا ، تا دەیگەیەنن بە ئاسمانی دونیا ، جا لە دەرگا دەدەن ، دەرگایان بۆ دەکرێتەوە ، جا لە هەموو ئاسمانێك نزیکەکانیان (لە خواوە) شوێنی دەکەون تا دەیگەیەننە ئاسمانەکەی تر ، تا دەگەنە ئاسمانی حەوتەم ، جا خوای گەورە دەفەرموێ: نووسراوی بەندەکەم لە (عیلیین) بنووسنەوە ، وە بیگێڕنەوە بۆ زەوی ، چونکە من لەوە بەدیم هێناون ، وە بۆ ئەومیش دەیانگێڕمەوە، وە لەوێشەوە دەریان دەکەمەوە جارێکی تر ، فەرمووی: جا ڕوحەکەی دەگێڕێتەوە بۆ لای لاشەکەی، وە دوو مەلائیکە دێن بۆلای دای دەنیشێنن ، و پێی دەڵێن: پەروەدگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەدگارم (الله) یە ، جا پێی دەڵێن: ئایینت چییە؟ ئەویش دەڵێ: ئایینم ئیسلامە ، جا پێی دەڵێن: ئەو پیاوەی کە بۆتان ڕەوانە کرا چییە؟ ئەویش دەڵێ: ئەو پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ، جا پێی دەڵێن: زانیاریت چییە؟ ئەویش دەڵێت: کتێبی خوام خوێندەوە و باوەڕم پێ هێنا

---

* **(حنوط)**: ئەو بۆنەیە کە بۆ کفن و لاشەی مردوو بەکاردەهێنرێت .

* مەبەست لە کۆمەڵی مەلائیکەیە .

و بە ڕاستم خستەوە ، جا بانگ دەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەكات: كەوا بەندەكەم ڕاستی كرد ، جێگای لە بەهەشتەوە بۆ ڕاخەن ، وە جل و بەرگی لە بەهەشتەوە بكەنە بەر، وە دەرگایەكی بۆ بكەنەوە بەرەو بەهەشت ، فەرمووی: جا لە باو بۆنی خۆشی بەهەشتی بۆ دێت ، وە گۆڕەكەی بۆ فراوان دەكەنەوە چەند چاوی بڕ بكات ، فەرمووی: وە پیاوێكی دەم وچاو جوان دێت بۆ لای ، جل و بەرگی جوانە ، بۆنی خۆشە ، پێی دەڵێت: مژدە بێت بەوەی دڵخۆشت دەكات ، ئەمە ئەو ڕۆژەیە كە پەیمانت پێ دەدرا ، ئەویش پێی دەڵێت: تۆ كێی؟ ڕووت ئەو ڕووەیە كە چاكە دێنێت . ئەویش دەڵێت: من كردەوە چاكەكانی تۆم ، جا دەڵێ: پەروەدگار قیامەت هەڵسێنە تا بگەڕێمەوە بۆ لای ماڵ و كەس و كارم . فەرمووی: وە بەندەی بێ باوەڕ ئەگەر لە دونیا ببڕێت و ڕوو لە دواڕۆژ بكات، لە ئاسمانەوە چەند مەلائیكەیەكی دەموچاو ڕەشی بۆلا دادەبەزێت (موسوح) یان پێیە ، جا لە لایدا دادەنیشن چەندێك چاو بڕ بكات ، پاشان مەلائیكەی گیان كێشان دێت تا لە لای سەرەیەوە دادەنیشێت ، وە دەفەرموێ: ئەی ڕۆح و گیانی پیس ، دەرچۆ بۆ قین و تووڕەیی خوای گەورە ، فەرمووی: جا بەش بەش دەبێتەوە لە لاشەیدا ، جا ڕای دەكێشێت هەر وەكو چۆن (سوفود)* بە ناو خوری تەڕدا ڕابكێشرێت ، جا دەیبات ، وە ئەگەر بردیشی یەك چاو تروكاندنێك بەری نادات تا دەیخەنە ناو ئەو (موسوح) ە وە - كە كفنێكی زۆر زبرە - وە لێیەوە دەردەچێت وەك بۆگەنترین لاك بینراوبێت لە سەر ڕووی زەویدا ، جا بەرزی دەكەنەوە ، وە تێ ناپەڕن بە لای هیچ كۆمەڵێكی مەلائیكەدا (ئیللا) دەڵێن: ئەو ڕۆحە پیسە كێیە؟ جا دەڵێن: فلانی كوڕی فلانە ، بە ناخۆشترین ناوەكانی كە پێی بانگ دەكرا لە دونیادا ، تا دەیگەیەننە دەرگای ئاسمانی دونیا ، جا لە دەرگا دەدەن بۆیان ناكەنەوە ، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

* (سفود): واتە: شیشی گۆشت سوور كردنەوە .

ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ ﴾ (الأعراف/ ٤٠) واتە: وە دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە ، وە نایشچنە بەهەشتەوە ، تا وشتر دەچێتە کونی دەرزییەوە. جا خوای گەورە دەفەرموێ: نووسراوەکەی لە (سجیین) دا بنووسنەوە ، لە زەوی ژێریدا ، جا ڕۆحەکەی فڕێ دەدەنەوە خوارەوە ، بە فڕێدان، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾ (الحج/ ٣١) واتە: وە هەر کەسێك هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار بدات، وەك ئەوەیە لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارەوە ، وە باڵندە بە هەوادا بیڕفێنێ ، یان گژەبا فڕێی بداتە شوێنێکی دوور. جا ڕۆحەکەی دەگێڕێتەوە بۆ لاشەکەی ، وە دوو مەلائیکە دێنە لای و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: پەروەدگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێت: هاە هاە ، نازانم . جا پێی دەڵێن: ئایینت چییە؟ ئەویش دەڵێت: هاە هاە ، نازانم . جا پێی دەڵێن: ئەو پیاوەی کە بۆتان ڕەوانە کرا چییە؟ ئەویش دەڵێت: هاە هاە ، نازانم . جا بانگ دەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات: کەوا درۆی کرد جێگایەکی لە ئاگر بۆ ڕابخەن، وە دەرگایەکی بۆ بکەنەوە بەرە و دۆزەخ، جا لە گەرمی و ناخۆشی دۆزەخی بۆ دێت ، و گۆڕەکەی لە سەر تەنگ دەبێتەوە و دێتەیەك تا پەراسوەکانی دەچن بەناو یەکدا ، وە پیاوێکی دەم و چاو ناشیرینی دێت بۆلا ، جل و بەرگ ناشیرین ، بۆگەن ، پێی دەڵێ: مژدە بێت بەوەی دڵ ناخۆشت دەکات ، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە پەیمانت پێ دەدرا ، ئەویش دەڵێ: تۆ کێی؟ ڕووت ئەو ڕوومیە کە شەڕو خراپە دێنێت؟ ئەویش دەڵێ: من کردەوە خراپەکانی تۆم ، جا دەڵێ: پەروەردگار قیامەت هەڵمەسێنە .

٤- لە (ئەسماء) ی كچی (ئەبوبەكری صدیق) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە كەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( ... ، وقد تجلت الشمس ، فخطب رسول الله (ﷺ) الناس ، فحمد الله ، وأثنى عليه ، ثـم قـال: أمـا بعـد ، مـا مـن شيء لم أكن رأيته إلا قد رأيته في مقامي هذا ، حتى الجنة والنار ، وإنه قد أوحي إلي أنكم تفتنون في القبور قريبا ، أو مثل فتنـة المسيح الـدجال - لا أدري أي ذلـك قالـت أسماء - فيؤتى أحدكم ، فيقال: مـا علمـك بهـذا الرجـل ؟ فأمـا المؤمن ، أو الموقن - لا ادري أي ذلك قالت أسماء - فيقول: هو محمد ، هو رسول الله ، جاءنا بالبينات والهدى، فأجبنا وأطعنا ، ثلاث مرار ، فيقال له: نم ، قد كنا نعلم إنك لتؤمن به ، فنم صالحا ، وأمـا المنـافق ، أو المرتـاب - لا أدري أي ذلـك قالـت أسمـاء - فيقـول : لا أدري ، سمعـت الناس يقولون : شيئا ، فقلت ))[٣٥٠]

واتـە : لـە وتارەكـەی نوێـژی خۆرگیرانەكـەدا پێغەمبـەر (ﷺ) سـوپاس و سـتایش و وەسفێكی جوانی خوای گەورەی كردو فەرمووی: ئەوەشی نەم دیبـوو لـەم شـوێنەدا دیتـم ، هەتا بەهەشت و دۆزەخیشم دی ! وە وەحیم بۆ هات: كە ئێوە هەركەسێ لە گۆڕی خۆیدا تاقی دەكرێنەوە وەك تاقیكردنەوەیە كە لەسەردەمی دەجالـە كوێرەی جادووگەردا ڕوودەدات. (فاتیمە) وتـی: یـا وای وت یـا وتـی: فـەرمووی: لـە چەشـنی تاقیكردنەوەی دەجالـە كوێرەی جادووگـەر. دەوتـرێ: چـی لـە بـارەی ئـەم پیـاوەوە دەزانێ ؟ جا ئەوەی بڕوادارو موسوڵمان بێ یا فەرمووی: ئەوەی موسوڵمان و خاوەن باوەڕو خـاوەن متمانـەبێ دەڵێ: ئـەمـە موحەممـەدە پێغەمبـەرو نێـرراوی خوایـە ، بەڵگەی ڕۆشن و ڕێگەی ڕاستی نیشان داوین: بۆیە ئێمـەش باوەڕمـان پـێ هێنـاوە و

[٣٥٠] **صحيح** - (بوخـاری) لـە كتـابی (الاعتصام بالكتـاب والسنة) ، بـابی : (الاقتـداء بسنن رسـول الله (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٢٨٧) ، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (الكسوف) ، بابی : (ما عرض على النبي (ﷺ) في صلاة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٠٠).

شوێنی کەوتووین ، سێ جار لەسەریەك دەڵێ: ئەمە موحەممەدە ، جا ئەوجا پێی دەڵێن: بخەوە خەوی خێرت بێ ، ئێمە خۆشمان باش دەمانزانی کە تۆ بە چاکی باوەڕت پێی هەیە ، فەرمووی: بەڵام ئەوەشی ناپاك و دووڕووبێ یا فەرمووی: ئەوەشی بەدگومان و دوودڵ بێ دەڵێ: نازانم ، چاوم لە دەمی خەڵك بووە ، ئەوان چییان وتووە منیش وتوومە !

٥- لە (هانیئی)* نۆکەری (عوسمانی کوڕی عەففان) ە وە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( كان عثمان ، إذا وقف على قبر بكى حتى يبل لحيته ، فقيل له: تذكر الجنة والنار فلا تبكي وتبكي من هذا ؟ فقال : إن رسول الله (ﷺ) قال: إن القبر أول منزل من منازل الآخرة ، فإن نجا منه فما بعده أيسر منه ، وإن لم ينج منه فما بعده أشد منه ))[٣٥١]

واتە : جاران (عوسمان) کەلە سەرگۆڕ دەوەستا ئەوەندە دەگریا تا ڕیشی بە فرمێسك تەڕ دەبوو ، پێیان وت: بۆ کە باس و یادی بەهەشت و دۆزەخ دەکەیت ناگریت کەچی بۆ ئەمە دەگریت؟ فەرمووی: چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: گۆڕ یەکەم هەواری دوارۆژە ، ئەوەی لەوێ ڕزگاری ببێ ئیتر لە

---

* نازناوەکەی (ئەبوسەعید) ی بەربەرییە.

[٣٥١] حسن - (ترمذی) لە کتابی (الزهد) ، بابی : (منه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٠٨) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند الخلفاء الراشدين - مسند عثمان بن عفان رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٤٠) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يقال بعد الدفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٥٦) ، هەروەها (بەززار) لە موسنەدەکەیدا (البحر الزخار) ، لە ژێر ناونیشانی: (هاني مولى عثمان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٤، ص ٥٥٣، ح ٢٣٠٨) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ١٦٨٤) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

قۆناغه‌كانی پاشتر ئاسانتر ڕزگاری ده‌بێ ، خۆ ئه‌گه‌ر له‌وێ ڕزگاری نه‌بێ ئه‌وا له قۆناغه‌كانی دواتر خراپتر گیرۆده ده‌بێ !

له گێڕانه‌وه‌ی (ابن ماجه) و (حاكم) دا ئه‌مه‌ی پتره: (( إن القبر أول منازل الآخرة ، فإن نجا منه ، فما بعده ))[252] واته : هه‌رگیزاو هه‌رگیز دیمه‌نم نه‌دیوه كه وه‌ك گۆڕ سامناك و سامدارو به‌سام بێ !

٦- له (ئه‌نه‌س) ی كوڕی (مالیك) ه وه (خوای لێ ڕازی بێت) ده‌گێڕنه‌وه كه‌وا فه‌رموویه‌تی: (( أن النبي (ﷺ) سمع صوتا من قبر فقال: متى مات هذا ؟ قالوا: مات في الجاهلية ، فسر بذلك ، وقال: لولا أن لا تدافنوا لدعوت الله أن يسمعكم عذاب القبر))[253] واته : پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) گوێی لێ بوو ، گۆڕێ ده‌نگی لێوه ده‌هات ، فه‌رمووی: ئه‌مه كه‌ی مردووه؟ وتیان: ده‌مێكه له‌سه‌رده‌می نه‌زانیدا ، له‌پێش هاتنی ئیسلامدا مردووه ، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌م وه‌ڵامه شادمان بوو ، فه‌رمووی: مه‌بادا

---

[252] **حسن** - (ابن ماجه) له كتابی (الزهد) ، بابی : (ذكر القبر والبلى) گێڕاویه‌ته‌وه به ژماره (٤٢٦٧) ، هه‌روه‌ها (حاكم) له (مستدرك) دا له كتابی (الجنائز) دا گێڕاویه‌ته‌وه به ژماره (١٣٠٧) ، هه‌روه‌ها (به‌یهه‌قی) له (شعب الإيمان) دا ، له ژێر ناونیشانی: (فصل في عذاب القبر) گێڕاویه‌ته‌وه به ژماره (٤٢٣) ، هه‌روه‌ها شێخ (ئه‌لبانی) له (سنن ابن ماجه/ ج ٢، ص ١٤٢٦، ح ٤٢٦٧) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٣، ح ٣٥٥٠) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ١، ح ١٣٢) دا فه‌رموویه‌تی: (صحيح) ه.

[253] **صحيح** - (نه‌سائی) له (السنن الصغرى) دا له كتابی (الجنائز) ، بابی : (عذاب القبر) گێڕاویه‌ته‌وه به ژماره (٢٠٥٨) ، هه‌روه‌ها (به‌یهه‌قی) له كتێبی (إثبات عذاب القبر) دا ، بابی : (الدليل على أن الله تعالى يخلق على من فارق الدنيا) گێڕاویه‌ته‌وه به ژماره (٧٣) ، هه‌روه‌ها شێخ (ئه‌لبانی) له (سنن النسائي/ ج ٤، ص ١٠٢، ح ٢٠٥٨) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٥٢٢٥) دا فه‌رموویه‌تی: (صحيح) ه.

لاشەی یەکتری نەنێژن ، ئەگینا داوام لەخوا دەکرد کە کارێکی وای بکردایە کە گوێیان لە سزاو ئازاری ناو گۆڕ بوایە !

٧- لە (ئەبی ئەییوب) ی ئەنصارییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: (( خرج رسول الله (ﷺ) بعد ما غربت الشمس فسمع صوتا ، فقال: يهود تعذب في قبورها ))[٣٥٤] واتە : جارێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاش خۆرئاوابوون ، تەشریفی دەرچوو بۆ دەرەوەی مەدینە ، دەنگێکی سامناکی بیست ، لەبارەیەوە فەرمووی: ئەوە جوولەکەن لە گۆڕەکانیانا سزاو ئازار دەدرێن !

## ڕای زانایان لەم بارەیەوە:

**(مەروەزی) فەرموویەتی:** باوکی عبدالله (واتە: ئیمام ئەحمەد) فەرموویەتی: سزادانی ناو گۆڕ حەقە ، گومڕاو گومڕاکەر نەبێ کەس نکوڵی ئەوە ناکات .

**(حەنبەل) دەفەرموێ:** دەربارەی سزای ناو گۆڕ پرسیارم لە باوکی عبدالله کرد؟ فەرمووی: ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتوون باوەڕمان پێیان هەیە و دانیان پێدا دەنێین ، وە هەرچی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بە ئیسنادێکی (جید) هاتبێ قبوڵی دەکەین ، چونکە ئێمە بڕیار لەسەر ڕاستی ئەو شتانە نەدەین کەلە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتوون مانای ئەوەیە کە فەرمانەکانی خوامان ڕەت کردۆتەوە ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ (الحشر/ ٧) واتە: پێغەمبەر هەرچی پێداون و بۆی هێناون

---

[٣٥٤] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (التعوذ من عذاب القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٧٥) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنة وصفة نعيمها وأهلها) ، بابی : (عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٤٤) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (عذاب القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٥٨).

ئـەوە وەری بگـرن و لەسـەری بـڕۆن ، وە قەدەغـە و جلـەوگیری هەرشـتێکی لـێ کردن ئەوە مەیکەن و مەچن بەلایدا و کۆتایی پێ بێنن و وازی لێ بێنن ، وە لـە خوا بترسن و نافەرمانی مەکەن و خۆتان بپارێزن لـە هۆی خـەشمی خـوا ، چـونکە بەڕاستی خوای گەورە سزا و تۆڵەی زۆر بەتین و سەختە - بۆ ئەوکەسانەی کە گوێ بە فەرمانی خوا نادەن و گوێیان لێی نیە - ، پاشان (حەنبەل) دەفەرموێ: پێم وت: کەواتە سزای ناو گۆڕ حەقە ؟ فەرمووی: حەقە ، لە گۆڕا مردوو سزا دەدرێ .

**هەروەها دەفەرموێ:** گوێم لە باوکی عبداللە بووی دەیفەرموو: باوەڕمان بە سزای ناو گۆڕ هەیە و ، بە (مونکیر) و (نەکیر) یش ، وە بەوەی مردوو لە گۆڕدا پرسیاری لێ دەکرێ: خـوای گـەورە لـە قورئانـا دەفـەرموێ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ (ابـراهيم/ ٢٧) واتـە: خـوای گـەورە ئەوانەی باوەڕیـان هێنـاوە پایـەدار دەکات لەسـەر گوفتـاری بـەجێ و دروسـتیان لـە ژیانی دونیادا ، لە سەرەمەرگ و قیامەتیشدا (باوەڕی دامـەزراو فریایـان دەکـەوێت) و گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بە ئیمانەوە دەمرن .

**(ئیبنوقـەیم) فەرموویـەتی:** مەزهـەبی پێـشینەی ئوممـەتی ئیـسلام و پێـشەواکانی ئەوەیە: ئەگەر کەسێك مرد یا لە خۆشیدا دەبێ یـا لـە سـزاو ناخۆشـیدا ، وە ئەمـە خۆشی ناخۆشییە بۆ ڕۆح و لاشەی ڕوو دەدات ، وە ڕۆح کە لە لاشە جیابۆوە ، یا لە خۆشیدا دەبێ یا لـە ناخۆشـیدا ، وە جـاری وا دەبـێ دەگەڕێتـەوە نـاو لاشـەکە و بـە هـەردووکیان ئـازارو خۆشـییەکەی دەچێژن ، لـە پاشـاندا کـە ڕۆژی قیامـەت هـات هـەموو ڕۆحـەکان دەگێڕڕێنـەوە نـاو لاشـەکان و لـە گۆڕەکانیـان هەڵدەسـن بـەرەو پـەروەردگاریان دەڕۆن ، وە زینـدوو کردنـەوەی لاشـەکان شـتێکە کـە موسـوڵمان و گاورو جوولەکە لەسەری ڕێکن .

**(ئەحمەدی کوڕی قاسم) فەرموویەتی:** وتم: ئەی باوکی عبدالله ! دان دەنێی بە بوونی (مونکیر) و (نەکیر) و ، ئەوەی کە دەگێڕرێتەوە دەربارەی سزای ناو گۆڕ؟ فەرمووی: سبحان الله ... بەڵێ ، دانی پێدا دەنێین و دەشیڵێین ، وتم: بەم شێوەیە دەیڵێیت: (مونکیر) و (نەکیر) ، یا دەڵێیت: دوو مەلائیکە ؟ فەرمووی: (مونکیر) و (نەکیر) ن . وتم: دەڵێن: لە فەرموودەکەدا (مونکیر) و (نەکیر) نەهاتووە ، فەرمووی: هەروان .

**(ابن حجر) ی عەسقەلانی لە (فتح الباري) دا دەفەرموێ:** (ابن حزم) و (ئیبنوهەبیرە) بۆ ئەوە چوون: کە پرسیار لە (ڕۆح) دەکرێ بێ ئەوەی بگێڕرێتەوە ناو لاشەکەی ، بەڵام جومهوری زانایان پێچەوانەی ئەمانن و دەفەرموون: ڕۆح دەگێڕرێتەوە ناو لەش ، یان ناو هەندێك لەش ، وەك لە فەرموودەکەدا سابتە ، جا ئەگەر پرسیار کردنەکە تەنها لەسەر ڕۆحەکە بوایە لاشە هیچ پەیوەندی نە دەبوو ، ئەمە شبەرگری ئەوە ناکات کە لاشەکە پارچە پارچە و بڵاو بووبێتەوە ، چونکە خوای گەورە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە ئەو ڕۆحە بگێڕرێتەوە ناو بەشێکی لاشەکە و پرسیارەکەی لێ بکرێ ، وەك چۆن توانای ئەوەشی هەیە هەموو پارچەکان کۆ بکاتەوە و بیان کاتەوە بەیەك .

**وە ئەوانەی دەڵێن:** لێپرسینەوە تەنها لە (ڕۆح) ە ، بەوە وا دەڵێن کە جاری وا هەیە مردوو ببیندرێ لە گۆڕەکەیدا ، یا لەو کاتەدا هیچ نیشانەیەکیش دەرنەکەوێ، نە دانیشتنی لە گۆڕدا ، نە فراوان بوونی ، نە تەسك بوونەوەی ، وە هەروەها کەسێك کەلە گۆڕ نەنرابێ هیچ نیشانەیەکی پێوە دەرناکەوێ وەك کەسێك کە کرابێت بە دارا و هەر پێوەی مابێتەوە .

**لە وەڵامیاندا دەڵێین:** ئەوە شتێك نیە لە دەسەڵات و توانای خوا دەربچێ ، وە وێنەشی لە دونیادا هەیە کە نووستووە خەو دەبینێ ، تووشی خۆشی و ناخۆشی دەبێ بێ ئەوەی تەنیشتی کە نەنووستووە هەستی پێ بکات ، وە هەروەها بە

ئاگاش، کە هەست بە خۆشی یا ناخۆشی دەکات لە دەروونیدا کاتێ بیر لە شتێك دەکاتەوە یا دەیبیستێ ، بێ ئەوەی کە لە تەنیشتیەوە هەستی پێ بکرێت ، جا هەڵەکە لەوەدایە کە شتی نادیار لەسەر شتی دیار قیاس دەکەن و ، حاڵی دوای مردن لەسەر ئەو شێوەی پێش مردن قیاس دەکەن .

## سێیەم : هەموو مردوێی گوشراو گوشار دەدرێ

لە (ئیبنوعومەر) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( هذا الذي تحرك له العرش ، وفتحت له أبواب السماء ، وشهده سبعون ألفا من الملائكة ، لقد ضم ضمة ، ثم فرج عنه ))[٢٥٥]

واتە : ئا ئەم (سەعدی کوڕی موعازە) کە عەرشی خوا بۆیهاتە جموجووڵ و خرۆش دەرگاکانی ئاسمانی بۆ خرانە سەرپشت و حەفتا هەزار مەلائیکە هاتنە دیدەنی و دیاری ، لەکاتی سەرەمەرگیدا و لەکاتی بەڕێکردنی تەرمەکەیدا ، ئا ئەم سەعدە کە ئەمە پلەو پایەیەتی لەلای خوا ، لەگەڵ ئەوەشا گۆڕەوشارێکی وەها وەها درا کە پەراسووی ڕاست و چەپی تێك پەڕاند لەپاشا قوتاری بوو .

---

[٢٥٥] صحيح - (نەسائی) لە (السنن الصغری) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ضمة القبر وضغطته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٥٥) ، هەروەها (تەبەرانی) لە (المعجم الأوسط) دا ، بابی : (الألف: من اسمە أحمد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧٢٩) ، هەروەها (بەیهەقی) لە كتێبی (إثبات عذاب القبر) دا ، بابی : (تخويف أهل الإيمان بعذاب القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩١) ، هەروەها (ئەبی نوعەیم) لە كتێبی (معرفة الصحابة) دا ، بابی : (السين: من اسمه سعد - سعد بن معاذ بن النعمان بن امرئ القيس) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧٣٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن النسائی/ ج ٤، ص ١٠٠، ح ٢٠٥٥) ، و (مشكاة المصابيح/ ج ١، ح ١٣٦) ، و (صحيح الجامع الصغير/ ح ٦٩٨٧) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

## چوارەم: هەموو مردوێی لە گۆڕا شوێنی خۆی لەبەهەشتا یا لە دۆزەخا نیشان دەدرێ

لــە (ئیبنوعومــەر) ە وە (خــوای لێ ڕازی بێــت) دەگێڕنــەوە کــەوا فەرموویــەتی: پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) فەرموویــەتی: (( إن أحــدكم إذا مــات عــرض عليــه مقعــده بالغداة والعشي ، إن كان من أهل الجنة فمن أهل الجنة ، وإن كان من أهــل النــار فمـن أهل النار ، فيقال: هذا مقعدك حتى يبعثك الله يوم القيامة ))[٣٥٦]

واتە : ئێوە کاتێ دەمرن بەیانیان و ئێواران ، هــەر کەســەتان جێگــەی خــۆی پیــشان دەدرێ ، جا ئەگەر بەهەشتی بێ ئەوا جێگەی خۆی لە بەهەشتا دەبینێ ، وە ئەگەر دۆزەخی بێ ئەوا جێگەی خۆی لە دۆزەخا دەبینێ ، وە پێی دەڵێن: ئەمــە جێگەتــە لە ڕۆژی قیامەتا ، کە خوا زیندووت دەکاتەوە دێیتە ئێرە .

## پێنجەم: ئارامگای ڕۆحەکان

(ئیبنوقەیم) فەرموویەتی: دەڵێن: ڕۆحەکان جێگاکانیــان زۆر جیــاوازە لــە بەرزەخــدا ، چونکە ڕۆحی وا هەیە لە بەرزترین شوێنە لــە جیهــانی (ڕۆحــەکان) دا کــە ئــەویش ڕۆحــی پێغەمبەرانــە (ســەلامی خاویــان لەســەر بێــت)، وە ئــەوانیش جێگاکانیــان جیاوازە ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) لە شەوڕەوییەکەیدا کە پێی کراو چــوو بــۆ میعــراج چاوی پێیان کەوت .

---

[٣٥٦] صحيح – (بوخاری) لە کتابی (الجنــائز) ، بــابی : (الميــت يعــرض عليــه مقعده بالغــداة والعشي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٧٩) ، هەروەها (مسليم) لە کتابی (الجنة وصفة نعيمها وأهلها) ، بــابی : (عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧١٤٠) ، هەروەها (نەسائی) لــە کتابی (الجنائز) ، بابی : (وضع الجريدة على القبر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٧١).

هەندێك لەو ڕۆحانە لە چیکڵدانی باڵندەی سەوزدان ، کە بە ئارەزوووی خۆیان بەناو بەهەشتدا دەگەڕێن ، ئەویش ڕۆحی هەندێ لە شەهیدانن ، نەك هەموویان ، بەڵکو هەندێك شەهید هەیە ڕۆحەکەی حەبس دەکرێ لە چوونە بەهەشت ، بەهۆی قەرزاری یا شتی ترەوە ، وەك لە موسنەددا هاتووە لە (محمد) ی کوڕی (عبدالله) ی کوڕی (جەحش) ە وە کەوا فەرموویەتی: (( أن رجلا جاء إلى النبي (ﷺ)، فقال: يا رسول الله (ﷺ) ما لي إن قتلت في سبيل الله ، قال: الجنة ، فلما ولى ، قال: إلا الدين سارني به جبريل آنفا ))[٢٥٧]

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! چیم بۆ هەیە ئەگەر لە ڕێی خوادا بکوژرێم؟ فەرمووی: بەهەشت ، کاتێك کابرا ڕۆیشت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە مەرجێك قەرزار نەبێت ، ئێستا (جوبرەئیل) چرپاندی بە گوێمدا .

هەندێکی کەیان لەبەر دەرگای بەهەشتدا حەبس کراون وەك لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە لە (سەموورە) ی کوڕی (جوندەب) ە وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( إن صاحبكم قد حبس على باب الجنة ، بدين كان عليه ، فقال رجل: علي دينه . فقضاه ))[٢٥٨]

---

[٢٥٧] **صحيح** - (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (مسند الشاميين - حديث عبد الله بن جحش) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٦٩١١) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (الجنائز) ، لە ژێر ناونیشانی: (في الرجل يموت وعليه الدين من قال : لا يصلي عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١١٨١١) ، هەروەها (ئەبی نوعەیم) لە کتێبی (معرفة الصحابة) دا ، لە ژێر ناونیشانی: (ومحمد بن عبد الله بن جحش بن رياب بن يعمر الأسدي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٠٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (تخريج الطحاوية/ ص ٤٥٤) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[٢٥٨] **صحيح** - (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (البيوع) ، لە ژێر ناونیشانی: (وأما حديث إسماعيل بن جعفر بن أبي كثير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٥٦) ، هەروەها (ئەحمەد) لە (مسند) ە

واتـە : بێگومـان هاوەڵەکـەتان لەبـەردەم دەرگـای بەهەشـتدا بەنـد کـراوە ، ئـەویش بـەهۆی قەرزێکـەوە کەلـە دنیـادا لەسـەری بـووە ، جـا پیـاوێ لـە دانیـشتوان وتـی: قەرزەکەی لەسەر من بێت ، دواتر کابرا قەرزەکەی بۆ دایەوە .

وە ڕۆح هەیە لە گۆڕەکەیدا حەبسە وەك ئـەو پیـاوەی کـە پارچـە قوماشێکی دزی بوو لە غەنیمەت ، لە پاشاندا شەهید کرا:

لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: (( خرجنا مع النبي (ﷺ) إلى خيبر ، ففتح الله علينا فلم نغنم ذهبا ولا ورقا ، غنمنا المتاع والطعام والثياب ، ثم انطلقنا إلى الوادي ، ومع رسول الله (ﷺ) عبـد لـه ، وهبـه له رجل من جذام يدعى رفاعة بن زيد من بني الضبيب ، فلما نزلنا الوادي ، قام عبد رسول الله (ﷺ) يحل رحله ، فرمي بسهم ، فكان فيـه حتفـه ، فقلنـا: هنيئـا لـه الشهادة يـا رسـول الله (ﷺ)، قـال رسـول الله (ﷺ): كلا والـذي نفـس محمـد بيـده ، إن الشملة لتلتهب عليه نارا أخذها من الغنائم يوم خيبر لم تصبها المقاسم ، قال: ففـزع النـاس ، فجاء رجل بشراك أو شراكين فقـال: يـا رسـول الله (ﷺ)، أصـبت يـوم خيـبر ، فقال رسول الله (ﷺ): شراك من نار أو شراكان من نار ))[٢٥٩]

---

کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی : (أول مسند البصريين - ومن حديث سمرة بن جندب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٦٩٠) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لـە کتـابی (الضمان) ، بـابی : (الضمان عن الميـت) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٠٦٦٨) ، هـەروەها (بوخـاری) لـە کتێبـی (التـاريخ الكـبير) دا گێڕاویەتــەوە بـە ژمـارە (٧٠٠) ، هـەروەها شـێخ (ئـەلبانی) لـە (تخـريج الطحاويـة/ ص ٤٥٥) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

[٢٥٩] صحيح - (بوخاری) لە کتابی (المغازي) ، بابی : (غزوة خيـبر) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣٩٧٣) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الإيمان) ، بابی : (غلظ تحريم الغلول) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٦)، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجهاد) ، بابی : (في تعظيم الغلول) گێڕاویەتەوە بە ژمـارە (٢٧١١) ،

واته : ساڵی غەزای (خەیبەر) لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەرچووین بۆ خەیبەر ، خوای گەورە قەڵاکەی بۆ ئازاد کردین ، لەوێ جل و بەرگ و شتومەك و خۆراك و ماڵاتمان بە تاڵانی گرت ، بەڵام ئاڵتوون و زیومان دەست نەکەوت ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) و سوپاکەی بەرەو (وادیلقورا) کەوتنەڕێ ، غولامێکی ڕەشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەبوو (ناوی میدعەم بوو) ، پیاوێ لە هۆزی (جوزام) کە ناوی (ڕیفاعەی کوڕی زەید) بوو لە (بەنی ضوبەیب) بوو ، ئەو غولامەی بەخشیبوو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، کاتێ کەلە شیوەکەدا باروبنەمان خست و لاماندا بۆ حەوانەوە تیرێ هات بەریکەوت و کوشتی ، ئێمەیش وتمان: شەهیدبوونی پیرۆز بێ ، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! یاخوا بەهەشت نۆشی گیانی بێ ، کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: نەخێر وانییە ، بەوکەسە کە گیانی منی وا لەدەسا ، (میدعە) م وا لەناو ئەو باڵا پێچەدا ، کە لە تاڵانییەکەی ڕۆژی خەیبەردا بردبووی بۆ خۆی ، بەرلەوەی کە دابەش بکرێ ، باڵا پۆشەکە لەبەریا گڕ گڕ دەسووتێ ! (ئەبوهورەیرە) فەرمووی: خەڵکەکەیش کە گوێیان لەم هەڕەشەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو ، کە کردی لەو کەسانەی کە دەستپیسی دەکەن لە تاڵانی و دەستکەوتی شەرعی غەزا ، تۆقین و زۆر ترسان و زەندەقیان چوو ، پیاوێ چوو قەیتانێ ، یا دوو قەیتانی پێڵاوی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ! ئەمەم لە ڕۆژی خەیبەردا دەستکەوتووە و تەسلیمم نەکردووە ، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: قەیتانێکە یا فەرمووی: دوو قەیتانن لە ئاگر .

---

هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الأیمان والنذور) ، بابی : (هل تدخل الأرضون في المال إذا نذر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٨٢٧).

وە ڕۆح هەیە جێگاکەی بەهەشتە وەك لە حەدیسەکەی (ئیبنوعەبباس) دا هاتووە:
لـە (ئیبنوعـەبباس) ە وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( الشهداء على بارق - نهر بباب الجنة - في قبة خضراء ، يخرج عليهم رزقهم من الجنة بكرة وعشيا ))[٣٦٠]
واتـە: شـەهیدەکان لەسـەر ڕوبـارێکن لـە دەرگـای بەهەشـتدا لـە گومـەزێکی سـەوزدا بەیانی و ئێوارە لە بەهەشتەوە ڕۆزییان بۆ دێ .
ئەمانە بە پێچەوانەی (جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب) ە ومیە کە خوا قۆڵەکانی بـۆ دەگۆڕێ بە دووباڵ لە بەهەشتا پێیان دەفڕێ بە ئارەزووی خۆی .
لـە (ئـەبوهورەیرە) وە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە کـەوا فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( رأيت جعفر بن أبي طالب ملكا يطير مع الملائكة بجناحين في الجنة ))[٣٦١]

---

[٣٦٠] **حسن** – (ئەحمەد) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (مسند عبد الله بن العباس بن عبد المطلب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٩٩) ، هـەروەها (ابـن حبـان) لـە کتـابی (السير) ، بـابی : (فضل الشهادة - ذكر خبر يوهم غير المتبحر في صناعة العلم أنه مضاد لخبر) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٤٧٣١) ، هەروەها (حاکم) لە (مستدرك) دا لە کتـابی (الجهاد) دا گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٢٣٤٣) ، هەروەها (ابن أبي شيبة) لە (مصنف) ە کەیدا لە کتابی (فضل الجهاد) ، بـابی : (ما ذكر في فضل الجهاد والحث عليه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٨٩٢٨) ، هـەروەها (عبـد بـن حميـد) لـە (مسند) ە کەیـدا ، لـە ژێـر ناونیـشانی: (مسند ابـن عبـاس رضي الله عنـه) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٧٢٢) ، هەروەها (تەبـەرانی) لـە (المعجم الأوسـط) دا ، بـابی : (الألـف: مـن اسمـه أحمـد) گێڕاویەتـەوە بـە ژمارە (١٢٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح الجامع الصغير/ ح ٣٧٤٢) ، و (صحيح الترغيب والترهيب/ ج ٢، ح ١٣٧٨) دا فەرموویەتی: (حسن) ە.

[٣٦١] **صحيح** – (حـاکم) لـە (مـستدرك) دا لـە کتـابی (معرفـة الصحابة) ، لـە ژێـر ناونیـشانی: (ذكر مناقب جعفر بن أبي طالب بن عبد المطلب بـن هاشـم) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٤٨٨٧) ، هـەروەها

واتە : لە بەهەشتدا (جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب) م بینی خاوەنی دوو باڵ بوو ، لەگەڵ مەلائیکەتەکاندا بە ئارەزووی خۆی دەفڕی .

وە ڕۆح هەیە هەر لە زەویدا حەبسە ، وە بەرز نابێتەوە بۆلای جیهانی ڕۆحەکان ، چونکە ئەو ڕۆحانانە خۆیان نزم و زەمینین ، وە ڕۆحە زەمینیەکانیش تێکەڵ بە ڕۆحە ئاسمانیەکان نابن وەك چۆن لە دنیادا یەکیان نەدەگرت .

جا ئەو ڕۆحەی لە دنیادا هەوڵی نەداوە کە پەروەردگاری بناسێ و خۆشی بوێ وە یادی بکاو لێی نزیك ببێتەوە ، ئەوە ڕۆحی زەمینی نزمە ، کە لە لاشە جیابۆوە هەر لەوێ دەبێت .

هەروەك چۆن ڕۆحی بەرز لە دونیادا هەر خەریکی خۆشەویستی خواو یادکردنی و هەوڵی نزیك بوونەوە بووە لێی ، ئەو ڕۆحە کەلە لاشەش جیابۆوە بەرز دەبێتەوە بۆ لای ڕۆحە ئاسمانیەکان ، چونکە پیاو لەگەڵ ئەوەدا دەبێت کە خۆشی ویستووە لە بەرزەخ و ڕۆژی قیامەتدا .

خوای گەورەش ڕۆحەکان جووت دەکات بە یەکەوە لە بەرزەخ و ڕۆژی قیامەتدا ، وە ڕۆحی باوەڕداران لەگەڵ ڕۆحە پاکەکان یەك دەخات ، چونکە ڕۆح کە جیابۆوە خۆی دەگەیەنێتە ئەو ڕۆحانەی کەلە خۆی دەچن ئیتر لەگەڵیانا دەمێنێتەوە .

جا هەندێ ڕۆح هەیە کەلە تەنووری زیناکەراندایە ، وە ڕۆح هەیە لە ڕوباری خوێن دایە مەلەی تێدا دەکات و بەرد قووت دەدات ، جا ڕۆحەکان (خۆش بەخت و

---

(ئەبی یەعلا) لە (مسند) ە کەیدا ، لە ژێر ناونیشانی: (شهر بن حوشب) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٣٣١) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (المناقب) ، بابی : (مناقب جعفر بن أبي طالب أخي علي رضي الله عنه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٧٦٣) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامعی الترمذی/ ج ٥، ص ٦٥٤، ح ٣٧٦٣) ، و (صحیح الجامع الصغیر/ ح ٣٤٦٥) ، و (سلسلة الأحادیث الصحیحة/ ج ٣، ص ٢٢٦، ح ١٢٢٦) ، و (مشکاة المصابیح / ج ٣، ح ٦١٥٣) دا فەرموویەتی: (صحیح) ە.

بەدبەخت) یەك شوێنیان نیە ، بەڵکو ڕۆح هەیە لە شوێنە هەرە بەرزەکانداییە ، وە ڕۆحیش هەیە هەر لە زەویدایە بەرز نابێتەوە .

هەروەها ڕۆح دەکرێت بە چەند بەشی ئازاد و بەند کراوو ، بەرزو نزمەوە ، وە ڕۆح دوای جیابوونەوەشی لە لاشە حاڵەتی تەندروستی و نەخۆشی و خۆشی و خۆش گوزەرانی هەیە ، هەروەها حاڵەتێکی ئازاری سەختی هەیە کە زۆر گەورەترە لە ئازاری ئەو کاتەی کە پەیوەست بوو بە لاشەکەوە ، جا لەو لاشەیەدا حەبس کردن و ئازارو سزاو نەخۆشی و غەم خواردن هەیە ، وە لەوێدا خۆشی وەرگرتن و ئاسایش و خۆش گوزەرانی و ڕەهایی هەیە ، وە چەندە حاڵی ڕۆح لە لاشەدا لە حاڵی لاشە دەچێ لە سکی دایکیدا !! وە حاڵی جیابوونەوەشی لە لاشە ، لە حاڵی لاشە دەچێت پاش دەرچوونی لە سکی دایك بەرەو ئەم ماڵی دونیایە .

**جا ئەم ڕۆحانە چوار ماڵیان هەیە ، هەر ماڵێکیان گەورەترە لەوەی پێش خۆی:**

**ماڵی یەکەمیان:** سکی دایکە ئەویش بریتیە لە تەسکی و تەنگەبەری و سێ تاریکیەکە .

**ماڵی دووەمیان:** ئەم دونیایەیە کە تێیدا گەورە دەبێت و تێیدا ڕادێت و هەوڵی خێرو شەڕو هۆیەکانی بەختەوەری و بەدبەختی تێدا دەدات .

**ماڵی سێیەمیان:** ماڵی بەرزەخە ، کە گەورەتر و فراوانترە لەم ماڵی دونیایە ، وە ڕادەی نێوانیشیان وەك ڕادەی ماڵی یەکەم (واتە: سکی دایك) و ئەم دونیا وەهایە .

**ماڵی چوارەمیان:** ماڵی قەرار گرتنە ، ئەویش بەهەشت و دۆزەخە ، ئیتر دوای ئەم دوانە ماڵی تر نیە .

خوای گەورە ئەو ڕۆحانە دەگوێزێتەوە لەو ماڵانە ، چین لە دوای چین ، تاوەکو دەیانگەیەنێت بەو ماڵەی کە جگە لەو هیچ ماڵێکی تری بۆ ناگونجێ و شیاوی نیە ، وە ئەو ڕۆحەش هەر بۆ ئەو جێگەیە دروست کراوەو ئامادە کراوە ، تا ئەو کردەوەیە بکات کە بەوێی دەگەیەنێت .

# سەرچاوەکان

..................

**یەکەم : قورئانی پیرۆز .**

**دووەم : لە کتێبەکانی تەفسیردا :**

١- تفسير الطبري - لإمام محمد بن جرير الطبري .

٢- تفسير القرطبي - لإمام القرطبي .

٣- الدر المنثور - جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي .

٤- تەفسیری قورئانی پیرۆز - م . عثمان عبدالعزيز .

٥- خولاصەی تەفسیری نامی - م . عبدالكريم المدرس .

٦- تەفسیری ئاسان - م . بورهان محمد أمين .

**سێیەم : لە کتێبە (فیقهیەکان) دا :**

١- الموطأ - لإمام مالك بن أنس .

٢- الأم - لإمام محمد بن إدريس الشافعي .

٣- المحلى شرح المجلى - لإمام أبو محمد علي بن أحمد بن حزم الأندلوسي .

٤- المغني والشرح الكبير - لإبن قدامة المقدسي .

٥- مجموع الفتاوى - لشيخ الإسلام ابن التيمية .

٦- المجموع - لإمام أبي زكريا محيي الدين بن الشرف النووي .

٧- شرح فتح القدير - لإمام كمال الدين محمد بن عبدالواحد السيواسي معروف بإبن الهمام الحنفي .

٨- نهاية المحتاج - شمس الدين محمد بن أبي العباس الرملي .

٩- بداية المجتهد - لإمام القاضي أبي الوليد محمد بن أحمد ابن رشد القرطبي الأندنسي .

١٠- الكافي في مذهب المدينة - أبو عمر يوسف بن عبد الله الأندلوسي القرطبي معروف بابن عبدالبر .

١١- روضة الطالبين - لإمام أبي زكريا محيي الدين بن الشرف النووي .

١٢- الإجماع / لإبن المنذر .

١٣- بدائع الصنائع - لإمام علاءالدين أبي بكر بن مسعود الكاساني الحنفي .

١٤- الهداية - لشيخ الإسلام برهان الدين أبي الحسن علي بن أبي بكر بن عبدالجليل الرشداني المرغيناني .

١٥- حاشية ابن عابدين .

١٦- شرح الزرقاني - محمد بن عبدالباقي بن يوسف الزرقاني المصري الأزهري .

١٧- التمهيد - أبو عمر يوسف بن عبد الله الأندلوسي القرطبي معروف بإبن عبدالبر.

١٨- الإنصاف - كمال الدين أبي البركات عبدالرحمن الأنباري .

١٩- الزاد المعاد - لإبن القيم الجوزية .

٢٠- المبسوط - لإمام محمد بن الحسن الشيباني .

٢١- الحاوي - للماوردي .

٢٢- تلخيص الحبير - لإمام الجليل أبو الفضل أحمد بن علي معروف بإبن حجر العسقلاني .

٢٣- تمام المنة في التعليق على فقه السنة - لشيخ محمد ناصرالدين الألباني .

٢٤- حجة النبي - لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٢٥- سبل السلام - لأمير الصنعاني .

٢٦- نيل الأوطار - لإمام الجليل الشوكاني .

٢٧- الروضة الندية شرح الدرر البهية - محمد صديق حسن خان .

٢٨- الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز - عبدالعظيم بن بدوي .

٢٩- التذهيب في أدلة الغاية والتقريب - د . مصطفى ديب البغا .

٣٠- فقه السنة - سيد سابق .

٣١- صحيح فقه السنة وأدلته - أبو مالك كمال بن السيد سالم .

٣٢- دليل الحاج والمعتمر - طلال بن أحمد العقيل .

وە هەندێ سەرچاوەی تر وەك : (جامع الأحكام النساء) ، (تهذيب السنن) ، (حاشية العدوى) ، (الموسوعة الفقهية) ، (الخرشي) .

چوارەم : لە کتێبەکانی فەرموودەدا :

١- صحيح البخاري - لإمام أبو عبد الله محمد بن إسماعيل البخاري .

٢- صحيح مسلم - لإمام أبو الحسين مسلم بن الحجاج القشيري النيسابوري .

٣- سنن أبي داود - لإمام أبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني .

٤- سنن الترمذي - لإمام أبو عيسى محمد بن عيسى الترمذي .

٥- سنن النسائي - لإمام أبو عبدالرحمن أحمد بن شعيب الخراساني النسائي .

٦- سنن ابن ماجه - لإمام أبو عبد الله بن يزيد بن ماجه القزويني .

٧- صحيح أبي داود - لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٨- صحيح ابن حبان - لإمام أبو حاتم محمد بن حبان التميمي البستي .

٩- صحيح ابن خزيمة - لإمام محمد بن إسحاق بن خزيمة النيسابوري .

١٠- سنن الكبرى للبيهقي - لإمام أبو بكر أحمد بن الحسين الخسرو جردي البيهقي .

١١- سنن الدارقطني - لإمام أبو الحسن علي بن عمر الدارقطني البغدادي .

١٢- سنن الدارمي - لإمام أبو محمد عبد الله بن عبد الرحمن الدارمي السمرقندي .

١٣- مسند لموطأ - لإمام مالك بن أنس .

١٤- مسند لإمام أحمد - الامام أحمد بن حنبل .

١٥- مسند لإمام الشافعي الإمام محمد بن إدريس .

١٦- مسند الطيالسي - لإمام ابو داود الطياليسي .

١٧- مسند البزار - لإمام احمد بن عمرو بن عبدالخالق البزار العتكي .

١٨- المستدرك على الصحيحين - لإمام ابو عبد الله محمد بن عبد الله الحاكم النيسابوري .

١٩- مصنف ابن أبي شيبة لإمام أبو بكر بن أبي شيبا .

٢٠- المعجم الكبير - لإمام ابو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني .

٢١- المعجم الأوسط لإمام أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني .

٢٢- المعجم الصغير - لإمام أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني .

٢٣- الجامع الصغير وزيادته - لشيخ الإسلام جلال الدين السيوطي .

٢٤- صحيح الجامع الصغير - لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٢٥- السلسلة الأحديث الضعيفة - لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٢٦- السلسلة الأحاديث الصحيحة - لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٢٧- الترغيب والترهيب - أبو حفص عمر بن أحمد بن عثمان البغدادي ، معروف بابن شاهين .

٢٨- صحيح الترغيب والترهيب - لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٢٩- ضعيف الترغيب والترهيب - لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٣٠- شعب الإيمان - لإمام أبو بكر أحمد بن الحسين الخسرو جردي البيهقي .

٣١- الدعوات - للمستغفري .

٣٢- تحفة الأشراف - يوسف بن الزكي عبدالرحمن أبو الحجاج المزي .

٣٣- مجمع الزوائد - لأبو الحسن الهيثمي .

٣٤- الضعفاء لإبن حبان - لإمام أبو حاتم محمد بن حبان التميمي البستي .

٢٥- كنز العمال - لمتقي الهندي .

٢٦- إرواء الغليل لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٢٧- نصب الراية - لإمام الحافظ جمال الدين الزيلعي الحنفي .

٣٨ تخريج إحياء علوم الدين - الدكتور محمد وهبي سليمان ، أسامة عمورة .

٣٩ مشكاة المصابيح - لعلامة محمد ناصرالدين الألباني .

٤٠ شرح صحيح مسلم لإمام أبي زكريا محيي الدين بن الشرف النووي .

# ناوەڕۆك

............

﴿تَمَّ بِحَمْدِاللهِ﴾